# لێکۆڵینەوەکانی پێش مێژوو
# لە کوردستانی عێراقدا


لەلایەن

رۆبەرت جێی. برید وود. بروس هاو

بە هاوکاری:

هانس هەڵبیك. فردریك ئارِ. ماتسۆن. چارلیس ئێی. ریِد. هەربەرت ئی. رایت، جێی ئارِ.


## بەشی یەکەم


وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

ئاسۆس محەمەد مەلا قادر



کوردستان - هەولێر

٢٠٠٥




**ناوی کتێب: لێکۆڵینەوەکانی پێش مێژوو لە کوردستانی عێراقدا**

– ڕۆبەرت جێی. برید وود. بروس هاو

– وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: ئاسۆس محەمەد مەلا قادر

– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال ڕواندزی

– بەرگ: هۆگر سدیق

–سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات

– تیراژ: ٧٥٠ دانە

– ژمارەی سپاردن: ٦٧٩

-- چاپی یەکەم

– نرخ: ٢٥٠٠ دینار

– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە٠

زنجیرەی کتێب – ٤٥ – (١٤٨)

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن : 2260311**

www.mukiryani.com



پەیمانگای ڕۆژهەلاتی زانستگای شیکاگۆ

توێژینەوەکانی چاندی ڕۆژهەلاتی کۆن.

ژمارە -٣١-

چاپخانەی زانستگای شیکاگۆ.

شیکاگۆ. ئیلینۆیس

کەتەلۆگی ژمارەی کتێبخانەی کۆنگرێس

٦٠ — ٨٩٦٩

چاپخانەی زانکۆی شیکاگۆ، شیکاگۆ ٣٧

چاپخانەی زانکۆی کامبریج، لەندەن، I. N. W، ئینگلتەرا.

چاپخانەی زانکۆی تۆرنتۆ-ە- کەنەدا

٢- ١٩٦٠ لەلایەن زانکۆی شیکاگۆ.

چاپخانەی زانکۆی شیکاگۆ ڕێکیخستوەو ١٩٦٠ بلاوکراوەتەوە، شیکاگۆ، ئیلینۆیس، U.S.A، هەروا فۆتۆپریس، ئای. ئێن. سی، برۆد ڤیو، ئیلینۆیس، U.S.A، چاپیکردوە.





# ناوەڕۆك







## -١-

# گـــرفـــتی گشـــتی

ئەمە دەنگوباسی سێ هەڵمەتی دیتنکاری یەکەمی نێردەیەکی شوێنەوارییە لە ولاّتی گردەلاّنی کوردەواری عیراقدا — واتە پرۆژەی چەرمۆی عیراق.

هەمیشە شوێنەوارناسان کاتێك لە رۆژهەلاّتی نزیکدا کاردەکەن بە چەند شوێنێکی تایبەتی وەك ئووری کلدانییەکان یاخود ئەنتیۆخی رۆمان، یان بەشتی تایبەتی وەك گۆڕی توت ئەنخاموون یاخود بە کۆشکی سارگۆنی پادشای ئاشووری لە خۆرساباد —دا، خۆیان خەریکدەکەن.

لێرەدا نامۆکی نێردەکە لەوەدا جیاوازە، کە بە ئاڕاستەی چارەسەرکردنی پرسێکی گشتی کاردەکات: چۆن ئەو گۆڕانکارییە گەورانە لە رێگەی ژیانی مرۆڤایەتیدا تێبگەین؟ کە دەرکەوتنی یەکەم کۆمەڵگەی لادێی جوتیاری جێگیر بەخۆیەوە دەبینێت.

دەرکەوتنی کۆمەڵگەی لادێی جوتیاری لە مێژوویی شارستانیدا واتای گواستنەوەیەکی گەورەی هێما داربوو بۆ ئەوەی بەدواییدا هات.

بەر لەوە نیو ملیۆن ساڵێکی هەڤۆکگەری دەبوو، کە کۆمەلاّنی بچووکی خەڵکی کۆچەر لە میانەیدا هێندێك جار لە ئەشکەوتانداو هێندێك جاریش لە شوێنە والاّکاندا دەژیان، کە بەشێوەیەکی سەرەکی گەشتی سروشتیاندەکرد لەپێناو دەستکەوتنی پێداویستییەکاندا.

دوای ماوەیەکی کورتی پێنج هەزار ساڵی چاندی شارستانی بەدوای قۆناغی گواستنەوەدا هات. لێرەدا چەند هۆکارێکی شیاوی گواستنەوە هەن، کە بۆ ئەمانەش بەڵگەی تەواو لە تۆماری شوێنەواریدا ئەوەیە، کە رەنگبێ لێکۆڵینەوەی زیاتر دەستەبەر بکەن. لە زێتربوونی چالاکیدا بەرەو قۆناغی گواستنەوە هەر یەك لەمانەی لای خوارەوە تێبینی دەکەین“

(١)- گەشەکردنی توانای خواردن کۆکەرەوەکان بۆ چڕکردنەوە (یان هەندێك پاڵنەر) بۆ چڕبوونەوەی بەکارهێنانی چەند شوێنی هەرێمێك. (٢)- زیادبوونی ئامانجی نیشتەجێبوونیان لە شوێنە والاّکاندا. بەم پێو و دانگە کاتێك شوێنەوارەکانی روودانی گواستنەوە روونددەبنەوە، تۆماری شوێنەواری بە چەشنێکی گونجاو روونیدەکاتەوە، کە (٣)- کشتوکاڵکردن و (٤)-ماڵیکردنی ئاژەڵ روویانداوە.



ئایا پێوەندی ئاڵوگۆڕکاری ئەم هۆکارانە (یان رەنگبێ هۆکاری دیکەش) لە دامەزراندنی یەکەم کۆمەڵگەی لادێی جووتیاریدا چی بووە؟

گەر بپرسین ئاخۆ شارستانیەت لە ئاستی ئابوورییەکی خۆراك — کۆکردنەوەدا وێنا دەکرێت، ئەوا تێگەیشتن لە گواستنەوە وەك پرسێکی گشتی کەلتووری — مێژوویی گرنگ زەقدەبێتەوە.

شارستانیەت بە مانای وشە — شار، و دەوڵەتی رەسمی سیاسی ، و نووسین، و هوونەری مەزن، و تەلارسازی، و هەندێك پسپۆڕی بالاّی وەك کانزاکاریش دەگرێتەوە، کە پێشتر لە نووسینە تەقلیدییەکانی مێژوونووسانی کۆن لە رۆژهەلاّتی نزیکدا لای ئێمە شتێکی ئاساییبوو.

شارستانیەت بەر لە هەموو شتێك لە دەوروبەری ٣٥٠٠ بەر لە زایندا لە باشووری میسۆپۆتامیادا دەستیپێکرد، وەلێ پێمانوایە بناغەکانی شارستانیەتی میسۆپۆتامیا لەسەردەستی یەکەمین ئەو جووتیارانەوە هەڵنران، کە کەوتوونەتە ناوچەکانی دەوروبەرەوە.

ئەم جووتیارانە بەشێوەیەکی بەرچاو لە دەوروبەری حەوت هەزاری بەر لەزایندا خۆیان لە گوندە بچووکەکانی سەر رۆخە گردەلاّنییەکانی کەمەرەی بەپیت لە باشووری رۆژئاوای ئاسیادا دامەزراند.

پێویستە لەوە تێبگەین، چۆن گۆڕانی گەورە لە ئەشکەوتەوە بۆ لادێ و لە خۆراك کۆکردنەوەوە بۆ خۆراك بەرهەمهێنان روویداوە، پێمان وایە تەنها بە چەشنێك لەوە تێدەگەین، کە سەرنجی هێمنانە بدەینە پەلە بەردەکانی (debris) لە گردە لادێییە بچووکەکاندا یان ئەوەتا لە هەندێك نشینگەی تری بەرچاو چینەکانی سەرەوەی ئەشکەوتەکاندا هەن لە رەخی گردەلاّنی سەرووی کەمەری بەپیتدا.

دەمێکی زۆرە نێوی بنەچەکی ئەشکەوت و لادێکان نەماوە“ ئەو نێوانەی پێیان نێو دەبەین نێوکردی عەرەبی و کوردی و فارسی، یان تورکی دانیشتوانی ناوچەیی ئەمڕۆن.

دانیشتوانی بنەچەکی نووسینیان نەبووە“ کەوابوو هەموو ئامرازێك لە هەگبەی شوێنەوارناسی پێش مێژوو وەردەگیرێت، ئینجا ئەمیش بۆئەوەی مێژووی پەلە بەردەکانی قیم بکات ئەوەندەی بتوانێت زانیاری لە هاوڕێیانی زانا سروشتییەکانی خۆی دەردەستدەکات. تێگەیشتنی تەواو لەوەی چۆن گواستنەوەی گەورە لە ئاستی خۆراك کۆکردنەوەی نشینەکانی ئەشکەوتەوە بۆ کۆمەڵگەی لادێی جێگیر، ئەنجامدراوە، تا بڵێی ئامانجێکی گرنگە.

رەنگبێ هەرگیز ئەو ئامانجە بە تەواوی بەدەستنەکەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئامرازەکانمان بۆ تێگەیشتن بەزۆری تیژ دەبن.





ئەوەی لێرە بەدواوە دێت دەنگوباسێکی تەواو نییە، بەڵکو وردتر بڵێین سەرەتایەکە.

ئەو ئامانجە تێگەیشتنەی، کە بەدوایدا دەگەڕێین، پێدەچێ لەماوەی کاری دەستەی ئەم نێردەیەدا بەرچەنگ نەکەوێ.

هەموو ئەوەی رەنگبێ لێرەدا بیگێڕینەوە لە ئەزموونیترین رێگەو پێش تەواوکردنی توێژینەوەی تاقیگەیمان، ئەوەیە، کە چۆن لەبارەی پرسەکەوە لە میانەی سێ وەرزی یەکەم لە کردەیی دیتنکاری و ئەو دەرئەنجامە نزیکانەی، کە دەتوانین لە سەرنجەکانی کردەی دیتنکاریمانەوە بیانکێشین، دەستمان بەکارکرد.

چوارچێوەی گشتی تیۆری پرسەکە نوێ نییە.

بەبێ گەشتێکی درێژ بۆ نێو بیرەکانی مێژوو، هەر چۆنێکبێت دەتوانین، چڕکردنەوەی جوگرافیایی ناوچەی پرسەکە-ی مایر (1911, p. 124)، کە بۆ ئێمە نەك دانسقەیە، بەڵکو دووربینیشە ، کە چڕبوونەوە پیك و فلۆر (1927, p. 140)-یش جەختیان کردۆتەوە، هەروا پێشیان لەسەر گرنگی نشینگەی کشتوکاڵییەکان وەك رێگەیەکی نوێی ژیان، دا گرتووە.

ڤی گۆڕدن چایڵدی پێش مێژووناسی گەورەی بەریتانی زۆری دەربارەی گرنگی تیۆری — گواستنەوە — نووسیوە، کە قۆناغی گواستنەوەی وەك شۆڕشانێکی گەورە لەمێژووی مرۆڤدا ناڤۆککردووە، لەگەڵ ئەوەشدا چایڵد (child, 1935) بیرەکەی ئیلیۆت سمیتی قبووڵکردووە.

وەلێ بەدڵنیاییەوە بیردۆزەی گشتی بە هەیامێك دەکەوێتە پێش سمیت.

بۆ نموونە، لە دواییدا لە کۆتایی سەدەکەدا، دوو مۆغتیلێ De Mortillet (1885, p. 576)، نووسیویەتی، کە:

((La domeestication, dans l’histoire de la civilisisation, est un fait immense, un découverte des plus importantes….)).

واتە: (( )).

هەر چۆنێك بێت، تاوەکو کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم، هێژ پرسەکە تەنها لە هەستی تیۆری خۆیدا چوارچێوەی دەگرت.

شوێنەوارناسی دیتنکاری بۆ دەرخستنی درێژەی گەواهی پێویست کەمیکردووە، بەڕادەیەك دانەرانی مێژوویی کۆن و پێش مێژووی وەك چایڵدیش بەدەگمەن ناڤۆکی کارەکانیان بەڕاستی هەڵناوە.





هێندێك هەڵکۆڵەری نێودار خۆیان بە بوارە کۆنترەکانی پێش مێژوویی فەلەستین (یان چاخی سەهۆڵبەندان) لە ئەشکەوتەکانی رۆژئاوایی ئاسیادا خەریککرد.

بەلاّم قەبارەی هەڵکۆڵینی شوێنەواری لە ناوچەکەدا زیاتر بە قۆناغە پەرەسەندووەکانی مێژووی کۆنی تەقلیدییەوە پێوەند بوو، وەك لە پێشدا تێبینیمانکرد، بەشێوەیەکی سەرەتایی گرنگی بە شوێنە تایبەتییەکان یان شتەکان، درا.

هێندێك شوێنی وەك بابیل و نەینەواو بابیلۆس و مەگیدۆ و یەریی هەموویان هەڵکۆڵدران، وەلێ بنچینەی فکری ژێدەری هەڵکۆڵەرەکانیان تەورات یان مێژووی کۆنی تەقلیدیبوو. جاربەجار چاڵی تەسکی بەرتەنگ یان چاڵی قوڵ بۆ نێو خوارووترین چینەکانی چەند شوێنێکی گەورە لێدراون و ئەم کردانەش سرشتی پارچە یافتەی پێش مێژوویان خستۆتە بەردەست. هەرچۆنێك بێت، کۆتی ئابووری بەرچاو لەسەر هەڵکۆڵینەکانی پێش مێژوویی لەم چەشنە هەبوونە، بەتایبەتی لە نموونەکانی، لە شوێنێکی، کە لادێیەکی پێش مێژووی یەکەم جار لێدامەزراوە، ئینجا هەزاران ساڵ لەسەر هەمان شوێن بەرەودوا ژیان بەردەوامبوو بێت.

بۆ هەڵکەندنی قوولاّیی پێش مێژوویی یەکێك لە گردە گەورەکان، پێش هەموو شتێك ئەوە پێویستە هەزاران تەنی قورسی لە چینەکانی دواتردا هەیە لابدرێت (بڕوانە p1. 1A).

هەروا «چاڵەکانی پێش مێژوو» ناوچەی زۆر سنووردار دەردەخەن، و دۆزراوەکانیشیان هەر سنووردارن. بۆ شوێنەوارناسەکانی پێشتر دەرنەکەوتووە بەدوای شوێنە بچووکە نادیارەکاندا بگەڕێن (نموونە. ل. ا. اب)، کە لە میانەی هەزاران ساڵی بەدوای نیشتەجێبوونی پێش مێژوویاندا دێت ئاوەدانی تێدانەبووە.

لەبەرئەوە تێگەیشتنمان لەبارەی ژیانی لادێی پێش مێژوودا لە باشترین رەوشدا سوالەت و ناوچەیەکی بووە.

تێگەیشتنی گواستنەوەی گەورە بۆ ئاستی شارستانی کۆمەڵگای لادێی، وەك بەشێوەیەکی لۆژیکی بیردەکەینەوە بەرێگەیەکی نوێی خۆراك رەنێو هێنانەوە پێوەستبووە، هەروا زانیاری دوور و درێژی لەبارەی ئەو ژینگە کۆنەوە دەوێت، کە قۆناغی گواستنەوەی تێدا رووداوە. بەشێوەیەکی گشتی پێش کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، سەرنجی رووەك ناس و کەشناس و زەویناس و گیانەوەرناسان بۆ ئەوە بووە تیشك بخەنە سەر رۆژهەلاّتی کۆن، هەروا بەشێوەیەکی تایبەتیش تیشك بخەنە سەر پرسی ئەسڵی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ.

وەلێ لەبەر زۆر کەمی گەواهی ئەسڵی شوێنەواری هەڵکۆڵدراوی پێوەند بەخودی سەردەمی — گواستنەوە — بەشێوەیەکی سەرەکی گرنگیدانی زانایانی سروشتی لە ئاستێکی بەر رامانیدا کورتبۆتەوە.

دواجار شوێنەوارناسی کەمی خستۆتە بەردەست تاکو داندراوەکانی برِوکس (١٩٢٦) دەربارەی ژینگە و دوکاندۆل (١٨٨٣) دەربارەی رووەکە چێندراوەکان و هاهن (١٨٩٦) دەربارەی بەخێوکردنی ئاژەڵ بچەسپێنێ، وەلێ لە ئاخیر و ئۆخری سەردەمەکانی پێش مێژوودا رەنگبێ بە هەلاۆێرە لە میسر ئەودیوو رۆژئاوایی ئاسیا لەڕووی کەڵچەرییەوە بەئاشکرایی لاواز بوو بێت.

رێکخستنەوەی زۆر سەرنج راکێشی دابەشکردنی مەڵبەندە رەسەنەکانی کشتوکاڵ لە لایەن ڤاڤیلۆڤ (١٩٢٦)ەوە لەسەر بنچینەی بیردۆزەکردنی گەورەترین ناوچە جیاوازەکانی ئەمرِۆکە دامەزرا بوو، نەك لەسەر بەڵگەی لە شوێنەوارییانە وەرگیراو دامەزرا بێت.

بەلاّم وەك هارلان (١٩٥١) پێشانی داوە، پێویستە سەنتەرە گەورە هەمەچەشنەکان نەبنە مەڵبەندانی رەسەنی کشتوکاڵکردن، لە تێبینی کردنی هەمە چەشنی بۆ ماوەزانی پەرەسەندوو لە گەلێك رووەکی نوێی جیهاندا، کە لە دوای دۆزرانەوەی ئەمریکا گەیشتنە تورکیا.

کتومتتر، پرسی گشتی تێگەیشتنی چۆن و لە کوێ قۆناغی گواستنەوەی گەورە لەلایەنە مێژووییە کەڵچەری و مێژووی سروشتی خۆیدا روویداوە، تاقیکردنەوەی سەرەکی گەواهی ئەسڵی پێویستە.

هێندێك بەڵگە تەنها دەتوانرێ لەڕووی خاك لەچینەکانی سەرەوە (نوێ)ی ئەشکەوتەکان و ساچمەکانی ئەو گوندە بچووکانەوە دەستبکەون، کە یەکەم جار ئەو مرۆڤانەی بوونە هۆی گواستنەوەی گەورە تیایاندا ژیاون. رێگەی بە کەڵکهێنانی گەواهیەکان بە هەڵکۆڵینی شوێنەواری بەشێوەیەکی تایبەتی ئاماژە بە پرسەکە دەدا.

لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمدا،نەخشەیەك دروستکرا (Braid wood, 1946 a; c f. 1956 a) بۆ ئەوەی گوتارێك بێت لەو زنجیرە گوتارانەی، کە بۆ کۆرِسێکی نوێ لە «ئەسڵی مرۆڤ» لە بەشی مرۆڤناسی زانکۆی شیکاگۆ ئامادەکرابوون، سەلماندی، کە بە ئاشکرایی کەلێنێك لە زانیاریماندا دەربارەی قۆناغی گواستنەوە لەدوا چینەکانی ئەشکەوت نشینە خۆراك کۆکەرەوەکانەوە بۆ ئەوانەی لە رۆژهەلاّتی کۆندا لادێی خۆراك بەرهەمهێنانیان باش دروستکرد، هەیە.

وا دیاربوو ریزبەندییەکە لە ئاخیر و ئۆخری رووکارێکی قۆناغی ئەشکەوتەوە کتووپڕ بۆ ئاستی کۆمەلاّنی لادێی جوتیاری پێشکەوتوو بازیدا بێت. گەر مێژوویی شاری شیکاگۆ جگە لە



کەتەلۆگی ساڵی ١٩٥٠، لەسەر ئەو کەتەلۆگەی ژۆلییێت و مارِکویت لەنێو هیندییەکاندا لە شێ — کاگ- ئونگ،دا لە ساڵی ١٦٣٧ بینییانەوە جگە لەوە لەسەر هیچ شتێکی تر بنیاد نەنرابێت، ئەوا بارێکی جیاوازمان دەبێت.

چاوەڕاوی گەواهییانی گواستنەوەیەك لە فەلەستیندا تاقیکرانەوە و دەرکەوت رازیکەر نین (Linda Braid wood, 1946). لە هەمان کاتدا، دەرکمان بەوەکرد، کە تەنها لە چوارچێوەی سرشتە شوێنەوارە هێشتا نەدۆزراوەکانەوە تێگەیشتنی قۆناغی گواستنەوەی گەورە دەدۆزرێتەوە. بەشێوەیەکی بەتین بیرکردنەوەکانمان بە نووسینەکانی چایڵد (بۆ نموونە. ١٩٣٤) و گفتووگۆکانی لەگەڵ هاورِێکانماندا لەهەر یەك لە بەشی مرۆڤناسی و پەیمانگای رۆژهەلاّتیدا ئەنجاممان داون، کاریان تێکراوە. سەرباری ئەوەش، بەزۆری وا دەردەکەوت، کە تارِادەیەك پلەیەکی بالاّی گریمانی سادە و لێك جیاییەك لە گشتاندنەکاندا دەربارەی قۆناغی گواستنەوە هەبووە، کە زۆرترینی مێژوونوسانی سروشتی و شارستانی ئەم دانراوانەیان دانابوو.

هێندێك لەم گریمانانە تەنها لە سرشتە بەرِێکەوت دۆزراوەکانی پێش مێژوو یان سەردەمی نیمچە مێژوویی لەو ناوچانەدا سەرچاوەیان گرتبوو کە ئێستاکە وادیارە گرنگیان کەمترە و هەندێکیشیان لەبەر رامانی شوێنەوارییانەی بێبناخەی مێژوونووسانی سروشتی پێشتر سەریان هەڵدا بوو.

لەلایەکی تریشەوە، هۆکارێکمان نییە، تاوەکو گومان لە بەڵگە فەراهەمەکان بکەین، کە لە دەرەوەی رۆژئاوایی ئاسیادا بەدوای شوێنەوارەکانی قۆناغی گواستنەوەدا بگەڕێین.

بە ئاشکرایی شوێنەواری پیشەکاری مرۆڤ لە چەرخی پلایستۆسین بۆ نموونە لە ئەشکەوتی زەرزی لە رۆژئاوایی ئاسیادا باش دەردەکەوێت (p1. 10A).

لە باشووری لوبنان و فەلەستیندا لە ئەشکەوتەکاندا ریزبەندی ئارکیۆلۆژیایی چەرخی بەردین تەواو دەردەکەوێ، کە لە دەوڵەمەندی شارستانی چینەکانی پێیان دەگوترێ «نەتوفی» کۆتایی دێت.

راستە هێماکانی گواستنەوەیەکی راستەوخۆمان لە ئاستی شارستانی لە لیستی نەتوفی پێشنیازکرا بۆ ئەو چینانەی دواجار چینی فەراهەمی سەرەکی یان چەند گوندێکی دیکەی بچووکی بەرچاو بوون، نەبینی.

هەرچۆنێك بێت، هەموو ئەفراندنەکان پێشنیاری ئەوە دەکەن، کە هێندێك لەو شوێنەوارانەی لە کۆمەلاّنی گوندی جوتیاری کۆن لە رۆژئاوایی ئاسیادا دۆزراونەتەوە پێش هەر شوێنێکی تر لە جیهاندا کۆنترین شوێنەواری فەراهەمبوونە. تەواو بەراوردمان کرد تاکو دەسپێکردنی سەربەخۆ





لە خۆراك وەبەرهەمهێنان لە بەشەكانی تری جیهاندا ببینین، كە لەسەر خۆركەكانی تر هەندێك جاریش لەسەر بنچینەی گیانەوەران بنیادنرابوون (Briad wood, 1952 a)، وەلێ بیرمانكردەوە، كە ئەمانە لەچاو نموونەی رۆژهەلاَتی كۆن تاقیكردنەوەی لەدواترن.

هەروەها سەرنجی دیتنكاری تەواوی ئەم سەردەمە هەبوون، كە سروشتناس و كلیلە مێژوویيەكان چ لە دۆكومێنتە نووسراوەكانەوە چ لە وێنە هوونەرییەكانەوە كردبوونیان تاوەكو ئاماژە بدەن بە رەخە گردەلاَنییەكانی خەرمانەی بەپیت وەك ناوچەیەكی ((كرۆكی)) سروشتی.

ماقوڵبوو گومانبېرێ، كە گواستنەوە لەوێدا روویداوە.

لەنێو ناوچەی رەخە گردەلاَنییەكاندا ((یان لە رەوشی گیانەوەرانی گەورەتردا، كە لە نوێوە دەركەوتن) كۆمەڵێكی جیاوازی رووتی رووەك و گیانەوەران دەردەكەوێ، كە بوونە بنچینەكانی نموونەی خۆراك بەرهەمهێنانی ترادیسیۆنی شارستانی خۆرئاوا.

لە هیچ شوێنێكی تری جیهاندا نەبووە گەنم و جۆی كێوی و مەڕی كێوی و بزن و بەراز و گاڕان و ئەسپ لە تاكە ژینگەیەكی سروشتیدا بەیەكەوە دۆزرابنەوە.

ئەمە هێشتا (جگە لە گاڕان و ئەسپە كێوییە لە نێوچووەكان) لە بواری هەڵكشانەكان و چرپییەكانی داباریندا كێشەیە، كە ناوچەی رەخە گردەلاَنییەكان دەینوێنێ.

هاوكاتی دابەشكردنی نموونەی شوێنی گوندە كۆنەكان، كە لە ناوچەی رەخە گردەلاَنییەكاندا دۆزرابوونەوە كاتێك لەسەر نەخشە دانداران سەرنج راكێشبوو (Braid wood, 1952 a.).

بەهەرحاڵ تێگەیشتنی دروست لەڕاستییەوە دووربوو. فەراهەمی شوێنی گوندە كۆنەكان بۆ وێنەكردن لەسەر نەخشەی دابەشكاری ژمارەیەكی كەمبوون و بەدڵنیاییشەوە تاڕادەیەك لەوەی، كە بەخودی بابەتی قۆناغی گواستنەوەوە پێوەند بن لەدواتر بوون.

رەنگبێ نەخشەكە زۆر گرنگ نەبوبێ، چونكە راستەوخۆ بەڵگەی فیزیكی مێژوویی سروشتی ناوچەكەی بۆ گرنگترین سەردەمی پێوەند، نەدەدا. ئایا چەشنی ئاو و هەوا و رەوشی ژینگەی گشتی لەناوچەی رەخە گردەلاَنییەكاندا لە هەزارانی دەوری هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا تاڕادەیەك وەكو یەكبووە یان بەشێوەیەكی ریشەیی لەسەردەمە مێژووییە نوێتر و مودێرنەكانەوە جیاوازە؟ ئایا گونجاوە سەرنجەكانی ئەمرۆكەی سروشتناسان (دە) هەزار ساڵێك بگەڕێندرێتەوە دواوە؟ بێگومان، كاری زۆرتر پێویستبوو.

هەرچۆنێك بێت، وا بۆ ئێمە دەردەكەوت، كە تیۆری گشتی تاڕادەیەك راستبوو.





چاپڵدو هێندێك دانەری دیكە (بەلاَم هەموویان نا) پێیان وابوو، كە یەكەم قۆناغی گواستنەوەی گەورە بۆ ئاستی شارستانی كۆمەڵی لادێی جووتیاری رۆژگارانێك دوای دەیان هەزار ساڵ بەر لە ئێستا لە رۆژئاوایی ئاسیادا روویداوە.

وەلێ تیۆرەكە ئاماژەدانی زیاتری بە بەڵگەی دیتنكاری پێویستبوو.

باوەڕمان وابوو، كە شانۆكە كەوتۆتە ناوچەی رەخە گردەلاَنییەكانەوە، بەلاَم بۆ سەلماندنی ئەمە، ویستمان ژینگەیەكی لەنێوچوو نووژەنبكەینەوە.

بۆ ئەم نووژەنكردنەوەیەش نەك هەر راستەوخۆ هەڵكۆڵێنی شوێنەواری گونجاو بە ئاڕاستەی پرسەكە پێویستبوو بەڵكو بەزووی هاوكاری زانایانی سروشتیشی پێویستبوو.

لە هەمان كاتیشدا زۆر هەستیاربووین لەو راستییەی، كە رووەك و گیانەوەران خۆیان ماڵیناكەن و نەژینگەیەكیش ئەوان ماڵیدەكات.

ماڵیكەر مرۆڤە و پرسی سەرەكی ئێمەش لە تێگەیشتنی قۆناغی گواستنەوەی گەورە یەكێك دەبێت لە هەڵسەنگێنەرانی ئاستەكانی شارستانی یەكسەر پێش و لەماوە و كتووپڕ دوای ئەو سەردەمەی، كە لە میانەیدا قۆناغی گواستنەوە روویداوە.

سەرباری ئەوەش كاتێك بیركردنەوە و نووسینمان پەرەیان سەند وازمان لە هێندێك زاراوەی گرێكێندراوی وەك **میزۆلیثیك** (Mesolithic) واتە (چەرخی بەردی نێوەڕاست) و **نیۆلیثیك** (Neolithic) واتە (چەرخی بەردی نوێ) هێنا" بۆ ماوەیەك لە جەختكردنی زاراوەی ((شۆڕشی خۆراك بەرهەمهێنان)) كە پەیوەندییەكی دروستی بەئێمەوە هەیە، پەیڕەوی چاپڵد — مان دەكرد، وەلێ بۆ چەند ساڵێكی دواتر پرسەكەمان بە ((دەركەوتنی كۆمەڵی لادێی جوتیاری چالاك)) نێوزەندكرد.

پێمان وایە ئەم نازنێوە بۆ گۆڕانكارییە جیڤاتۆكییە فراوانەكانی، كە قۆناغی گواستنەوە بوو بە هۆكاریان، زاراوەیەكی تەواوترو راستترە.

لەڕووی بیناسازییەوە كۆمەڵگەی لادێی بەرچاو گوزارشتكردنی رێگەیەكی نوێی تەواوی ژیانی مرۆڤایەتی بوو، كە هەمیشە لەسەر ئابووری كشتوكاڵكردن و پیشە بچووكەكان دادەمەزرا.

ئامانجی توێژینەوەكەمان رێكخستنەوەی هەریەك لە مێژوویی سروشتی و شارستانییە، هەروا ئەم رێكخستنەوەیە دەبێت بە رۆشنی چەمك و زاراوەكانی قۆناغەكانی گۆڕان و سرشتەكانی مێژووی شارستانی پێناسەبكات. وەلێ وەك مێژوونووسانی شارستانی هیوامان وایە، كە

بەسوودترین گوتارەکانمان بۆ تێگەیشتنی ئەوەبن، کە چۆن شۆڕشگێڕی لە تەکنۆلۆژیاو ئابووریدا دەگۆڕێ — لەنزیکەوە خۆیان بەژینگەی سروشتییەوە بەندیوار دەکەن — کاردەکەن و دەگۆڕێن یان ئایا خۆیان لەلایەن تەواوی چاندەکانی مرۆڤەوە مەرجدارکراون.

گەر بمانەوێ خودی ڕێکخستنەوە بەدەستبهێنین، ئەوا هەر زانیارییەکی وەرگیراوی شوێنەوارییانە دەربارەی قۆناغی گواستنەوە لە ئاستی شارستانی ئەشکەوتەوە بۆ ئاستی کۆمەڵی لادێیی جووتیاری دەبێت بەرێگەیەکی ڕێکخراوی وابخرێتە بەرچاو، کە بە چەمکە (بیر) تەقلیدییە سەپێندراوەکانەوە پابەند نەبێت.

کەڵەکەبوونی حەتمی زانیارییە نوێکان بەزۆری بەکارهێنانی پلانە چەمکییەکان دەسەپێنن، کە دەقاودەقی دروستییەکانی پرسەکەن[1].

---

(١) بنچینەی زاراوە ناسی تەواو بۆ پۆلێنکردنی بوارێکی دوورو درێژو جۆراوجۆریی گەورەی سرشتە شوێنەوارییەکانی پێش مێژوو بە ئاسانی داناهێنرێت.
ئەم پەرتووکە جێگای ئەوەنییە بیرەکانمان پێشبخات (بڕوانە بریدوود، ١٩٤٦ b)، بەڵام هەستدەکەین، کە زاراوە بەربلاوە گریکێندراوە نوێیە بەکارهاتووەکان نابنە هۆی ئاسانکردنی گەیاندنی بیرەکان.
بەکورتی، لەگەڵ ئەوەشدا هۆکاری شوێن (هەرێم) پێویستە بەجیا گوزارشتبکرێت، زاراوە گریکیە نوێکان بەزۆری بەجیا بۆ هەر یەکێك یان بۆ هەرسێ فاکتەرەکەی تر بەکاردەهێنرێن، کە پێویستە ناڤۆك بکرێن: (١) سەردەم (کرۆنۆلۆژیا: دابەشکردنی هەیام بۆ چەند ماوەیەك" واتە دانانی مێژووی دروست بۆ ڕووداوەکان و ڕێکخستنیان بەپێی ریزبەندی هەیامی)، (٢) ناڤۆککردنی پەرەسەندنی چەشنی تەکنۆلۆژی (بۆ نموونە بوونی ئامرازی ساچمەکراو یان ئامرازی بەردی پۆلیشکراو و ئامرازی کانزایی و بوونی هونەری بەکارهاتوو لە پیشەکاریاندا، هتد.)، (٣) راڤەکردنی چاندی — مێژوویی (بۆ نموونە. کۆتکراوە بەڵام گشتاندنەکان دەربارەی ئاست یاخود قۆناغەکانی دەستکەوتی کۆمەلایەتی شارستانی لێکدەداتەوە.
بەوە رازیدەبین، کە ئەم هۆکارانە ناتوانرێت بەسادەیی لەژێر تاکە واژەیەکی وەك ((neolothic))دا کۆمەڵبکرێن، گەر تێگەیشتن بۆ وەگێرخستنی دەرئەنجامێك بێت.
گواستنەوەی شارستانی فرە هێڵ بوەو هەمیشەش بە یەکسانی لە هەر هێڵێکدا هەنگاوی نەناوە. هەریەك لە (homotaxis) و سرشتی جیاوازی لارە ئاسۆ، کە بەبلاوبوونەوەوە بەندیوارن دەکرێ لە تۆماری شوێنەواریدا بچەسپێندرێن.
هێڵە شارستانیە دیاریکراوەکان هەریەك لە ئاستەکانی پلانێکی پۆلێنکاری هەڵکشانی تەواوی ئایدیالیان پێك نەدەهێنا. بەدیلەکانمان بۆ زاراوە گریکیە نوێکان ئەمانەی خوارەوەن:
(١) سەبارەت بە ((کرۆنۆلۆژیا)) هەڵسەنگاندنانێکی بەزانیاری لە ماوەی چەندین ساڵدا وەك بنچینەیەکی فەراهەمی دیاریکردنەکانی تیشکی کاربۆن چواردە دروستبکرێن، هەروا بڕیاری بەراوردکاری ئێمە یان ریزبەندی ستراتیگرافی بوار بدات.





کەمێك لە زانایان لە بۆشاییەکدا کاردەکەن و بەخۆشحاڵیشەوە دوای جەنگی جیهانی دووەم چالاکییەکی شوێنەواری لە رۆژهەلاتی کۆندا هەبوو، کە تارادەیەك لە بەکەڵکهێنانی ئەو بەڵگانەی دەکۆڵییەوە، کە لە پرسی تایبەت بە ئێمە نزیکدەبوونەوە.

بەداخەوە، لە لایەکی تریشەوە ئەو شوێنەوارناسانەی، کە بەختی باشیان هەیە لە زانکۆیەکی گەورەی لێکۆڵینەوەدا دابندرێن، کە (پارە — یان ماتە رووبەڕووبونەوە دەزگا فێرکارییەکان) و میلاکی بەردەوامبوونی سپاردنی رۆشنبیری بە تاکە پرسێکی توێژینەوەوە هەبێت، گەلێك کەمن.

ئەو شوێنەوارانەی کە لە دەرئەنجامی هەڵکۆڵینی شوێنی لادێ و ئەشکەوتە کۆنەکان کەوتنەوە لە تایبەتمەندیەکدا دەگمەنن، کە سەرنجی مۆزەخانە تەقلیدییەکان یان بەخشەرە تایبەتەکان رادەکێشێت.

بەم واتایە، کاری پڕۆژەی چەرمۆ — عیراق بەشێوەیەکی ناوازە لە لایەن کاراکتەری زانکۆکەوە هێڵدرایەوە، کە پڕۆژەکەی چالاککردەوە. هاوڕێکانمان لە دەرەوەی ئەم زانکۆیەدا دەرفەتی کەمتریان هەبوو" زۆر کەمیشیان توانیان چ چڕببنەوە چ بەردەوامبن لەسەر هەڵکۆڵینە بدۆزەرەوەکانی پرسی گواستنەوە بەرەو کۆمەڵی لادێیی جووتیاری، گەرچی ئەوە ئارەزووی سەرەکییان بوو.

یەکەم دەرك و شارەزایی هەڵبژاردنی شوێنی لادێیەکی بچووکی هەڵکۆڵین ئاسانانە بەهۆی دیار دیدانەکانی سەر رووی زەوی پێکهاتەکانی پێش مێژووییەوە لە باشووری رۆژئاوای ئاسیادا، ڕەنگبێ بتوانرێ بۆ مەلوان بگەڕێندرێتەوە (Mallowan and Rose, 1935) لەبەر کارەکەی لە ساڵی **١٩٣٣**-دا لە تەل ئارپەچییە کتومت لە رۆژهەلاتی مووسڵدا، لەگەڵ ئەوەشدا زەحمەتە کە بڕیارێکی لەو بابەتە بدرێت.

---

(٢) بەکارهێنانی جۆری — نێونانی شوێنەکە بۆ کۆمەلانی سرشتە پیشەکارییەکان، و بۆ هەر کۆمەڵەیەکیش بنچینەیەکی ((ناڤۆکی پەرەسەندنی شێوەی تەکنۆلۆژی)) پێکهاتەکانی بدرێت (بڕوانە بەشی پێنجەم).
(٣) بۆ بەهێزکردنی ((راڤەکردنی شارستانی — مێژوویی)) لەبارەی سرشتە شوێنەوارییەکانی پێش مێژووەوە ئەوانەی، کە پەیوەندییان بە ئێمەوە هەیە شەقڵێکی چینەکانی پاشماوەی جۆری نشینگەکان بەکاردەهێنێت (بڕوانە بەشی دوازدە).
هەرچۆنێك بێت دوای چەند تاقیکردنەوەیەکی بیرو هۆش و پاڵنەرەکانی مرۆڤ (Soul – Searching) بڕیارماندا تەنها زاراوەی ((**پالیۆلیثیك**))ی گریکێندراوی نوێ بهێڵینەوە" بڕوامان وایە، کە ئەو زارەوەیەشمان بە فاکتەری ((ناڤۆکی پەرەسەندنی شێوەی — تەکنۆلۆژییەوە)) پەیوەستکردوە.

پێش سەردەمی مەلوانیش تاقیکردنەوەی باش دەربارەی گردە خودان گڵێنە رەنگکراوە سەرنجڕاکێشەکان لە باشووری میسۆپۆتامیا و سوسیانادا کران، وەلێ بەتەواوی تێگەیشتنێکی روون لەبارەی مێژووی شارستانی پرسەکە نەبوو. بەهەمان شێوە، لە چاڵە قووڵەکانی سەر گردە مێژووییەکان تاو نا تاو چینەکانی پێش مێژوو هەڵدەکۆڵدران.

هەرچۆنێك بێت، تەواو ئەوە روونە، کە هەڵکۆڵینی لیۆد و سەفەر (١٩٤٥) لە تەل حەسوونە لە باشووری مووسڵدا دەرئەنجامی کۆڵینەوە و هەڵبژاردنی زانین بوو، کە لەسەر بنچینەی دیاردیدانەکانی سەر رووی زەوی بنیادنرابوو، کە کۆنترین سرشتی دواجار فەراهەمی لادێی ریزبەندی باکووری عیراقی تێدابوو.

ئەمەش گوزارشت لە یەکەم هەوڵدەکات، کە بە چەند هەڵبژاردنێك ئاسۆیەك دەربخرێت، دواجار کۆڵدرانەوە تاوەکو کۆنترین سرشتی لادێ بنوێنێ.

لە میانەی ئەوکاتەدا، کە کار بەنێو سەردەمی پلایستۆسینی پێش مێژوودا بەرەو سەر دەکرا، شوێنەوارناسان لە فەلەستیندا لە ئاراستەی پێچەوانەوە گەواهیان بەرەو قۆناغی گواستنەوە نزیکدەکردنەوە.

سەرکەوتنە درەوشاوەکانی پرۆفیسۆر دۆرۆتی گارود لە ئەشکەوتەکانی سەر شاخی کەرمل، بە هەڵکۆڵینی زیاتری ئەشکەوتەکان لە گردەکانی جوودی لەلایەن ئەم. غێنێ نۆڤی ( M. Renē Neuville)، دکتۆر. ئەلفرێد رەست (Dr. Alfred Rust) لە یەبرود (سوریا) و جێژ ویتز (Jesuits) لە قەسر عەقیل (لوبنان)دا، تەواوکران، کە چەند بیرێکی پێوەند بە تایبەتمەندییەکانی قۆناغی گواستنەوەی ورووژاند، کە دەبێت بەدوای دواترین چینەکانی پالیۆلیتیکی ئەم ئەشکەوتانەدا هاتبن، وەلێ ئەو کارانەی مەبەستیان روونکردنەوە یانبوو کەمبوون.

سەرنجڕاکێشترین شتی دواترین چینە دیاریکراوەکانی ئەم ئەشکەوتانە ئەوەبوو، کە کۆمەڵێك یان لیستێکی دروستکراوە دەستییەکانی نەتوفیان لەنێو خۆگرتبوو، کە تاوێك دەخرانە پۆلی ((**میزۆلیتیك**)) و تاوێکیش دەخرانە پۆلی ((**نیۆلیتیك**))ەوە[٢].

کیتی ئامرازەکانی نەتوفی پێشنیاری ئەوە دەکات، کە دروستکەرەکانی رەنگبێ لە قۆناغێکی سەرەتایی کشتوکاڵکردندا بووبن.

(٢) گارود لەدواترین توێژینەوەیدا دەربارەی نەتوفیان (١٩٥٨، ل. ٢٢٦) بەڕوونی زەحمەتەکانی زاراوەناسی دەناسێنێ.





لە دەرئەنجامەکانمادا دووبارە چاو بەم پێشنیارە و چەند بابەتێکی دواتردا دەگێڕینەوە.

وا دەردەکەوێ رووپێوی راستەوخۆی کەم هەبووبن بۆ دیاریکردنی لایەنی شوێنەوالاکانی نەتوفی و گریمانە لێکەوتووەکانی، لەگەڵ ئەوەشدا کارەکانی ستێکیلز و هاس (١٩٥٢) (Stekelisand Hass) لە ئەشکەوتی ئەبو عوسبەدا و پیرۆت (Perrot) ١٩٥٢ لە شوێنی والای ئەبو غۆشدا، کە هەردوو شوێنەکە لە فەلەستینن، لە هەڵبژاردنی شوێنەکانەوە وادیارە، کە تەنها بۆ پێکهاتە پێش مێژووییەکانیان سەرچاوەیان گرتبێت.

پیرۆت (١٩٥٧) دواتر شوێنێکی بێگومانی والای نەتوفی لە عەین مەلاحە لە باکووری ئیسرائیلدا هەڵکۆڵی.

سولیکیش (١٩٥٧) لە باکووری رۆژهەڵاتی عیراقدا لە زاوی چەمی شانەدەری نزیك رەواندزدا شوێنێکی وەك کەریم شەهری لە هەمان تایبەتمەندی سەرەکی دۆزییەوە (بڕوانە ل. ٥٢ — ٥٤ ).

هەرچۆنێك بێت، هەڵکۆڵەرانی دوای جەنگ لە باشووری رۆژئاوای ئاسیادا بەزۆری بەردەوامبوون لەوەی خۆیان بە چاڵە قووڵەکانی قەبارە قەتیسکراوەوە لە شوێنە گەورەکانی سەردەمە مێژووییەکاندا خەریکبکەن گەر بەشێوەیەکی رەها ئەوان بەدوای سرشتەکانی پێش مێژوودا گەڕابن.

لەژێر سایەی ئەم هەل و مەرجانەدا میس کینیۆن (١٩٥٧) (Miss Kenyon) لە ئەریحادا و دیوناند (١٩٥٦) (Dunand) لە بابیلۆسدا، چەند هەوڵێکی هاندەری بالایاندا.

لە کوردستانی عیراقیشدا نێردەیەکی دانیمارکی بەسەرپەرشتی هارڵد ئینگهۆڵت ( Harald Inghold) دواتر لێدانەوەی چینەکانی قۆناغی چەرمۆی لە گردی شمشارەدا راگەیاند (بڕوانە ل. ٤٩) (Ingholt, 1957).

وەلێ کاتێك هەڵکۆڵینی کردەیی ئێمە دەستی پێکرد، لە هیچ یەکێك لە هەڵکۆڵینەکانی دوای جەنگدا مەترِیاڵێك نەبوو، کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ بە قۆناغی گواستنەوەی گەورەوە بەندیوار بێت. لە دوای جەنگدا چەند کارێکی راستەوخۆ دەربارەی پلایستۆسینی پێش مێژوو لە ئەشکەوتەکاندا کران و لێیان کۆڵرایەوە.

هەڵکۆڵینەکانی جێژویتز لە قەسر عەقل لە باکووری بەیرووت تەواوکران (یووینگ، ١٩٤٧ — Ewing, 1947)، وەلێ شوێنەکە دوا بەدوای دەستپێکردنی قۆناغی گواستنەوە مەتریاڵی نەدەدایە دەست.

نوێترین چینی کۆك لە ئەشکەوتی شانەدەر لە کوردستانی عیراقدا (لە هەڵکۆڵینەکەی سولیکیدا (١٩٥٥ و ١٩٥٧) بەزۆری هاوتەریبی مەترِیاڵەکانی هەریەك لە ئەشکەوتی زەرزی و پەلگەوەرِە بوو (برِوانە ل. ٥٧ — ٦٠ )" وا دیارە لە سەرەتادا سولیکی مەبەستی دەرخستنی چینە کۆنترەکانی پلایستۆسین بووبێ.

هەروا هەڵکۆڵینەکانی کوون (coon) ١٩٥٧ لە ئێراندا و دواتر لە سووریادا بە چەشنێکی سەرەکی تیشکیان دەخستە سەر چەرخی پلایستۆسین، وەلێ چینە دیاریکراوەکانی سەرەوەی هەردوو ئەشکەوتی بێلت و هوتو، کە دەکەونە ناوچەی (شاخاوی) بەپیت و ژینگەی لە باری دەشتی کەناری باشووری قەزوینی تایبەتەوە، مەترِیاڵی وەهایان خستە بەردەست، کە رِەنگبێ بەشێوەیەکی نارِاستەوخۆ بە قۆناغی گواستنەوەی گەورەوە پێوەستبن، لەو باوەرِەداین، کە مەترِیاڵەکانی هەریەك لە ئەشکەوتی کەمەر بەند (Belt) و هۆتۆ گوزارشت لەو شارستانییانە دەکەن، کە بە بەراوردکردن لەگەڵ شارستانییەکانی ناوچەی کرِۆکی وڵاتی رەخە گردەلاّنییەکان، رِەنگبێ بیسەلمێنن بەزۆری گرنگییەکی سەرەکییان نییە (لە کاتێکدا ئەو دوو ئەشکەوتانە لەسەردەمەکانی خۆیانیاندا ناوەندێکی تەواو سەرەکین).

لەو باوەرِە داین، کە ئەم دوو ئەشکەوتانە بەردەوامبوونی ئاستی خۆراك کۆکردنەوە لە چەند ناوچەیەکی دەوروبەردا پێشاندەدەن، دوای دەرکەوتنی کۆمەڵی لادێی جوتیاری لە ناوچەی کرِۆك (nuclear)دا (بریدوود ١٩٥٨ p).

لێرەدا ئامانجمان شیکردنەوەی دەرئەنجامی هەڵکۆڵینەکانی دوای جەنگی هاورِێکانمان نییە. گەر یەکلا کردنەوەیەکی ئاوا بکەین، ئەوا کار لە چینە بنچینەییەکانی تەل ئەلسولتّا (ئەریحا)دا زۆر سەرنجمان رادەکێشێ.

میس کینیۆن (Miss Kenyon) ١٩٥٧، لەم هەڵکۆڵینانەدا قۆناغە یەکبە دواییەکەکانی رۆنانسازی (Architectural)-یەکی ئاڵۆزی باش پێشکەوتووی دۆزییەوە.

کۆمەڵێکی زۆری رۆندراوی دیوار قایم، کە کەلویەکیان تێدابوو پەیژەیەکی نێوەخۆیی (interior) هەیە و بە بەردی رێککراو (Rock – cut ditch)یش دەورەیدراوە، شارۆچکەیەکیش لە رووبەریکدا، کە دەگاتە نزیکەی ٨ — ١٠ ئەکرس، کۆمەڵە خانوویەکی هێشۆیی لە خشتی قورِ دروستکراو دەورەیداوە. بەلاّم دوو قۆناغە کۆنترەکانی شوێنەکە گلێنەیان نەدەخستە بەردەست و چەند دیاریکردنێکی کاربۆن چواردەش، کە تا ئێستا لەباریانەوە راگەیندرابن و بلاّوکراونەتەوە، دەگەنە دەوری ٦٨٠٠ — ٥٨٠٠ ب.ز.



هەروەها دەنگوباسی ئەوەش هەیە، کە شتوومەکە جۆراو جۆرەکانی وەك نەتوفیان بە دیاریکردنانێکی کاربۆن چواردەوە بەنزیکی ٧٧٧٠ ب.ز بکەونە ریزی ئەم قۆناغە کۆنترانەوە.

وەك بلێی میس کینیۆن و هاوکارەکەی ئەم دیاریکردنانەی کاربۆن چواردەیان بەرِاست قبووڵکردوەو تارِادەیەکیش زێدە رِۆییان لە راڤەکردنەکانی «شارستانیەت» لە «چاندی ئەریحای چاخی بەردی نوێی پێش گلێنەدا» کردووە.

راستخستنی ئەم زاراوەناسی هونەریە و ئەم راڤەکردنانەش لەسەر بنچینەی گەواهییەکانی هەنووکەدا خراونەتە ژێر پرسیارەوە (بریدود، ١٩٥٧ و ١٩٥٨ p). گەرچی ئەم گومانە لە گرنگی شوێنی تەل ئەلسولتّان کەمناکەنەوە.

بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا لەسەرەتادا گومانمان هەبوو گرینگیەکەی لەچاو شارۆچکەیەکی کۆنی ناوچەیی لە هەمان ژینگەی لە باری تارِادەیەك تایبەتدا بووبێت، دەنگوباسی نوێ دەربارەی چینەکانی وەك نەتوفیان لەریزبەندییەکی لێك دانەبرِاوی پەرەسەندنی چەشنی شتومەکەکان (Typology) بەرەو سەر بەنێو چینە بەسەریەکدا کەوتووەکانی شارۆچکەیەکی پێش سەردەمی سیرامیك (non ceramic)-دا، گرنگییەکی زۆری لێدەکەوێتەوە.

ئەم دەنگوباسە بۆ پشتگیریکردنی وێنەیەك دەربارەی ئەگەری گواستنەوەی (ئەهلی) باو بۆ شێوەی نشینگە و سەرچاوەی خۆراك لەمیانەی سەردەمی گواستنەوەدا لەم ناوچە تایبەتییەدا لە دەوروبەری ئەریحادا، بەکاردەهێنرێ. بەچاوپۆشین لە پرسەکانی مێژوواندن، ئەم کۆششە شوێنەوارییانە چ لە دۆڵی ئەردەن و چ لە کوردستانی عیراقدا دەیسەلمێنن وابەستە و پێوەستن.

هەروەها بەچاو پۆشین لە پرسی ژینگە تایبەتییە لە بارەکان، هەریەك لە کۆششەکان دەکەونە ناوچەیەکی گشتی، کە هەستدەکەین رەنگبێ بۆ گواستنەوەی گەورە گرنگبن. هەریەك لە هەڵکۆڵینەکان پاشماوەکانی تایبەتمەندی شارستانی و ئەو ریزبەندییەیان دایە دەست، هەرچەندە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر وەك یەك نین، کە دروستکردنی چەمکێك بەهێزدەکات، کە دەکرێ فرەیی روودانی دووبارە خۆ گونجاندنەکانی چرِبووەوە لەنێو چەند نیمچە هەرێمێکدا ببینرێ، هەر یەکێکیش لەسەر بنچینەی خودی نەریتە ناوچەییەکانی خەڵکی پێشووەوە دەکێشرێ.

بەشێوەیەکی راشکاوانە ئەم چەمکە بۆ جەختکردنەوەی رِۆڵی ناوچەیەکی دابرِاو لەنێو چەندان نەریتی دیاریکراودا، کە پێشتر سەپێندراون، هەروا بۆ هەرە کەمکردنەوەی رۆڵی چ بەراوردکردنی شارستانییە دوورەکان (cross – cultural) بێت چ کاریگەرییە تێکەلاّوەکان بێت، بەکاردەهێنرێت.





ڕەنگبێ هەردوو ڕۆڵەکە وەك یەك بەهێز بن، وەلێ بەڕاستی کەمی بەڵگەکان هەڵسەنگاندنەکانمان دەربارەی ڕۆڵی دووەم قەتیس دەکەن.

تەواوی بەڵگەشیاوەکان بەتەواوی پێچەوانەی تاوتۆیی ئەوەن، کە هێژ یەکێك نەتوانێ گریمان بکات تاوەکو پێوەندییە وێکسازییەکانی هەردوو ڕۆڵەکە (گواستنەوەی شارستانی دابڕاو لە بەرامبەر جێگۆڕکێی شارستانی هەرێمیدا) لەدوا دەرئەنجامدا ببینێت.

فرە چەشنییەکی فەراهەمی ئەگەرەکانیش پێویستە لەم پێناوەدا بڕەخسێندرێت. هەرچۆنێك بێت بەشێوەیەکی کاتی لە ڕێگەی بەڵگە ناچونییەك و پەرتەکانەوە دوو هێڵی ئەزموونی تەنها لە دوو ناوچەی سنوورداری کایەیەکی گەلێك فراوانی شاراوانەدا درێژەیان پێدەدرێت.

ڕاپۆرتەکەمان هەوڵدەدات پێشکەشکردنێکی گشتی ڕاستی و نەکێشەکان (imponderable)ی، کە لە سوستەکردن (sampling)ی کوردستانی عیراقدا دەردەکەون بەدەستەوە بدات. هەروا قایلمان دەکات زێدەبوونی گشتی ئارەزووی ڕۆشنبیری لە قۆناغی گواستنەوەوە بۆ کۆمەڵی لادێی جووتیاری و بەدەستهێنانی گرنگییەکەی (واتە هی گواستنەوە) وەك هێمایەکی گەورە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، تێبینی بکەین.

ئەم زێدەبوونەش گومانی تێدانییە بە تەواوی بەهۆی میللیەتی دوا نووسینەکانی می. گۆڕدن چایڵد — ەوەیە، بەتایبەتیش ((مرۆڤ خۆی دروستدەکات و چی لە مێژوودا ڕوویداوە — Man Makes Himself and What Happened in History))، کە بۆ گەشانەوە لەو نێوەندە ڕۆشنبیرییەدا بەکارهێندرا، کە بازاڕێکی گەرمیشی بۆ کارەکەی ئارنۆڵد تۆینبی (توێژینەوە لە مێژوودا — Astudy of History) کردەوە.

لەڕاستیدا تۆینبی پەرەپێدانی چایڵد لە بیردۆزەی بڕوکس دەربارەی گوێزرانەوەی بای بارانەکان لە دوای بەستەڵەکدا بەرەو باکوور لە دەرئەنجامی وشکبوونەوە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەفراسیادا وەك ((مەیدانخوازی)) خۆی لە ڕوونکردنەوەی دروستبوونی شارستانی میسریدا — genesis of Egyptaic civilization) بەکاردەهێنێت.

ئەم بیردۆزەیە لەسەر بنچینەی گریمانی کشانەوەیەکی سەپێندراوی ڕووەکەکان، گیانەوەرەکان و مرۆڤەکان بەرەو مێرگ و دۆڵی ڕووبارەکان بەهۆی دیار نەمانی ڕێڕەوی ڕەشەبای باشوور بەهۆکاری بە بەستەڵەك دروستبوو (glacially induced)، هەوڵدەدات دەرکەوتنی کشتوکاڵکردن و ئاژەڵ ماڵیکردن ڕوونبکاتەوە.





لویس مەمفۆرد (Lewis Mumford) ١٩٥٦ توینبی بە جەختنەکردنەوەی تەواوی لایەنە پۆزەتیڤەکانی قۆناغی گواستنەوە دەخاتە بەر ڕەخنە.

مەترسیە، کە چایڵد بواری تەکنۆلۆژی لە هەڵسوکەوتکردنیدا دەربارەی تایبەتمەندی قۆناغی گواستنەوە و دەربارەی ڕێگەی ژیانی مرۆڤیش لە کۆمەڵی لادێی جووتیاری کۆندا، جەختی کردۆتەوە. ڕامبوونی گەورەی لەگەڵ ئەو بەڵگە شوێنەوارییە سەرەتاییانەی، کە هەبوونە، کاتێك ئەو نووسیویەتی و مەبەستیشی بە ئاڕاستەی مێژوویەکی فەلسەفی مەتڕیالیستی زیاتر ڕاڤەکردنەکانیانی سەپاندۆتە نێو کای ئەو گۆڕانکارییانەی، کە ڕێدفیلد ١٩٥٣ (Redfield) وەك پێڕۆی تەکنیکی ئاماژەی پێداون، بۆ هەڵاوێرەکردنی سەرنجدان بەرەو گۆڕانکارییەکان لە پێڕۆی ئەخلاقیدا.

چایڵد بە بەر پاساوکردنێکی تەواو وەڵامی ئەوە دەداتەوە، کە شوێنەوارناسان تەنها گەواهی شتەکان (بەشێوەیەکی سەرەکی ئامێر و ئامرازەکان، چەکەکان، کەل و پەلەکانی بەکارهێنانی ڕۆژانە) بۆ ئەو فەراهەمدەکەن — هەروا کەم تەواوی ئەمانەش —و ئەوەش وەڵامدەداتەوە، کە ئەو لە ڕاڤەکردنی واتای بیۆرێك تاوەکو شارستانییەتییەکی لەنێوچوو زیاتر هەڵکۆڵەرێکی مەیدانی بووە، نەك لە ڕاڤەکردنی واتای ئەو شێوەیەدا، کە خەڵکی لە ڕەنگکردنی گڵێنەکانیاندا بەکاریانهێناوە.

لەڕاستیدا، یەکێك لە مەتەڵە گەورەکانی شوێنەواری پێش مێژوو لێرەدا هەڵدەکەوێت.

چۆن دەگەینە ئەو ڕاڤەکردنە بەر پاساوەکانی ئەو پێڕۆ ئەخلاقییانەی، کە خەڵکی شارستانییەکی لەنێوچوو لە میانەیاندا ژیاوە؟ باڵاترین پلە چییە، کە تیایدا شیاوە چەند ڕاڤەکردنێك لە شوێنەوارە مەتڕیاڵییەکان دەربارەی شارستانییەکی لەنێوچوو بکرێن؟ بڕوامان وایە دیدەکان بۆ سەرکەوتن لە ڕاڤەکردنی سیستەمی ئەخلاقی دوورن، وەلێ بەهیچ کلۆجێك بێ هیوا نین.

بڕوامان وایە بۆ ڕۆچوون لە سادەکردندا یەکەم هەنگاو دەبێت کردنەوەی گرێ کوێرەیەك بێت، کە دوو پەت دەگرێتەوە، پەتی سیستەمی تەکنیکی و سیستەمی ئەخلاقی.

لەکردنەوەی پەتی سیستەمی تەکنیکیدا، بۆ ئەوەی پەتی سیستەمی ئەخلاقیش بکەوێتە سەر پشت، پێویستمان بە هاوکاری زانا سروشتییەکان هەیە. شوێنەوارناس، بەکارکردن لەگەڵ ئەواندا، دەتوانێ فاکتەرە نەکێشەکانی هەنووکە دەربارەی ژینگەی کۆن و بەکارهێنانێکی سەرچاوە سروشتییەکانیشی لەلایەن شارستانییەکەوە، لە تێڕوانینی تایبەتیاندا دابنێت.

گرێکردنەوەکە تەنها بە شوێنەوارناسی وێناکراوی زیاتر لەوەی تا ئێستا هەمانبووە بەرەو پێش دەچێت.

زۆر پێویستیمان بە زانایانی سروشتی هەیە لە کاری مەیدانیدا لەگەڵماندا بن لەپێناو ورووژاندنی هاوبەشدا.

لە روونکردنەوەکانماندا دەربارەی پێڕۆی تەکنیکی بیر لەماوەی ئەو پیشە لەنێو چوانە دەکەینەوە، کە هەن.

بۆکردنی ئەمەش، پێویستە تیشك بخەینە سەر هەر بەرهەمێکی دەستکردی دەشێ بۆ هەر پیشەیەك بگۆڕێتەوە هەروا تیشك لە شوێنکەدا بخرێتە سەر ئەم بەرهەمە دەستکردانە، هەروا هەنگاو بەرەو لەبارتری و پۆلینکردنی سەرەتاییانەی پێویستی شوێنەوارناسان، کە تەنها لەسەر چەند لایەنێکی شکلّی وەك شێوە و مادەی خاو بنیادنراون، بنرێت.

یەکێك لە مەیدانخوازترین و بیر ورووژێنەرێنترین پۆل هەنووکە لە چەرمۆ –وە کۆکراوەتە لە چەند هەزار پەیکەرۆکەیەکی مرۆیی و ئاژەڵی و پارچەی پێوەند (وەك یەك) پێکدێت، کە لە هەمەچەشنەی فراوان دەردەکەون و بێگومانیش بەهەر یەك لە پێڕۆی ئەخلاقی و تەکنیکییەوە پێوەندییان هەیە.

لە میتۆدی تێگەیشتماندا لە پێڕۆی ئەخلاقی، بە مەبەستی ئەوەی ئامادەکارییەکانی رۆنانسازی ژیانی خێزان و لایەنە هاوبەشەکان و چالاکییەکانی ژیانی لادێ تەواوانەتر بکۆڵدرێنەوە، پێویستیمان بە دۆزینکاری گەلێك فراوانتر هەیە لە هەڵکۆڵینەکانماندا.

هەروەها لەم کایەدا بەزۆری پێویستیمان بە گەڕانەوە دەبێت بۆلای ئیتنۆلۆژیستەکان و مرۆڤ ناسە کۆمەڵایەتییەکان.

توێژینەوەکانی کەسانی هاوچەرخ، کە بەراوردکاری نزیکەیی ئاستەکانی شارستانییەت و ژینگە سروشتییەکانیان لەنێو خۆگرتووە، ڕەنگبێ زانیاری بەخشن.

چەند توێژینەوەیەك دەبێت زوو بکرێت، بۆ ئەو کەسانەی خێرا دەبنە ((هاوچەرخ)). تەنها شوێنەوارناسی شێوە کۆنی راهاتوو لە هەڵکۆڵینی گۆڕە شاهانەکان لە پێناو مۆزەخانەی هونەرە جوانەکاندا وێنا ناکەین، بەڵکو ((فیکرێکی شوێنەوارناسی)) بەفراوانی پرسە شارستانییە مێژووییەکانی بەر مەبەستە، کە تیایاندا شوێنەوارەکان بەبێ واتایی وەك کەرەستەیەك بۆ تێگەیشتن لە رێگەکانی مرۆڤایەتیدا بەکاردێن.

## دیمـــەنی کـــاری مـــەیدانی

ناوچەی جوگرافیایی ڕیزبەندی گەورەی چاندی — مێژوویی، کە لە ڕۆژئاوای ئاسیادا گەیشتە چاندی تەواو، ڕەنگبێ لە قادرمەیەکی گەورە و پلیکانەکانی بچێت بەرەو باشوور. لە ڕۆژئاوادا، قادرمەکان بەرەو جوودی، ئەنتی لوبنان و ئەوشاخانەی لوبنان بەرز دەبنەوە، کە دەریای نێوەڕاست سنوور دەدەن.

بەرەو باکوور و ڕۆژهەڵاتیش، قادرمەکان بەرەو زنجیرە باڵاکانی ئەنادۆڵ و فارس بەرز دەبنەوە. قادرمەکە وەك حەوزێك بۆ پیڕۆی ئاو دابەشکردنی پورات (فورات) و دیگلە (دیجلە) بەکاردێ.

ئەم دوو ڕووبارانە لە باکوور لە قادرمە باڵاکانەوە دێنەخوارێ و لەڕێڕەوێکی تارادەیەك تەریبدا بەنێو نزمترین خاڵی (Orchestra pit) فراوانی بیابانی (سوریا)دا دەڕۆن تاوەکو دەچنە وێستگەی ئەوپەڕی لای چەپ لەسەرووی کەنداوی فارسی لە باشووری میسۆپۆتامیای کلاسیکیدا.

میسر و فەلەستین بەلای باشووری ڕۆژئاوادا دەکەونە پشتی وێستگەی ئەوپەڕی لای ڕاستەوە.

لە وێستگەی نێوەڕاستدا بیابانی چۆڵەوانی عەرەبی سعوودی هەیە.

ئەم پێوەری وێناکردنە (analogy) کاتێك تێگەیشتنی شیاو دەبێ، کە یەکێك بڕوانێتە نەخشەیەکی ڕەخەکانی شاخی قادرمەکان، کە وەك پلێکانانێك دەڕۆن (بۆ نموونە. شێوەکانی ١ — ٢).

شاخەکان، بەتایبەتیش ڕەخەکانی ئەنادۆڵ و زاگرۆس لە باکوور و باکووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتدا لە یەك بە دواییەکیەکی ئەو زنجیرانەدا هەڵدەکەون، کە لە دەوری (orchestra pit)دا ریز دەبەستن.

لە باکووری لوبنان، لای کەناری سووریا و ڕۆژهەڵاتی کوپڕوس لێواری قادرمەکان نزمن و ئەم بەشە نزمەش بە زینی سووریا ((Syrian Saddle)) دەناسرێت.

لە ڕۆژهەڵاتی ناوچەی دەریای نێوەڕاستەوە بەنێو زینەکەدا باکانی بارانی زستانەیان هەڵگرتووە بەسەر کوپڕوسدا دێن.

شێی ئەم بایانە بەشێوەیەکی کردەیی بەدرێژایی تەواوی لێواری شاخەکانی قادرمەکە بەرەو باکوور و باکووری زینەکە ڕاست بە ڕاستی کەنداوی فارسی دەبارێت. (فیشەر، ١٩٥٢، نەخشەی ٢، Fishe, 1952, map, II). بە جوڵان بەرەو باکوور و باکووری ڕۆژهەڵات لە






مەڵبەندی Orchestra pit)کەوە بۆ لێواری شاخەکانی قادرمەکە، ئەوە بە سوودمەند دەزانین، کە پێنج ناوچە یان پێنج جۆری دیمەنی سروشتی و کەش و هەواو و نەشونماکردنی خۆراکەکان ناڤۆك بکەین (delineate).

خوارووترین ناوچە هێڵێکی لیتاوی نزیکە لە هەردوو ڕووباری پورات و دیگلە، کە دوو ڕووبارەکە بەرەو باشوور دەڕۆن.

لە خوارووی هێڵەکانی پانی بەغداد لیتە بەشێوەیەك بڵاو دەبێتەوە، کە هەموو باشووری میسۆپۆتامیا بگرێتەوە و بەشێوەیەکی نارێك و پێك لەدوای ڕووبارەکانی دەوروبەریدا بڵاو ببێتەوە.

دووەم ناوچە قەراجە (desert – steppe)[1] -ە، شان بەشانی نێوەڕاستی ڕێڕەوی هەردوو ڕووباری دیگلەو پورات درێژ دەبێتەوە.

ئەو بەشی قەراجە (desert – steppe)-ەی دەکەوێتە نێوان هەردوو ڕووبارەکانەوە بریتییە لە جەزیرە (نێوی عەرەبی ((میسۆپۆتامیا)) واتە" دوورگە) یان میسۆپۆتامیای باڵایە، هەروەها لەو دیو چوارچێوەی ڕووبارەکانیشدا دەشتی بیابانی زیاتر هەن.

چ ناوچە لیتەییەکان چ ناوچەی دەشتە بیابانییەکان بن، ئەوا بەرزاییان کەمەو بەرزی و نزمییەکی کەمی زەویشیان (relief) هەیە" کە کەمێك لە ئاوی باران هەڵدەگرن (واتە ئاستی بارانبارین تیایاندا نزمە).

ڕووبارەکان بەنێو ئەم ناوچانەدا پێچ و خولدەکەن (Meander)، بەتایبەتیش کاتێك دەگەنە دەشتی لیتەیی بەزۆری شوێنی ڕێڕەوەکانیان دەگۆڕن.

کشتوکاڵی کارای ڕاستەقینە لە دەشتی نیشتەییدا تەنها بەهۆی ئاودێرییەوە گونجاوە.

خاکی دەشتی بیابانی گەچی کەمە و قورسە و هەتا بە ئاودێریش بۆ کشتوکاڵ گونجاو نییە. لەسەرووی دەشتی بیابانی و ناوچە لیتەییەکان بەلای باکوور و ڕۆژهەڵاتدا ناوچەی بناری (piedmont) هەڵدەکەوێ، کە بەرزاییەکانی نزیکەی ٧٥٠-١،٢٥٠ پێیە لەسەر ئاستی ڕووی دەریادا.

---

(١) قەراج (desert – steppe): ڕەنگە دەقاودەق بەرامبەری وشە ئینگلیزییەکە بێت، چونکە ڕاقەی هەریەك لە وشە ئینگلیزییەکە و کوردییەکە گوزارشت لە یەك مەبەست دەکەن.

تێکرای بارانبارینی ساڵانەی ناوچەی بناری لە دەوری ١٢ – ٢٥ ئینچ دایە، هەروا بەرزی و نزمی زەویشی ئەوەیە چەند هەردەیەکی هەیە (rolling hills)** . ئەمە گژوگیای سروشتییە و رەنگبێ دانەوێڵەش لە ساڵانی بارانبارینی ئاساییدا بەبێ ئاودێری بڕوێت و گەشە بکات.

لقەکانی رووباری دیجلە بەنێو بنارەکە (piedmont)دا دێنە خوارێ تاوەکو بە رووبارە سەرەکییەکە دەگەن.

بەشێکی ناوچەی بناری (piedmont) لە نزیك بەیەکدیگەیشتنی دیگلە و زێی گەورەدا، نێو جەرگەی وڵاتی ئاشوور بووە. ناوچەی چوارەم گردە بنارییەکان و دۆڵی نێوان شاخەکان (intermontane) بە بەرزایی ١,٢٥٠ – ٣٠٠٠ لە ئاستی رووی دەریادا، دەگرێتەوە.

ئەم تایبەتمەندی ((رەخە گردەلانییەکانی خەرمانەی بەپیتە، کە تێکرای بارانبارینی ساڵانەی دەگاتە نزیکەی ٢٠ – ٣٠ ئینچ. چونکە پێکهاتەی بەردی رەخەکانی ((خەرمانە)) لە چەند پێچو لولێکی چڕدا هەڵدەکەوێ، ئەوا دۆڵە سەرەکییەکانی نێو شاخانـ (intermontane)ی نێوان ئەم زنجیرانە لە کوردستانی عیراقدا لە باکووری رۆژئاواوە بەرەو باشووری رۆژهەڵات دەڕۆن، بەڵام پێچ دەخۆنەوە تاوەکو لە رۆژئاواوە بەدرێژایی رەخەکانی تورکیا بەرەو رۆژهەڵات دەڕۆن.

ئەو رووبار و ئاوەڕۆیانەی، کە لە دۆڵی نێو شاخەکاندا دێنە خوارێ لە لێوارەکانی پێکهاتەی لاوازدا زنجیرەکانی خوارتر دەبڕن.

ئەم رەوشە لە کوردستانی عیراقدا لەو شوێنەدا باش رووندەبێتەوە، کە لقە گەورەکانی دیگلە (زێی گەورە، زێی بچووك و دیالە) زۆربەی ئاوەڕۆکانی دۆڵی نێو شاخان کۆ دەکەنەوە و خۆیان بەنەکان (successive ridges) بەرەو بنار دەبڕن، لە خواروترین لێواری کە تێیدا تێکەڵ بە دیگلە دەبن.

ناوچەی گردە بناری (foot hills) و دۆڵی نێوان شاخەکان (inter montane) لە بنکی دۆڵەکاندا گەلێك لەوەڕگای واڵای تێدایە و هێشتاش لەسەر گەلێك لەسەرسوێکانیدا ( inter vening ridges) داربەڕووی بچووك (تەڕاش) هەن.

ئەوە وڵاتێکی باشی دانەوێڵە و توتن و باخ و باخاتە. دواجار گەورەیی بەرزی شاخەکانی کورد و تورك دێت، کە لەسەر هێڵی دارستان بە بەرزی ١١,٠٠٠ پێ لە عیراقداو بەهەمان بەرزیش لە ئێران و تورکیادا بەرەو لوتکەکان بەرزدەبنەوە.

** هەردە (Rolling hills): شوێنێکی پڕ لە گرد و بەرزی و نزمییە.



هێندێك لەو بەرزاییە باڵایانە زیاتر لە چل (٤٠) ئینچ بارانی ساڵانەیان لێدەبارێت.

لەم بەرزاییانەدا هەردوو زێکە و دیالە و خودی رووباری دیجلەش دەبنە رووبارۆکەی شاخ، ئینجا کاتێك بەرەو ناوچەکانی خوارتر دێنە خوار لە رووبارە لقەکاندا کۆدەبنەوە.

ئەم وڵاتە بۆ کشتوکاڵی ئاسایی گەلێك سەختە، بەڵام ئێستاکە لەولا و لای گردەکاندا دانەوێڵە و توتن دەڕوێندرێن، ترێ دەچێندرێت و گیانەوەرانیش بەشێوەی مێگەل دەلەوەڕێندرێن.

هێژ هێندێك رووەکی خۆڕسك (Virgin Timber)-ی وەك بەڕوو (oak)، نەوژە (pine)*** و هەورس (Juniper)****-ی لێبەدیدەکرێت. لەراستیدا تایبەتمەندییەکانی هەر پێنج ناوچەی لیتەیی (alluvium)، قەراج (desert – steppe)، بناری، گردە بنارییەکان، دۆڵی نێوان شاخەکان و شاخە بەرزەکان بەڕوونتر لە کەوانەکانی قادرمەی باکوور (تورکیا) و باکووری رۆژهەڵات (کوردستانی عیراق)دا پێناسدەکرێن. بەشی تورکی فراوانە و هەموو ناوچەکانیشی دیارن، بەڵام ئەوەندە هەیە دوو ناوچەکانی ئەوپەڕی خواروو باش دەردەکەون.

هەروەها رووبەری کوردستانی عیراق لە چەند قەبارەیەکدا دەوردراوە، کە چەند درێژ بوونەوەیەکی پەنجەیی (fingerings) بەنێو چەند راڕەوێکی خوارووتردا لە زاگرۆسی باڵادا بەرەو نێو باکووری ئێران لە هەرێمی گۆمی ورمێدا هەن.

لە خوزستانی فارسیدا، لێژاییەکە بەرەو باشووری رۆژهەڵات هەڵدێرترە، بناریش (piedmont) فراوانی کەمترە و بەڕوونیش دیاریدەکرێت، هەروا دۆڵی نێوان شاخەکانی نێوەندی بازنەکانی پانی فراوانیان کەمترە.

لە رۆژئاواشدا، پیرۆی پێنج ناوچە کە وا دەردەکەوێ، کە هێژ زیاتر دابەشبێت. جۆری ئاو و هەوای بەشی رۆژئاوای قادرمەکە لە جۆری ئاو و هەوای باکوور و باکووری رۆژهەڵاتی قادرمە کە جیاوازە.

بنارەکە فراوانە، بەڵام بەشێکی زۆری بنارەکە بەهۆی بەرزاییەکانی لوبنانەوە لە بارانەکانی دەریای نێوەڕاست بێبەشدەبێت. (بڕوانە شێوە ٢).

*** نەوژە (pine): لە زۆر نووسیندا سنۆبەر بە (کاژ) کراوەتە کوردی بەڵام راستیەکەی (نەوژە)یە.

**** هەورس (juniper): هەوریس: عەرعەر.

هەروەك لەسەرەوە تێبینی کرا، باو و بارانەکان لەرێگەی زینی سوریا (Syrian Saddle)-ەوە کەوانەکانـ (arc)ی تورکی و کوردی قادرمەکە ئاودێر دەکەن، بەڵام رێڕەوی باو و بارانەکان بەرەو باشوور ناگەڕێتەوە تاوەکو رەخی نێوەوەی ئەنتی لوبنان ئاودێر بکات.

ئەلیپۆ لەزینی سوریاداو مووسڵ لەسەر دیگلە هەمان دایە گرامی کەش و هەوای وەك یەك (واتە: جۆری بارانبارینی ساڵانە و پلەی گەرما)-یان هەیە.

کاریگەری سێبەرە بارانی بەربەستی شاخی لوبنان و ئەنتی لوبنان کاتێك بە باشی روونەبێتەوە، کە یەکێك جیاوازییەکانی نێوان دیمەشق و هەولێر تێبینی بکات.

هەرچەندە دیمەشق لە بەشی داپۆشراوی بناری سووریا — شاخدا — دەکەوێتە بەرزی ٢,٢٥٠ پێ، بەڵام ساڵانە تەنها (٩) ئینچ بارانی لێدەبارێت" لەبەرئەوە باخچەکانی پشت بە ئاوی جۆگاکانی شاخی لە ئەنتی لوبنانەوە دێن دەبەستن.

هەولێر، لە بەرزترین بەشی بناری کوردستانی عیراقدا، تەنها دەکەوێتە بەرزی ١,٣٥٠ پێ، بەڵام دەوری ١٧ ئینچ بارانی ساڵانەی لێدەبارێت.

بێگومان جیاوازییەکەش ئەوەیە، کە هەولێر لەنێو باو رێڕەوی باران دایە، لە کاتێکدا دیمەشق وانییە.

خاکی کەناری پشتی لێواری رۆژئاوای قادرمەکە بە ئاراستەی دەریا بەرەو دەرەوە دەڕوات، جۆرە کەش و هەواو نەشونماکردنێکی رووەکەکانی هەیە، کە بەشێوەیەکی سەرەکی لە جۆری دەریای ناوەڕاستن.

هەروەها هیچ شتێك لە باشووری شارۆچکەی تریپۆلی و زینی سوریادا ناکەوێتە دەرەوەی سکێمی (Scheme) کەش و هەوای قادرمەکەوە — بەشێوەیەکی سەرەکیش ناوچەی کەناری (littoral) لوبنان و فەلەستین. لەڕاستیدا بەدرێژایی ناوچە کەنارییەکانی رۆژهەڵات، رەنگبێ کورتە درێژبوونەوەکانی کەش و هەواو ژینگەکان لەسەر رووی شاخەکاندا یاخود لە دۆڵی نێوان شاخەکاندا بە جۆراوجۆرییەکی زۆر، کاتێك یەکێك لە هێڵەکانی پانیدا بەرەو سەر بڕوات یان لە دەریاوە بگەڕێتەوە، دەدۆزرێنەوە.

ئەم رەوشەش بەدرێژایی ناوچەی کەناری سنوور و رەخەکانی گردی جودی فەلەستین رەنگدەداتەوە.

زینوویەکی بچووك (Small Saddle) هەیە، کە نێوانی شاخی هەرمۆن و شاخی کەرمل دەکاتەوە و بواریش دەدات بارانەکان بەدرێژایی تەلانە باڵاکانی رۆژئاوای بەرزاییەکانی ئەودیو ئەردەن تێبخزێن. تەلانەکانی رۆژهەڵاتی رەخەکانی جودی و حەوزی دەریای مردوو-ش زۆر





وشك دەبنەوە. بەزۆری ئەو گەواهییانەمان لە کوردستاندا، کە بە سەرەتاکانی گواستنەوە بۆ کۆمەڵی لادێی جووتیاری جێگیرەوە پێوەندن، ئەوە پێشنیاز دەکەن، کە هێڵی گردە بنارییەکان و دۆڵی نێوان شاخەکان «رەخە گردەلانییەکانی کەوانەی بە پیت» ناوچەیەکی گەلێك گرنگبووە.

ئەو گەواهیانەی هەنووکە هەمانن ئاماژە بەوە دەدەن، کە ناوچەی بناری (piedmont) رەنگبێ کەمێك دواتر هەستی بە کاریگەرییەکانی قۆناغی گواستنەوە کردبێت، لەگەڵ ئەوەشدا رەنگبێ چەند «بڵاو بوونەوەیەك» لە دۆڵی نێوان شاخەکانەوە (inter montane) بەرەو بنار لە رێژگەکانی (embouchures) پیرۆ گەورەترەکانی دابەشکردنی ئاودا هەبووبن[1]. تەنها کات و لێکۆڵینەوەی گەلێك زیاتر پێمان دەڵێن ئاخۆ ئەو وێنەیەی بۆ تەواوی ناوچەی رەخە گردەلانییەکان دەیکێشن راستە.

بەداخەوە، هێژ بەشێوەیەکی کردەیی هیچ شتێك دەربارەی مێژوویی شارستانی کۆنی ناوچەی گردە بنارییەکان و دۆڵی نێوان شاخەکان لە بەشەکانی ئێرانی، سووری و تورکی کەوانەکە نازانین.

رەنگبێ کەسێك گریمانبکات، کە پەرەسەندنە کۆنەکان لەوێدا خێرا بەرەو بنار داکشاون. رەنگبێ بەهۆی سەختی سروشتی دیمەنی خۆڕسکییەوە، ناوچەی لێواری باڵای شاخەکە لە تەواوی دەوروبەری قادرمەکە هەرگیز گرنگییەکی گەورەی نەبوو بێت.

هەرچەندە ئادەمز (Adams) ١٩٦٠ پێشنیاری ئەوە دەکات، کە ئەو خۆراك — کۆکەرەوانەی لە ژیانی رووباری (واتە کەناری رووبارەکان) خۆیان گونجاند رەنگبێ لە خوارووی میسۆپۆتامیادا پەرەیان سەندبێت، بەڵام بەڵگەی تەواوی شوێنەواری و ئیکۆلۆژیش هەن تاوەکو ئەگەری ئەوە ببڕنەوە، کە (قۆناغی) گواستنەوە دەبێت لە خوارووی قەراج ( desert – steppe) یان ناوچەی لیتەییدا روویدا بێت.

(١) شوێنی مەلفەعات لەسەر رووباری خازر دەکەوێتە والاّییەکەوە لەبەردەم بناردا. دکتۆر ستورات هاریس و (Dr. Stuart Haris) و. Of the Hunting Technical Services, Ltd بەڵگەکانی سەر رووی زەوی لەگردە بچووکە جیاوازەکانی نزیك دەمی (embouchure) تۆمچە کۆکردەوە، کە ٥٠ میلێك لە باشووری کەرکووکەوەیە. لە دەرئەنجامی تاقیکردنەوەی بەردەستێکانی (flint) هەردوو ئەو ناوچەیەی هاریس لێی کۆکردبوونەوە، لیندا بریدوود و هاو ئەو بەردەستێیانەیان بەهاوڕێکی هەمان پیشەکاری بنچینەیی بەردەستێی وەك ئەوانەی شوێنی چەرمۆ دانا.

لە بەشی یەکەمدا پێشنیاری ئەوەمانکرد، کە رەخە گردەلانییەکانی کەوانی بە پیت ناوچەیەکی کرۆك ((nuclear area)) دروستدەکەن — ناوچەیەك، کە تێیدا کۆمەڵێکی شاراوانەی گیانەوەران و رووەکی شیاوی ماڵیکردنی سازبوو، هەروا لە سروشتدا چاوەڕوانی دەکرد.

ئەم رەوشەش تا ئەو رادەیەی هەنووکە بەڵگەمان هەیە ناڤۆکی بکەین، لە ناوچەکەمان (واتە) ناوچەی گردە بنارییەکان و دۆڵی نێوان شاخەکاندا روویداوە.

لە بیرەکانماندا کەمێك گومان هەیە، کە ناوچەی کرۆك (nuclear area) لە دەرکەوتنی کۆمەڵی لادێی جووتیاری لە رۆژهەڵاتی نزیك یان رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا — وەك گریمانێکی کردەیی ماقووڵ — دەتوانرێت ئێستاکە لەگەڵ ئەم ناوچەیەدا هاوڕێك بکرێت.

درێژبوونەوەیەکی گریمانەکە پێدەچێ ئەو بەشە گرنگەی ناوچەکە بێت، کە دەکەوێتە بەرزاییەکانی دەوری ١,٢٥٠ — ٣,٠٠٠ پێ، دواجار وەك ئێستاکە، ئەوا ٢٠ یان ٢٠ ئینچ زیاتر بارانی ساڵانەی لێدەبارێت.

کوردستانی عیراق یەکێکە لەو رووبەرە جوگرافییە نمونەییانەی، کە پێویستە زۆر تەواوانەتر بکۆڵدرێتەوە بۆ ئەوەی بتوانرێ گریمانی کارا و درێژ بوونەوەکەشی بخرێنە ژێر تاقیکردنەوەوە. بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا، شەقڵی گەورەی تاقیکردنەوەی ژینگەیەك بۆ دۆزینەوەی ئەو پلەیەیە، کە رەوشی شیاوی سەرنجی ئەمرۆکە (تا چەند) لەو رەوشە دەچێت یاخود لەو رەوشە جیاوازە، کە هەشت هەزار یاخود دە هەزار ساڵێك بەر لە ئێستا روویداوە.

ئایا ناوچەکە دواجار لەڕووی سروشتەوە بەشێوەیەکی شاراوە رووەك و گیانەوەری شیاوی ماڵیکردنی دەگرتەوە، وەك ئێستاکە دەکرێت؟

ئینجا دەبینین، کە بەڵگە فەراهەکان گەلێك زیاتر وێکچوون پێشنیار دەکەن نەوەکا جیاوازی.

رەنگبێ ئێستاکە ناڤۆکێکی کەمێك دوور و درێژتر لەبارەی کوردستانی عیراقەوە بکەین (بڕوانە شێوەکانی ٢ — ٤).

کاتێك یەکێك لە سووریاوە بەرەو عیراق بەدرێژای رێگەی هێڵە بۆری کۆمپانیای نەوت، بیابان دەبڕێت و لەبیرە نەوتەکانی کەرکووکەوە بەرەو رۆژهەڵات بۆ سنووری ئێران لە پشتی سلێمانیدا بەردەوام دەبێت، هەروەك دەستەی نێردەکە لە دەستپێکی بەهاری ساڵی ١٩٥٥- دا کردیان، ئەوا هەریەك لە پێنج ناوچەی قادرمەکەمان دەبڕێت.



ولاتی قەراجی (desert – steppe)-ی سووریا (واتە) جەزیرەی بالا، جگە لەو شوێنەی رێڕەوی هێڵە بۆرییەکان (pipe – line road) دیگلە و پوڕات دەبڕێت، زۆر بەکەمی خەڵکی تێدا نیشتەجێ دەبێت و دانیشتوانیشی تەنها عەرەبە بەدوە کۆچەرییەکان و مێگەل و وشترەکانیانن.

بەدرێژای خوارووترین سەکۆی لیتەیی (alluvial terrace) (واتە «چینە قوڕی») رووبارەکان باخچە و هێندێك داری خورما بەدیدەکرێن. بۆ چەند حەفتەیەکی کەم دوای بارانەکان خودی بیابانەکە سەوزە، بەتایبەتیش بەدرێژایی رووباری کاتیی وەك ئەوەی دۆڵی سەرسار (pl. 2A)، کە لە جەبەل شەنگارەوە لەنێوان دیگلە و پوڕاتەوە بەرەو باشووری دەڕوات.

دوای سەرکەوتن لە رووباری دیگلە و دوو سەعاتێك رۆیشتن بە ئاڕاستەی باکووری رۆژهەڵات بەرەو کەرکووك، یەکێك ئەوە بەدیدەکات، کە ولاتی دەشتە بیابانی بێ دار و بار، (قەراج) (desert – steppe) بەرە بەرە بەکەمتر لە ٢٠ میل لە شاری کەرکووکەوە بەرەو ناوچەی بنار (piedmont) رێگە دەگرێتەبەر.

لێواری ناوچەی بناری (piedmont)، کە لەگەڵ هێڵی دەوری ١٢ ئینچ بارانی ساڵانە —دا هاوڕێکە، بەرەو رۆژئاوا لەلای کەرکووکدا زیاتر لە گردە بنارییەکان (foot hills) نزیکدەبێتەوە. ناوچەکە بەرەو باکووری رۆژهەڵات تەسکتر دەبێتەوە، بەڵام لە باکووری رۆژئاوای کەرکووکدا ناوچەکە بەنێو دەشتی فراوانتری ئاشووریدا درێژدەبێتەوە، بەتایبەتیش لەو شوێنەی سنووری رۆژئاوایی دەکەوێتە رۆژئاوای رووباری دیگلە لەنزیکی مووسڵدا — کەرکووك دەکەوێتە بەرزی دەوری ١,١٠٠ پێ و نزیکەی ١٢ ئینچ بارانی ساڵانەی لێدەبارێت" کاتێك ناوچەی بنار لە باشووری رۆژهەڵاتی کەرکووکدا بەرەو نەمان دەچێت کشتوکاڵی دێمی ( rainfall agriculture) بەزۆری دەبێتە کشتوکاڵێکی خۆوبەخت (precarious) ئێستاکە بنار لەڕووی کشتوکاڵەوە ناوچەیەکی بگوێزراوەیە (transitional zone)، کە دانیشتوانێکی هەیە لە عەرەب و کورد و تورکومان و ئاینزا (Sect) مەسیحییە بچووکە جودا جوداکان پێکهاتووە.

کوردەکان لەو شوێنەی، کە بنار لەناوچەی گردە بنارییەکان نزیکدەبێتەوە باو دەسێنن. دیمەنی سروشتی (Landscape) دەوروبەری شاری هەولێر، کە دوو سەعات بەسەیارە (سەیارەی ساڵی شەستەکان (ئاسۆس) لە باکوری کەرکووکەیەوە، لەڕاستیدا زیاتر ولاتی بناری دەشتی ئاشوور دەنوێنێت.





هەولێر، کە کرۆکی ناوەندی لەسەر سەری گردێکی کۆندایە (PIS. IA, 2B) و بەرزییەکەشی ١,٣٥٠ پێیەو بارانبارینیشی ١٧ ئینچە، دەروازەیەکی گەورەیە بۆ نێو کوردستانی عیراق و بازاڕێکی باشیشە.

ژمارەیەکی زۆری شارۆچکەی بچووکتر و گوندی ناوچەی بناری دەکەونە دەوروبەری هەولێرەوە، کە گردی بالاّ و شاخیان تێدایە، کە تەواو بەسەر ئاسۆکانی باکوور و رۆژهەلاّتدا دەڕوانن.

بنار بۆ تەختە ولاّتێکی دەشتی سەوز (لەوەڕگا) و خاکە بەپیتە لیتەبییەکەی غلۆر دەبێتەوە، کە لە ماوەی بارانەکانی زستانەوە تاوەکو مانگی مایۆ بەشێوەیەکی جوان سەوزە و لە مانگی تەموزیشدا کاتێك وەرزی درەو نزیکدەبێتەوە زەرد هەلّدەگەڕێ (turning to bronze) کەمێك دار و درەخت هەن، نەشونماکردنی رووەکەکانیش لە هاوین و پایزدا لە قاوەییەوەییەکی تۆخەوە بۆ رەنگێکی نارنجی تێر دەگۆڕێت. گوندەکانی بکەونە نزیك کانیاوەکان یان بەدرێژایی دۆلّەکانەوە، ئەو کانیاوانە بەکاردەهێنن، کە کەمێکیان بەدرێژایی سالّ ئاویان لێدەڕوات، لەگەلّ ئەوەشدا ئەو گوندانە ئاوگە (pool) بۆ مەبەستی تایبەت یاخود لەبیری کەم قوولّدا ئاوی ژێرزەوی (Subsurface) دەردەهێنن.

لانی کەم کوێخای گوندەکە ئاو بارەیەك (water carried) یان جۆگەیەکی ئاوی بۆ باخە بچووکەکەی لە پیاز و تەماتە و دار قەیسی هەیە.

لە ئاخیر و ئۆخری هاوین و پایزدا کەمە چالاکییەکی کشتوکالّی هەیە، هەروا بزن و مەڕ لەسەر قەسەلّی (Stubble) گەنم و جۆی کێلّگەکاندا دەلەوەڕێندرێن.

گردەکان راستەوخۆ دەکەونە پشتی کەرکووك و چەند میلێکیش لە رۆژهەلاّتی هەولێردا.

خواروترینی گردەکان، گردی زوورگاوین (gravel)، پاشان زنجیرەی بەردە لماوییەکان، کە رەنگبێ بەزۆری چەوین، ئینجا لە کۆتاییدا زنجیرەی شاخە کلسییە بالاّکان، دێن.

تەوەرەی زنجیرەکان لە باکووری رۆژئاواوە بۆ باشووری رۆژهەلاّتە" لەنێوان زنجیرەکانیشدا دۆلّە بە پیتەکانی توێژینەوەکەمان هەلّدەکەون.

پێڕۆی چالاکتری ئاوەڕۆکانی ئەم دۆلاّنە بەنێو ئەم زنجیرانەدا دێن و هەلّگرتووەکانیشیان بەرەو بنار دەهێنن و بگرە بۆنێو هەردوو زێکان و دیالەش، بەلّکو بۆنێو دیگلەش هەلّگرتووەکانیان دەهێنن.

ئەمەش بریتییە لە ولاّتی گردە بناری (foot hill) و نێوان شاخەکان (inter montane). دانیشتوانیشی بەزۆری لە کوردەکان پێکدێن، کە لە شارۆچکە و لادێکاندا دەژین" تەنها



سلێمانی نەبێت، کە سێ سەعات بە سەیارە دەکەوێتە رۆژهەلاّتی کەرکووك، لە قەبارەی شارێکی بچووك نزیك دەبێتەوە، کە ژمارەی دانیشتوانی ٢٥,٠٠٠ هەزار کەسە [ ].
گوندەکان دەکەونە نزیك کانیاوەکان یاخود جۆگاکانەوە، کە بە زۆری بەدرێژایی سالّ بەردەوامن، لە بەرزاییەکاندا و تایبەتمەندی بارانبارینی ئەم ناوچەیەشیان هەیە.

بە درێژایی رووبارەکان داری ژالّە (Oleander) و تەڕاش (داری بچووك هێندێك جاریش داری نەبڕاو (protected) و دەوەنە داری گەلێك بەرزیش هەن (PI. 3A).

زنجیرە کلسییە بەرزەکانیش تەڕاشی بەڕوو (Scrub oak)-یان هەیە.

ئەم ولاّتە گەلێك لە ناوچەی بنار (piedmont) بە رەنگ و رووترە.

سەوزی کێلّگە و لەوەڕگاکانی ئەم ولاّتە بە پێچەوانەی رەنگەکانی بەردە لم (Sand Stone) و تەمۆخ (Shale) و بەردە کلسییەکانی ئەو زنجیرانەی، کە دەوری دۆلّەکانی ئەم ولاّتە دەدەن، لە هاوینیش بەولاتر بەشێوەیەکی زۆر زیندەگی بەردەوام دەبێت. گولّەکانی بەهاری جوان زۆرن و بەرهەمەکانی وەك گەنم و جۆ و نیسك بەشێوەیەکی گشتی گەشە دەکەن.

هێندێك تاو لە سالّی کەم بارانیـ (lean rainfall)دا لە ناوچەی بناردا بەروبوومەکان لە دەستدەدرێن، بەلاّم ئەم رەوشە لە ناوچەی گردە بنارییەکان و دۆلّی نێوان شاخەکاندا ( inter montane) دەگمەنە.

ران و مێگەلە مەڕەکان لە دۆلّەکان بەرزتر یان بەدرێژایی رەخی شێوەکان یان تاوەکو درەو دەکرێ لەسەر پەرێزە خاك (Fallow land)دا دەلەوەڕێندرێن.

لە هەرێمی سلێمانیدا توتنی باش و هێندێك برنج دەڕوێندرێت" کێلّگەی ئەزموونی میری لە بەکرەجۆ و کێلّگەی شێخ بابە عەلیدا میوەجات و مێو و تووی فەرەنگی سەرکەوتوو بەرهەمدەهێنن.

گوند نشینەکان ئاوی جۆگە لە (Smaller Stream) و کانیاوەکان بۆ باغی سەوزە و میوە بەکاردەهێنن" بەلاّم بێگومان ناوچەکە کشتوکالّی ئاودێری (سیستمازەکراوی) تێدانییە.

هەروەك باسکرا، ئەم ناوچەیە دەکەوێتە بەرزی نزیکەی ١,٢٥٠ — ٣,٠٠٠ پێوە، هەروا تێکڕای بارانبارینی سالانەشی لە دەوری ٢٠ — ٣٠ ئینچ دایە.





ماوەتەوە بگوترێت، کە کشتوکاڵ لەم ناوچەیەدا بەزۆری لە دۆڵەکاندا قەتیس دەبێت و دووبارەش تێبینی بکرێت، کە لقی حەوزە گەورەکان بوار بە نزمایییەکانی بنار دەدەن لە گردە بنارییەکاندا بە بنار بگەن و بەپێچەوانەشەوە لە گردە بنارییەکانەوە بەرەو زەوییە نزمەکان برۆن (provide egress).

هەرچۆنێك بێت لە راستیدا ئەم درێژبوونەوانەی دۆڵە نزم و فراوانەکانی بنار بەگشتی نزیکەی هەمان ئەو برە بارانی لێدەبارێت، کە لە ناوچەی گردە بنارییەکان دەبارێت.

هەروەها دەشتی دۆڵەکانی دیانە — رەواندوز، رانییە — دوکان و هەڵبجە، کە تایبەتمەندی دۆڵی نێوان شاخەکان (inter montane)یان هەیە، دەکەونە رۆژهەڵاتی ئەو زنجیرە بەرزانەوە، کە کتومت دەچنەوە سەر بەرزایی ناوچە شاخاوییەکان.

ئەوە نەخشەیەکی گەورە و دوور و درێژی دەوێ (CF. Davies, 1957)، بۆئەوەی بەوردی ناوچەی گردە بنارییەکان و دۆڵی نێوان شاخەکان وێنە بکات.

خاکە بەکەڵکە باشەکەشی بۆ کشتوکاڵ لە هیچ شوێنێکدا لەڕووی رووبەرەوە وەك خاکی بنار (piedmont) زۆر گەورە نییە و ناوچەکەش بۆ دەشتە دۆڵـ(Valley plains)ی جیاواز کەرتدەبێت.

ناوچەکە لەڕووی سروشتییەوە (Physically) هەرێمکی زەحمەت چوونە نێوی یان سەخت نییە بۆ پێوەندی و گەیاندن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئامانجی ئارەزووبازانەی چەند تیرەیەکی دیاریکراوی کورد بۆ باندی رێگری لە ئاخیر و ئۆخرەکانی سەردەمی عوسمانیدا نێو بانگێکی کەم و ترسناکی بە ناوچەکە بەخشیوە.

بەرزاییە تەواوەکانی وڵاتی کوردەواری، لەو زنجیرە چیایانەی زاگروسدا، کە دەوری سنووری ئێرانی دەدەن و دەکەونە بەرزی ۳,۰۰۰ پێوە، چەند ناوچەیەکی زۆر سەرنجراکێش لەنێو خۆ دەگرن[۲].

لە باکووری ئەم وڵاتەدا بەڕوو و کاژ بەرە و هێڵی دارەکان بلاّودەبنەوە، هەروا مێرگی کراوەی راوەشی هەیە.

---

(۲) لەماوەی ئەم ساڵانەی دوایدا، گەلێك تێڕوانین لەبارەی ئەم وڵاتەوە لە چەشنی روونکردنەوەی سەرکەوتوودا لە بلاّوکراوەکانی (Iraq petroleum)دا بلاّوکراوەتەوە،

The magazine of The Iraq petroleum Company, Ltd., London.





بەفر تاوەکو مانگی مایس لەسەر لوتکە باڵاکاندا دەمێنێتەوە ئاوەڕۆکانیش، کە زۆربەیان کاراکتەری لێشاو (torrents)ەکانی شاخن هەمیشە بەدرێژایی ساڵ (perennial) بەردەوامن.

ئەمەش بۆ گشت ئامانج و مەبەستەکانی وڵاتی کوردەواری تەواوە.

گوندەکان گەورە نین و رۆنانسازیشیان لەوەدا لە خانووە دیوار قوڕەکانی بنار (piedmont) و دۆڵە نزمەکان جیاوازە، کە خانوی سەربان داپۆشراوی دیواری بەرد لەولاولای گردەکاندا بۆ نیشتەجێبوون بەکاردەهێنرێن (PI . 3b). هێژ دوو تیرە کۆچەرین و لەسەرەتای ئاو و هەوای سارد دا هەواری هاوینانیان لە بەرزاییەکاندا لە بەرەکەی تری سنووری عیراقی — ئێرانیدا بەجێ دەهێڵن و بەرەو دۆڵە نزمەکان یاخود بنار بۆ وەرزی زستان کۆچی بە کۆمەڵ دەکەن.

دەستەی نێردەکەمان لە ماوەی کاتی هەڵکۆڵینە ئەزمونییەکان لە دەشتی دیانەدا لەسەرەتای کانوونی یەکەمی ۱۹٥٤دا بە چەند جوولەیەکی هۆزی هەکاری گەیشت.

ناوچە بەرزاییەکان لەڕووی دانیشتوانەوە چڕنین.

زووربەی گوندنشینەکانیش سەرتانسەری ساڵ دەمێننەوە.

ئەو گوندنشینانە بەرهەمی کێڵگەی تەواو بۆ هەڵگرتنی خۆیان دەڕوێنن، کە باخچە و رەزی میوەو باخی بچووك بەکاردەهێنن و داربڕین و سوتاندنی خەلووزیش پیادە دەکەن. گوتمان، کە مرۆڤ لەزستاندا هێندێك راو دەکات. ناوچە بەرزاییەکان بە دیمەنە دڵڕفێنەکانیانەوە وڵاتێکی هەڤۆك لە هەستی فیزیکیدا دروستدەکات، هەروا سەرسوڕهێن نییە، کە ناوچە بەرزەکان لەسەردەمەکانی پێش مێژوودا یان سەردەمە کۆنە مێژووییەکاندا شوێنەواری کەمی نیشتەجێبوونی مرۆڤ پیشانبدەن.

بەم دواییانە جوگرافیناسی جودا جودا خۆیان بە عیراقەوە خەریککرد (بۆ نموونە: بۆیش، ۱۹۳۹ "Boesch" داڤیز، ۱۹٥۷ "Davies" دوڤوما، ۱۹٥٥ "De vaumas" فیشەر، ۱۹٥۲ "Fisher" کێلەرسۆن، ۱۹٥۳ "Keler Sohn" نۆمان، ۱۹٥۳ Neumann)، کە بەشێوەیەکی گشتی لە کوردستانی عیراقدا ناوچەی گردە بنارییەکان و دۆڵی نێوان شاخەکانیان ( inter montane) لە یەکتری جیانەکردۆتەوە.

ئەوان ناوچەی گردە بنارییەکانمان بۆ پۆلینی ناوچەی بناری و شاخی باڵا دابەشدەکەن. بەسەرنج راکێشانەوە تێبینی ئەوە دەکەین، کە لیچ (Leach) ۱۹٤۰، کە یەکێکە لە ئیتنولۆژە کەم پیشەکارەکان لە ناوچەکەدا کاریکردووە — بەشێوەیەکی سەربەخۆ وەك ئەوەی ((هەریەك لە

گرنگی جوگرافی و ئیتنۆلۆژی هەبێت)) گەیشتۆتە پۆلینی ناوچەکەمان. بەپێی زاراوەی فاکتەرە کتومتەکانی وەك بەرزایی، ئەوا رەنگبێ ناوچەکانمان کەمێك وێك سازنەبن. بۆ نموونە تێکرای گشتی ئەوپەڕی بەرزی لە بنار (piedmont)دا ١,٢٥٠ پێیە لەسەر ئاستی رووی دەریادا، بەلاّم هەولێر — لەبەرزی ١,٣٥٠ پێدایە و — بەدڵنیایشەوە لەڕووی لایەنەکانی بەرزی و نزمی (Topo Graphy) و ئاو و هەوا و گەشەکردنی رووەکەکانەوە، بنارە (piedmont).

هەڵبجەش چ جای ئەوەی بەڕوون و ئاشکراییەوە دەکەوێتە دەشتێکی نێوان شاخانەوە ( inter montane)، بەلاّم نزیکەی ٤٠ ئینج بارانی سالاّنەی لێدەبارێت، هەرچەندە تێکڕای بارانی ناوچەی گردە بنارییەکان و دۆڵی نێوان شاخەکانمان (inter montane) ٢٠ — ٣٠ ئینچە.

سەرباری ئەوەش دابەشکارییەکانمان بۆ پێنج ناوچە رەنگبێ تاڕادەیەك (impressionistic) بێت و کەمێکیش لەوەی جوگرافیناسەکان دروستتر بێت، پێمان وایە ئەو دابەشکارییە باشتر بۆ ئەو دەنگوباسە بەکاردێت، کە دەیگێڕینەوە.

چالاکییەکانی دەستەی پرۆژەی چەرمۆ — عیراق لەهەریەك لە ناوچەکانی گردە بنارییەکان و دۆڵی نێوان شاخەکان و لێوارەکانی سەرووی ناوچەی بنار چڕبوونەوە، چونکە باوەڕمان وایە، کە بەشێکی زووینەی گرنگ لە درامای گەورەی سەرهەڵدانی شارستانییەت لە قادرمەی رۆژئاوای ئاسیا، بەلایەنی کەمیشەوە تاڕادەیەك، لە پلیکانەکانی کوردستانی عیراقدا پێشکەشکراوە.

دواتر، پێشکەشکردنەکە بۆ بەشێکی نوێ لەلای چەپی لیتە دەشتی رووباری باشووری میسۆپۆتامیای کلاسیکی گوێزراوەتەوە.

# پێشکەوتنی چالاکییە دیتنکارییەکانی پرۆژەی چەرمۆ – عیراق

یەکەم هەڵکۆڵینی دوای جەنگی جیهانی دووەمی ئینستیتیوتی ڕۆژهەڵاتی لە ڕۆژئاوای ئاسیادا پرۆژەی چەرمۆ – عیراق ئەنجامیدا، کە یەکەم جار پێی دەگوترا «پرۆژەی عیراقی نێردەی سووری».

دەستەی نێردەکە لە ڕۆبەرت. جێی و لیندا بریدوود و چارلۆت ئۆتن وەك بەشی ئەنترۆپۆلۆژی گرانتی و دکتۆر فەرەج بەسمەچی وەك نوێنەری بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری عیراقی پێکهات.

هەردوو بریدوودەکە هێشتا ئەندامی دەستەی نێردەی سووری پێش جەنگبوون و لەراستیشدا نێردەکە یەکەم پێشنیاری ئەوەی کرد، کە کار بۆ هەردوو بریدوودەکە لە باکووری سووریادا دەستپێبکاتەوە، کە هەردووکیان ڕاهاتووترین کەسانێك بوون لەگەڵ گوندی شوێنەواری کۆنی ئەم ناوچەیەدا.

بەلاّم حکوومەتی نوێی سەربەخۆی سووریا هێشتا لە ساڵی ١٩٧٤دا سێرڤسی شوێنەواری خۆی بەتەواوی ڕێکنەخستبوو ئامادەش نەبوو پێشوازی تیپەکانی دیتنکاری دەرەکی بکات.

پرۆڤیسۆ تۆرکیلد جاکۆبسن (Thorkild Jacobsen)ی بەڕێوەبەری ئینستیتیوتەکە لەوکاتدا پێشنیاریکرد، کە چالاکییەکانمان بەرەو عیراق دەگوازینەوە.

بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری حکوومەتی عیراق بە تەواوی ئامادەبوو هەڵکۆڵەرە بیانییەکان قبووڵبکات، چۆنایەتی بالاّشی چ لە هەبوونی گرنگییە زانستییەکانی چ لە هاوکاریکردنی هەڵکۆڵەرە دەرەکییەکاندا نێودارببوو.

هەردوو ئەندامەکانی (بەڕێوەبەرایەتی) بەڕێز تەها باقیر و بەڕێز فوئاد سەفەر پلەی بالاّیان لە ئینستیتیوتی ڕۆژهەڵاتی وەرگرتبوو، دوا ڕاوێژکاریشی مستەر سیتون لیود بوو بە ئەندامێکی نێردەی ئینستیتیوتی ڕۆژهەڵاتی ساڵی ١٩٣٠ – ٣٦ عیراق.

لە بەهاری ساڵی ١٩٤٧دا، دەربارەی مەبەست و زنجیرەی کارەکانمانەوە بۆ هاوڕێکمان نووسی لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری عیراقدا، کە بناری بالاّ (higher piedmont) و ولاّتی






ڕەخە گردەلاّنیەکانی باکووری ڕۆژئاوای مووسڵ لە حەوزی ڕووباری دیگلەدا وەك شوێنێکی گشتی بۆ چالاکییەکانمان پێشنیارکرا. وەلاّمی بەڕێوەبەرایەتی گەلێك گەرموگوڕ بوو. هەروا لیستی پەنجا شوینێکی بۆ ناردین، کە پشکێنەرەکانی ڕووپێوی خۆی دەریانخستبوو لە زنجیرەی گوندەکانی پێش مێژوودان و هەندێکیشیان لەراستیدا ئەندامانی سینێوری دەستەکە سەردانیان کردبوون.

لەبارەی ناوچەی باکووری مووسڵەوە، ئەوان ئامۆژگاریاندا تاڕادەیەك لەبەرئەوەی هێشتا ڕووپێو نەکرابوو تاڕادەیەکیش لەبەر هەلومەرجەکانی ژیان، کرێکار و ئاسایش وەك هەرێمی نێوان مووسڵ و کەرکوك باش دەستەبەرنەبوون. ئەوان سەرنجی تایبەتییان بەگوندێکی بچووکدا، کە پێی دەگوترا مەتارە (PI. 7A)، کەوتبووە ناوچەی بنارەوە و نزیکەی ٢٠ خولەکیش بە سەیارە دەکەوێتە باشووری کەرکووکەوە، هەروەها سەرنجیان بۆ ناوچەیەکی والاّی تاڕادەیەك نادیار ڕاکێشاین پێی دەگوترا چەرمۆ (P I S. 4, 8)، لە دۆڵی نێوان شاخەکانی چەمچەماڵدا، کە کاتژمێر و نیوێك بەسەیارە لە ڕۆژهەڵاتی کەرکووکەوەیە. گردی مەتارە نیشانەکانی ڕووی دەرەوەی نشینگەیەکی هەمان جۆری گشتی وەك نشینگەی بنچینەی تەل حەسوونەی بەدەستەوەدا، کە لیۆد و سەفەر (١٩٤٥) پێشتر هەڵیانکۆڵیبوو، هەروەها لەبارەیەوە ڕاپۆرتیان پێشکەش بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار کرد.

ڕووی زەوی چەرمۆ تەنها پارچەکانی بەردە ئەستێ (flint) و ئامرازی ئۆبزیدی و کەمێك پارچە دەفری داتاشراوی بەردین (ground stone bowls) و دەستەبێور (celts)ی خستە بەردەست" دەستەی بەڕێوەبەرایەتی لە پێکهاتەدا وا تێگەیشت، کە شوێنەکە هی چەرخی بەردی نێوەڕاست (Mesolithic) بووە.

بەهۆی هەر گوتەیەکی ئاوای تاڕادەیەك لوس و پوسەوە بێت، دەستەی بەڕێوەبەرایەتی، هەروەك بەدڵنیاییەوە چەرمۆ لەنێو پرۆژەی کارماندا بێت، هەڵکۆڵینی ئەزموونی تێدا کرد.

بڕیارماندا بۆ هەڵکۆڵینی مەتارە بەخشینێکی ڕەسمی و ڕێپێدانی هەڵکۆڵینی ئەزموونیش (Sounding) لە چەرمۆدا داوا بکەین.

یاسای شوێنەواری عیراقیش تەنها بۆ یەك شوێن لە کاتێکدا بوار بە تیپی دیتنکاری دەرەکی (field party) دەدات، بەلاّم ڕێگەش بە تاقیکردنەوە یان هەڵکۆڵینی ئەزموونی لە شوێنەکانی تردا دەدات بۆ ماوەی مانگێك لەهەر شوێنێکدا.

ستراتیژمان ئەوەبوو، کە لە مەتارە دەستپێبکەین، کە تێیدا توانیمان خۆمان لەگەڵ چەند درێژە ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی ئاخیروئۆخری پێش مێژووی عیراق لە زنجیرەیەکدا رابهێنین، کە پێشووتر لە حەسوونەدا تاقیکرابوونەوە.

هەروا زانیاری قۆناغی حەسوونەمان باش بەرەو باشووری ناوچەی مووسڵ درێژکردەوە، هەروا بیرمانکردەوە، کە —شوێنە نەبینراوەکە- رەنگبێ مەتریاڵی پێش حەسوونە لە مەتارەدا هەبن. بەهەرحاڵ لەبەرئەوەی یەکەم وەرزمان کورتە وەرزێك بوو، بەژێرانەترمان زانی، کە لە ماوەی بواری هەڵکۆڵینی ئەزموونی مانگەکەدا لە تاقیکردنەوەی بواردراودا ئەوەی لەراستیدا لە چەرمۆدا هەیە بدۆزینەوە، دواجار بەپێی ئەوە پلانەکانمان بۆ داهاتوو دابنێین. هەڵکۆڵینەکانی یەکەم وەرز لە مارتەوە بۆ حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٨ درێژەی کێشا.

مەتارە گوندێکی قۆناغی حەسونەی خستە بەردەست، بەلاّم بەهیچ شێوەیەك کۆنتر نەبوو (Braidwood et-al; 1952).

لەلایەکی تریشەوە، چەرمۆ ئەو مەتریالاّنەی تێدابوو، کە لەڕووی پەرەسەندنی چەشنی شمەکەکانەوە (Typology) بەدڵنیاییەوە وا دەردەکەوتن، کە لە مەتریاڵەکانی قۆناغی حەسوونە کۆنتر بن، سەرباری ئەوەش شوێنەکە لە جۆری گوندێکی جێگیردا بوو، کە ناکرێ سەردەمی چەرخی بەردی نوێ (Mesolithic)ی پێبگوترێت.

دوای ئەوەی هەڵکۆڵینە ئەزمونییەکانی ساڵی ١٩٤٨ی نێردەکە دیاردیان بەوەدا، کە چەرمۆ مەتریاڵی سادەتر و سەرەتایتر و کەتەلۆگی روون و ئاشکرایی کۆنتری مەتریاڵەکانی کۆمەڵی لادێی جووتیاری لەهەر شوێنێکی دیکە زیاتر تێدایە، کە تائێستا دۆزراونەتەوە، پلانەکە بۆ هەڵمەتی دیتنکاری دووەم بەشێوەیەکی سەرەتاییانە لەسەربنچینەی هەڵکۆڵینێکی چڕ لەناوچەکەدا دامەزرا.

ستافێك پێکدەهات لە هەردوو بریدوو دەکە، ڤیڤیان برۆمان، ئێلیزابێت وێست، رۆبەرت ئێم. ئادەمز وەك بەشی گرانتی ئەنترۆپۆلۆژی سەید سەبری شوکری وەك نوێنەری بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار، دووەمین وەرزی دیتنکاری لە ئەیلوولی ١٩٥٠دا دەستپێکرد.

دەستەکە لە ١٩٥١دا زوو فراوانبوو تاوەکو بروس هاو لە مۆزەخانەی پیبۆدی زانکۆی هارڤەرد، هەربەرت ئی. رایت، جێی ئارِ لە بەشی جیۆلۆجی زانکۆی مینیسۆتا و فردریك بارت لە مۆزەخانەی ئەنترۆپۆلۆژی زانکۆی ئۆسلۆ، لەگەڵ هەردوو قوتابی دەرچووی پەیمانگای رۆژهەلاّتی، کۆرنیلیوس هیلین (Cornelius Hillen) و گوستاڤو ئێف. سویفت، جێی ئارِ (Gustavus F. Swif, Jr)، وەك خۆبەخشی بەشێك لە کات، بگرێتەوە. فراوانبوونەکە بە بەشداریکردنی قوتابخانەی بەغدای قوتابخانە ئەمریکییەکانی توێژینەوەی رۆژهەلاّتی لە



پرۆژەکەداو بەخشینەکانی دامەزراوەی ئاکسیلَ وێنەر- گرێن بۆ توێژینەوەی ئەنترۆپۆلۆژی و کۆمەڵگەی فەلسەفەی ئەمەریکی، بوو بەشیاو.

دەستەکە لە پێناوی ئەوەدا فراوانکرا، تاوەکو کار دەربارەی پرسی گشتی لێکۆڵینەوەی شوێنەواری دوا قۆناغەکانی نیشتەجێبوونی ئەشکەوت لە ناوچەی گردە بنارییەکان و دۆڵی نێوان شاخەکان (inter montane valley) و توێژینەوەیەکیش بۆ ئەو ناوچە والاّیانە (open – air sites) بگرێتەوە، کە رەنگبێ لەماوەی نێوان دوا قۆناغەکانی ئەشکەوت و قۆناغی چەرمۆدا خەڵکیان تێدا نیشتەجێبووبێت.

رایت، وەك زەویناسێکی چەرخی پلایستۆسین (Pleistocene)، کە ئەزموونی وەرزێکی دیتنکاری رۆژهەلاّتی کۆنی هەیە لەگەڵ جێزویتز (Jesuits) لە قەسر عەقیل لە لوبناندا، دەستیان بە رۆنانەوەی ژینگەی کۆنی کوردستانی عیراق کرد.

بارت (Barth) دەستی بە توێژینەوەکانی کرد لە مرۆڤناسی سروشتی ( physical Anthropology) و بەرهەستی زانی (paleontology)دا، کە مەزەندەی دیتنکاری لەبارەی ئێسقانی گیانەورانی لە هەڵکۆڵینەکانەوە دەردەکەوتن دەدا و چەند سەرنجێکیشی لەبارەی رەوشی گشتی ژینگەی هاوچەرخەوەدا.

هەرچۆنێك بێت، لەراستیدا بارت ئارەزووی لەوەبوو کارەکەی ببێت بە رەگەزناسی مرۆیی (Ethnology)" لە دوای تەواوبوونی هەڵکۆڵینەکانیش بۆ توێژینەوەی گوندە هاوچەرخەکانی کوردەواری لە کوردستانی عیراقدا مایەوە (Barth, 1953).

کردەکان (Operations) تەواوکردنی هەڵکۆڵینە ئەزموونییەکانی لە ساڵی ١٩٤٨دا دەستیان پێکرابوو، هەروا کردنەوەی چەند ناوچەیەکی تاڕادەیەك گەورەتری لەسەر لوتکەی گردەکە دەگرتەوە.

یەکسەر کار لەسەر خودی شوێنەکە باش دەستی پێکرا، دەستەکە ئەوەندە کاتی تەرخانکرد ئەوەندەی رووپێوییەك بۆ ئەو ناوچانەی لە دەشتی نێوان شاخەکانی چەمچەماڵدا لە چەرمۆ کۆنترن دەردەستبخات.

هاو (Howe) لە کاتی گەیشتنیدا ئەم رووپێوییەی لە ئەستۆگرت — هەندێك جار لەگەڵ رایت هەندێك جاریش لەگەڵ بەڕێز سەبریدا — ئەم رووپێوییەیان بەرەو دۆڵەکانی دەوروبەری دۆڵی چەمچەماڵ درێژ دەکردەوە. بێگومان باشترین چەشنی رووپێوی رۆیشتنێکی پێ بەپێی چڕە لە گشت پارچە زەوییەکدا، کە بۆ کشتوکاڵ شیاوە، ئینجا چ هەنووکە چ شیاوی وێناکردن بێت لە رابردوودا نزیکە لەسەرچاوەیەکی ئاوی خواردنەوە، بەوردی تاقیبکرێتەوە.





بەلاّم رووپێوییەکی چڕی دیاردیدانەکانی سەر رووی زەوی شوێنەکان، بەتایبەتیش لەو ناوچە گردەلانییانەی، کە تەپۆلکەکان تێکەڵ بە دەوروبەری گردەکان دەبن، ئەوا ئەو رووپێوییە چڕە کاتێکی زۆر دەخایەنێت.

هەروەها بەزۆری پشتمان بەراپۆرتی ئەو کرێکارانە دەبەست، کە کوردی هەمەوەند بوون و خەڵکی چەند گوندێکی جیاوازبوون. هەروەك ئەو کورپێژگانەی بەمێگەلی مەڕو بزنەکانیانەوە بە تەواوی گوندەکەدا گەڕا بوون.

هێژ بەردەستیّ (flint) و ستیّ (Steel) بۆ ئاگر کردنەوە بەکاردەهێنرێن، هەروا دەرکەوتنە ئاشکراکانی بەردەستی لای شوانەکان وەك ماتە سەرچاوەکانی پێداویستی تێبینی دەکرێت.

چونکە کرێکارەکان لەگەڵ بەردەستکەوتووی ئاسایی چەرمۆدا راهاتبوون، دەستیان بە باسکردنی شوێنەکانی تر کرد لە دۆڵەکە، کە بەردەستیّ، ئۆبزیدی، پارچەی گڵێنەی شکاوو چەند شوێنەوار و یافتەیەکی تریان تیایاندا بینیبوو.

دواجار جانتامان پێدان و بۆ کۆکردنەوە لەسەر رووی زەوی ئەو شوێنانەی باسیانکردبوون ناردمانن.

بەم شێوەیە ژمارەیەك کۆکراوەی سەر رووی زەویمان دەویست، کە دەکرا بشۆردرێن، جۆربکرێن (Sorted) و پۆلین بکرێن لە بنکەی کامپدا.

دواجار خۆمان سەردانی ئەو شوێنانەمان کرد، کە بەداهاتووترین کۆکراوەیان دەردەستخستبوو.

بەر لە گەیشتنی هاو (How) رووی چەند کۆمەڵە شوێنێك دەستنیشان کرابوون، کە بەلایەنی کەمەوە نیوەی ئەم شوێنانە وا دەردەکەوتن داهاتوویان هەبێت.

دۆڵی چەمچەماڵ لە باکووری رۆژئاواوە بۆ باشووری رۆژهەلاّت درێژ دەبێتەوە و رەنگبیّ ٣٥ مایل درێژبێت و ١٠ مایلیش لە فراوانترین شوێندا بەرینبێت (پان Width).

ئەو زنجیرە چیایەی، کە لە باشوور و رۆژئاواوە دەوری دۆڵەکە دەدات بەشێوەیەکی سەرەکی زوورگە (gravel) و ئەشکەوت و پەناگەی بەردیشی (rock shelter) تێدانییە. ئەو زنجیرە کەڤەرە ناسەرەکییانەی، کە جاربەجار لەنێو دۆڵەکەدا بەرچاو دەکەون بەشێوەیەکی سەرەکی تەمۆخ (Shale) و بەردەلە (Sand Stone)ن و ئەشکەوت و پەناگەشیان تێدانییە.



زنجیرەی لای باکوور و رۆژهەلاّت، (واتە) زنجیرەی کانی شەیتان حەسەن سەگرمە داغ“ کە ئەویش بەردەلە چەند ئەشکەوتێکی کەمی هەیە، بەلاّم بەر لە گەیشتنی هاو (How) لە هیچ یەکێك لەم ئەشکەوتانەدا دیاردانی گرنگمان (داهاتووی هەبێت) نەدۆزییەوە.

هاو (Howe) روپێوانەکەی بەرەو دۆڵی بازیان درێژکردەوە، کە دۆڵێکی ترە لە پشتی دۆڵی چەمچەماڵ، لەسەرووی زنجیرەی سەگرمە داغ.

لەراستیدا هاو (Howe) روپێوانەکەی بەرەو دۆڵێکی دیکە لەپشتی دۆڵی بازیاندا درێژکردەوە، کە بریتییە لە درێژبوونەوە سەروەکانی دەشتی سلێمانی، کە شاری سلێمانی لەسەر لێواری رۆژهەلاّتی دەشتەکە دایە.

سەردان لەم هەرێمەدا بۆ هەردوو ئەشکەوتی زەرزی و هەزارمێرد کرا، کە گارۆد (Garrod) لە ساڵی ١٩٢٨دا هەڵیکۆڵین (١٩٣٠). لە مارتی ١٩٥١دا، هەڵبژاردنەکانمان دیاریکردن و بوار پێدانێکیشمان بەنێوی قوتابخانەی بەغدای قوتابخانە ئەمریکییەکانی توێژینەوەی رۆژهەلاّتی — بۆ هەڵکۆڵینی شوێنێکی والاّ پێی دەگوترا کەریم شەهر (PIS. I B, 9A) و رێگەدانێکی هەڵکۆڵینی ئەزمونی (Sounding)شمان بۆ پەناگەیەکی کەڤەری (Rock Shelter)، کە پێی دەگوترا پەلگەوەڕە (PIS. IOB)، وەرگرت.

ئەشکەوتی پەلگەوەڕە لە زنجیرەی بەرانان داغ دایە، ئەو زنجیرەی، کە دەوری لێواری باکووری رۆژهەلاّتی دۆڵی بازیان دەدات. کەریم شەهر نزیکەی مایلێك لەسەرووی ئەو دۆڵەوەیە، کە لە دۆڵی چەمچەمالّدا شانبەشانی بنکی چەرمۆ دەڕوات.

لەرێگەی هەڵکۆڵینەوە، کەریم شەهر پێشانیدا، کە تەنها تەنکە (Shallow) چینێکی نیشتەجێبوون بێت، رەنگبیّ نیشتگەیەکیان لە نشینگەیەکی کاتی زیاتر بێت، هەروا کەتەلۆگی ئەو مەترپالانەی خستە بەردەست، کە لەرێگەی هەڵسەنگاندنی پەرەسەندنی چەشنی شمەکەکان (Typology)ەوە بێگومان لە مەترپالەکانی چەرمۆ کۆنترن. مەترپالەکانی پەلگەوەڕە هی ئاخیر و ئۆخری پیشەکاری زەرزین، کە گارۆد لە ئەسڵدا بە مەترپالەکانی ئوریەنسیانی سەروو (Upper Aurignacien) (1930, p. 22) دواجار بە گراڤیتیانی سەروو ( upper Gravettian) (1938, pp. 14, 23, 24) و پاشتریش بە چاخی بەردی کۆنی سەروو (upper palaeolithic)…. پێشکەوتن بەرەو چاخی بەردی نێوەڕاست (Mesolithic)“ (1953, p. 22) هەروا بە چاخی بەردی کۆنی سەروی زۆر پێشکەوتوو ( Palēolithique Supērieut trē ēvoluē) (1957, p. 446)، ناڤۆکی کردوون.





دەرئەنجامەکانی ئەم هەڵکۆڵینانە و هەڵکۆڵینەکانی چەرمۆش بەکورتی ناڤۆککراون.

(Braid Wood, 1951 a-c and 1952 a-b; R. J. and L. Braid wood, 1953; Linda Braid wood 1951-53).

تاقیکردنەوەیەکی زیاتر لەلایەن رایت و هاو (1951) بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار لەماوەی وەرزی ۱۹۵۰/۵۱ تاقیکردنەوەیەکی کورتبوو لە بەردە بەلکەدا کرا.

تاقیکردنەوەی دەرکەوتنی ئامێرەکانی چەرخی بەردی کۆن (Palaeolithic) لە زورگەکانی نزیك خودی شاری چەمچەماڵ، کە جۆرەکانی دەستەبێوری ئەشولی ( Acheulean type Hand axes)، گاشە ئامرازەکان (Pebble tools) و ئامرازی تەلاشە بەرد ( Flake tools)یان دەگرتەوە، ئەم ئامرازانە خاڵێکی وەراستخستنی کەلچەریان لەنێو سەردەمەکانی ئاخرو ئۆخری چەرخی پلایستۆسین لە ریز بەندییە جیۆلۆجییەکەیدا بەڕایت (Wright) بەخشی و شوێنی چین لەدوای چینی چینناسی Stratigraphy) ئامرازە کۆنەکانیشیان چەسپاند.

رایت (1952) کورتە راپۆرتەکەی لەبارەی رووپێوانە جیۆلۆجییەکەی رووبەری گشتی پێشکەشکرد (ئەنجامدا).

رەنگرێژی هەڵمەتی دیتنکاری ساڵی ۱۹۵٤/٥٥ —مان لەسەر ئەو گریمانە دامەزرا بوو، کە چەرمۆ بەقوولی لە وەرزەکانی ۱۹٤۸ و ۱۹۵۰/۵۱-دا بە تەواوی تاقیکرابێتەوە.

مەزندەمانکرد، کە کاری سێ مانگ لە بەهاردا تاقیکردنەوەیەکی تەواومان لەبارەی سەر لەبەری گوندەکە دەداتێ، گەر تەنها لەسەرووترین چینەکاندا بکرێت (بەڵام بڕوانە ل.۲۳). لەکاتێکدا بەهار بۆ هەڵکۆڵین وەرزێکی نموونەیی بێت، ئەوا پایز باشترین کاتە بۆ رووپێویی سەر رووی زەوی" بنی وشکی ئاوەڕۆ و جۆگەلەکانیش گەریان بە کێڵگە و گوندەکاندا ئاساندەکەن و دوای بەسەرچوونی گەشەکردنی رووەکەکانیش لەماوەی وەرزی هاویندا، کۆکردنەوەی مەتریاڵەکانی سەر رووی زەوی گەلێك ئاسانترە.

پێشبینیکردنی ئەوەی، کە چەرمۆ بەتەواوی تاقیبکرێتەوە بۆ مەبەستەکانی گشتاندنی مێژوویی — کەلچەری تاوەکو کۆتای وەرزی ۱۹۵٤/٥٥، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رەنگبوو (۲۵) بیست و پێنج وەرز و درێژکردنەوەی زیاتریش بخایەنێت بۆ تەواوبوونی تەواو لە شوێنەکەدا، بەسەربردنی پایزی ۱۹۵٤-مان لە رووپێوی بناری بالاّ (Upper Piedmont) و ناوچەی گردە بنارییەکان و دۆڵی نێوان شاخان (inter montane valley) لە حەوزی رووباری زێی گەورەدا پێشنیار کرد (fig. A, PIS. 5A and 7B).



ئەمەش بردینیە نێو ولاّتێکی نوێوە، کە ۱۰۰ مایل یان زیاتر دەکەوتە باکووری رۆژئاوای دۆڵی چەمچەماڵەوەو پێشبینیشمانکرد، کە لەنێو ئەو قۆناغە کەلچەرییانەی پێوەندن بەئێمەوە دەتوانین جۆراوجۆرییەکی هەرێمی سەرنجڕاکێش رێکبخەین.

هەروەها پێشنیاری درێژکردنەوەی لایەنی زانستە — سروشتییەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیەمانکرد، کە بەشێوەیەکی زۆر بەرهەمدار دەستیان پێکردبوو. بەخشراو (دەسکەوت)ی سەرەکی لەرێگەی دەزگای نەتەوەیی زانستییەوە لە بەرژەوەندی پڕۆژەکەدا درا بە بەشی ئەنترۆپۆلۆژی زانکۆی شیکاگۆ" بەخشراوانی زیاتریش لەرێگەی دەزگای وێنەر گرێن بۆ توێژینەوەی ئەنترۆپۆلۆژی و کۆمەڵەی فەلسەفی ئەمریکی و هاوڕێ دڵئاواکانی خودی ئینستیتیوتەوە دران بە ئینستیتیوتی رۆژهەلاّتی.

رایت پێشوازی لە هاورێیانی دوای دکتۆرا هەریەك لە گوگنهایم (Guggenheim) و وێنەر گرێن (Wenner – Gren) کرد، قوتابخانەی بەغدادی قوتابخانە ئەمریکییەکانی توێژینەوەی رۆژهەلاّتیش هاو (Howe)ی وەك پڕۆفیسۆری سالاّنەی بەغدا دانا و مووچەیەکیشی بۆ دیتنکارییەکەی بڕییەوە.

دەستەکە (Staff) لە مانە پێکهات:

هەردوو بریدوودەکە (خاتوو بریدوود و کوڕەکەشیان لە بەهاری ۱۹۵۵-دا بەشداری تیپی دیتنکارییەکەی کرد)، ڤیڤیان برۆمان، هانس هەڵبێك لە مۆزەخانەی نیشتیمانی دانیمارکی وەك رووەکناس (botanist)، خاتوو ماتسۆن وەك خۆبەخش، چارلس ئێی. رید لە زانکۆی ئیلینۆیز وەك گیانەوەرناس (Zoölogist)، بەڕێز مایۆ شرایبەر (Mayo Schreiber) و خاتوو ژنەکەی وەك خۆبەخشانی ئینستیتیوتی رۆژهەلاّتی، خاتوو پاتی جۆ واتسۆن (نیئەندەرسن) وەك بەشی گرانتی ئەنترۆپۆلۆژی، هەروا رایت و ژنەکەی. رایت لەگەڵ سێ کوڕی رایت وەك خۆبەخش.

بەڕێز حوسێن ئەعزەم و بەڕێز سەبری شوکریش نوێنەرایەتی بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواریان دەکرد، لەگەڵ بەڕێز محەمەد عەلی و بەڕێز سوبحی ئەنوەر، کە بۆ کاتانێکی کەمتر خزمەتیانکرد.

لە پایزدا بەڕێز یوسف مەنسووریش لە مۆزەخانەی سروشتی بەغدادا هاوکاری رید (Reed)ی کرد.

دەستەکە (Staff) لە ئاخیروئۆخری ئەیلوولی ۱۹۵٤ لە هاوینە وتێل لە گوندی (ناحییە) سەلاحەدین لەسەر زنجیرەی پیرمام داغ خۆی دامەزراند، کە بەسەر بناری بالاّی نزیك شاری هەولێر و حەوزی رووباری زێی گەورەدا دەنوارێت.





لەبەرئەوەی کرێکارانێکی چاکی راهاتوو نەبوون داوای رێنوێنییان لەبارەی ئەو شوێنانەی مەترِیالّی سەر زەویان هەیە لێبکرێت، بۆ خۆمان کارەکەمان کرد.

بەدرێژایی چەند رێگەیەکی سەرەتایی و ناسەرەکی و چەند رێچکەیەکدا جوولاێین، هەروەك توانیمان بە ئۆتۆمبێل بەردەوامیین.

هەروا بەرِۆیشتنی بەپێ بەشێکی زۆری خازر، بەستۆرە، حەریر — بارزان و لقی دۆڵەکانی دیانە — باڵەکیان بۆ زێی گەورە و لقی بەرەت — داغ لە باکووری رۆژئاوای بێخمە، کە درێژبوونەوەیەکی خودی زێی گەورەیە، بەهۆی شرِە بەلەمێکەوە (Collapsible boat) تاقیمانکردنەوە.

نەخشەی رێگەکانمان ماوەی گشتی دەوری ٤٠٠ مایل پێشاندەدەن" چونکە دەبوو دووجار بهاتین و بچووینایە" کە لە گەرِانەوە و چوونە پێشی لوفەکاندا (Zigzagging)دا دوور دەکەوتنەوە، بەلاّم رووبەرەکە گەلێك گەورەیە و هێژ ناکرێ بگوترێت بە چرِوپرِی رووپێوکراوە. رید و رایت گەشتەکانیان بۆ ولاّتی بالاّی شاخاوی بەرەو هەریەك لە سنووری ئێرانی و تورکی لەوپەرِی باکووری رۆژهەلاّتی عێراقدا درێژ کردەوە. تاوەکو ناوەرِاستی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٤، توانیمان سێ شوێن، کە ناوچەی والاّی بەداهاتوویان تێدابوو، هەروا چوار شوێن، کە ئەشکەوت یان شوێنی پەناگەی بەردیان تێدابوو، بۆ زنجیرەی هەڵکۆڵینی ئەزموونی (Sounding) هەڵبژێرین.

دوو شوێنی والاّ لە نزیك گرد مەمك (pl. 7B) گوندێکە لەسەر زێی گەورە لەبناری باکووری هەولێردا، هەبوون.

گردی چای، یەکێکە لەم شوێنانە، بەلایەنی کەمەوە مەترِیالّی کۆنی بەقەد کۆنی مەترِیالّەکانی کەریم شەهر بەدەستەوەدا، بەلاّم بەهۆی بوونی ئەو چالاّنەی لەسەردەمە زۆر درەنگترەکاندا لێدراون کەتەلۆکی گردی چای رووننەبوو.

دووەم شوێنی گردمەمك، گردی عەلیاغایە، گوندێکی بچووکی تێدا دەرکەوت، کە دەبێت لەماوەی سەردەمێکدا بووژابێتەوە تارِادەیەك تەریبی سەردەمی چینەکانی سەرەوەی چەرمۆ بووە. شوێنێکی تری والاّی هەڵکۆڵینی ئەزموونیمان تێیدا کرد گردی بانهیلك بوو (p1. 6A) نزیکی گوندی دیانە (ئێستا شارە) لە دەشتی نێوان شاخان (intermontane)ی بەرەو باکووری رۆژئاوای رەواندوز درێژ دەبێتەوە ئەو گوندە شوێنەواری گوندێکی خستە بەردەست کەتەلۆگەکەشی گلێنەی رەنگکراو (painted pottery)ی شێوازی حەلەفی لەنێو خۆگرتبوو.



شێوازی گلێنەی رەنگکراوی حەلەف، لە ناوچەی بناری دەوروبەری مووسڵ بەشێوەیەکی گشتی لەدوای قۆناغی گلێنەی حەسوونە دێت، ئەوەش بۆ تێگەیشتنی کەتەلۆگی گوندێکی زۆر لە ناوچەی شاخاوی بالاّ نزیکبێت و لەگەڵ شێوازی گلێنەی حەلەفیشدا هەر نزیك بێت، بەسوود بوو.

سێیەم شوێن، کە ناوچە والاّکانی هەبێ، لەو خاڵەدا بوو، کە لقی خازر لە گردە بنارییەکانەوە بەرەو بنار تێپەرِ دەبێت (واتە) لەنێوەرِاستی رێگەی نێوان هەولێر و مووسڵدا.

لەم شوێنەدا، تەل ئەل — خان و تەل مەلفەعات دەکەونە سەر لاکەی تری رێگاکە، لە کۆتای پردی رووباری خازر بەلای مووسڵدا (PI. 6B). تەل ئەل — خان مەترِیالّی زۆرتر یان کەمتری هاوشێوەی مەترِیالّەکانی حەسوونە سێی خستەبەردەست، بەلاّم کۆنتر نەبوون.

لەلایەکی تریشەوە، تەل مەلفەعات، کەتەلۆگێکی وەبەرچاو خست، کە لەسەر بنەمای پەرەسەندنی چەشنی شمەکەکان (Typology) ئاستێکی شارستانی پێشنیار دەکات زۆر لە ئاستی شارستانی کەریم شەهر نزیکە.

بۆ مەبەستەکانیشمان ئەو ناوچەیە بە سوودترینی ناوچە هەڵکۆڵدراوە ئەزموونییەکانبوو.

پەناگەی بەردی کاوانیان لە باکووری رۆژئاوای شارۆچکەی شەقلاّوە، لەرێگەی تاقیکردنەوەوە سەلمێندرا خراپ شلەژاوە.

هەمان راستی لەبارەی ئەشکەوتی گەورەی حاجییە (P1. 11B)، لە زنجیرەی نێوان گوندەکانی بێخمە و بییە لە باکووری رۆژئاوای تەسکەرِارِەوی زێی بێخمە و تارِادەیەکیش لە ئەشکەوتی باراك (P1. 11A) لە رۆژهەلاّتی عەقرەدا، سەلمێندرا.

هەرچۆنێك بێت بەلایەنی کەمەوە ئەوە روونبووەوە، کە ئەشکەوتی حاجیوە و باراك خەڵکانێك تیایاندا نیشتەجێبوونە، کە زنجیرەی ئامێرە بەردەستێکانی هاوشێوەی دەرکەوتنی ئامرازەکانی زەرزی و پەلگەوەرِەیان بەکارهێناون.

سێیەم شوێن، کە پەناگە بەردییەکانی هەبێ راستەوخۆ لەسەرووی گوندی هاودیانان لە باکوری رۆژئاوای گوندی گەورەتری دیانان (هەروەها لە باکوری رۆژئاوای گردی بانهیلکیشدا) لە ناوچەی رەواندوز-ەوە بوو.

بەرهەمدارترینی ئەم پەناگە بەردییانە، پەناگەی بابەخاڵ بوو، کە مەترِیالّی چەرخی بەردی کۆنی شێوەی موستێریانی وەك ئەو مەترِیالاّنەی پێشکەشکرد، کە یەکەم گارۆد لە ئەشکەوتی هەزار میردداد دەریخستن (١٩٣٠).





لەسەرووی ئەم مەتریالانە لە بابەخالدا چینێکی تارادەیەك شلەژاو هەبوو شێوەی ئامرازە بەردەستییەکانی زەرزی — پەلگەوەڕەی دەگرتەوە.

لەماوەی بەهاری ١٩٥٥-دا، تاقیکردنەوە لە ئەشکەوتێکدا کرا پێیدەگوترا سپیلك، کە لە ڕێگەی سەرەکی نێوان سەلاحەدین و شەقلاوە نزیکە" ئەم ئەشکەوتەش بەردەستێکاری موستێریان (Mousterian)ی خستە بەردەست. دەرئەنجام و روپێوانی هەڵکۆڵینە ئەزموونییەکان لە ماوەی پایزی ١٩٥٤دا بەکورتی لەلایەن بریدوودەوە وەسفدەکرێن (et al., 1954. دەستەکە (Staff) بەشێوەیەکی کاتی لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩٥٥دا بۆ گەشتێکی شوێنەواری لەبارەی ئەو شوێنانەی لە هێڵی گشتی پرۆژەی کارمەندان، کە دەکەونە ولاتانی کەناری (littoral) ناوچەی دەریای نێوەڕاست وەك ئەردەن، لوبنان، سووریا و باشووری تورکیا، عێراقی بەجێهێشت.

دوو ئامانجی سەرەکی بۆ ئەم گەشتە هەبوون. یەکەمیان، هیوامان وابوو مەتریاڵەکانی سەر رووی زەوی لە شوێنی یان لە نزیکی شوێنە هەڵکۆڵدراوە سەرەکییەکانی ئاخیروئۆخری بوارە هێڵی ئەشکەوت و گوندە کۆنترەکان کۆبکەینەوە، سەرەڕای ئەوەش، بۆ دەستەبەرکردنی سوستەکانی (Samples) کاربۆن چواردە لە رووی چاڵە کۆنەکانی هەڵکۆڵینە ئەسڵییەکان ئەوەندەی دەشێ لە زۆربەی ناوچەکاندا (pl. 5B).

هەردوو بریدوودەکە، بڕۆمان و سویفت لە حوزەیرانی ١٩٥٢دا هێندێك لە ڕێگە پێشنیارکراوەکانیان لەنێو کارگرت، هەروا بڕوامان وابوو، کە دەتوانین گەلێك فێرببین و گەلێك کۆبکەینەوە.

ئامانجی دووەم ئەوەبوو لەڕێگەی دەستەکەوە هەل بدرێت بە زانایانی سروشتی تاوەکو رەوشەکانی بواری ژینگەی ئەمڕۆکە، کە تێیدا مەتریاڵی شوێنەواری دەردەکەون، تێبینی بکەن. هەروەها جگە لەو هەرێمەی هەنووکە دەکەوێتە دەوڵەتی ئیسرائیلەوە دەبێت بەشەکانی باکووری رۆژئاواو کەوانەکانی (arcs) رۆژئاوای رەخە گردەلانییەکانی کەوان (Crescent)و ئەودیو هەرێمەکانی سووری — فەلەستینی، تێبینی بکەین. لە ٤/ی کانونی دووەمی ١٩٥٥دا مووسڵمان جێهێشت و لە ٩/ی کانونی دووەمدا گەیشتینە ئەلیپۆ، سووریا، دواجار ناوچەی بنارمان کتومت لە باشووری سنووری تورکیادا بڕی. ئەم ڕێگەیە بواریداین ناوچەکانی گرێی رەش، تەل براك، تەل چەگەر بازار، تەل — ئەل — حەلەف و تەل — ئەل فەخریە بپشکنین و شوێنە هەڵنەکۆڵدراوەکانیش لە دەشتی جەبەل شەنگار و جزیرەی بالای سووریدا تاقیبکەینەوە.



لە ئەلیپۆوە گەشتێکی خێرامان بەرەو بەیرووت، لوبنان، ئەنجامدا بۆ ئەوەی وارێکی هاوین بکەینە بنکەی زستانمان لە شەلماندا، کە سەعات و نیوێك بەسەیارە لەسەرووی بەیروتە. لە ١١/ی کانونی دووەمە تاوەکو ٢٧/ی شوبات لە بنکەی زستاندا لە شەلماندا ماینەوە، کە لەماوەی ئەو کاتەدا سەردانی زۆرترینی ناوچە ناسراوەکانمان کرد لە ئەردەن، لوبنان و بناری ناوەوە (inland piedmont)ی سووریادا.

زۆربەی شوێنە هەڵکۆڵدراوە سەردانکراوەکان ئەمانە بوون: ئەشکەوتەکانی دۆڵی خەریتوم و تەپۆڵکەی ئەریحا لە ئەردەن، ئەشکەوتەکانی یەبرود و خیرپەت ئەل — ئومباشی لە سووریا، ئەشکەوتەکەنارییەکانی ئەبوحەلقە، نەهر ئیبراهیم، قەسر عەقیل، هەروا عەدلون و شوێنی بابیلوس لە لوبناندا، هەروەها زۆربەی شوێنەکانی پێش مێژوویی پێوەندن بە شەقڵە جیۆلۆجییەکان بەدرێژایی کەنارەکە. دوای ئەوەی شەلمانمان بەجێهێشت، سەردانی تەبعەت ئەل — حەمام و رەئس شەمرەمان لە کەناری سووریادا کردو، سەردانی هەریەك لە شوێنەکانی عاموق، تەرسووس و مرسین-مان لە کلیکیای تورکیدا و باغووز-یش لەسەر پوڕات لە سووریادا کرد.

هەردوو ماتسۆنەکە (کە هاوسەربوون) سەردانی میسریان کرد و سوستە (Sample)ی کاربۆن چواردەی زیاتریشیان دەستەبەرکرد، لەکاتێکدا هاو و هەردوو رایتەکە چوونە بانی ئەنادۆڵ بۆ پشکنینی چینە بەردەکانی ئوبسیدی (Obsidian beds) لە نزیك ئەکسەرەریدا. بۆ کۆتایهێنانی گەشتی زستانە، لە هەشتی مارتدا گەیشتنە کەرکوك و چەرمۆ.

هەرکە کامپەکەمان دووبارە لە چەرمۆدا دامەزرایەوە، کاتێك قۆناغی کۆتایی وەرزی دیتنکاری ١٩٥٤/٥٥ دەستپێکرد، هەڵکۆڵینەکان لە ١٩/ی مارتدا دەستیان پێکرایەوە.

سەرەڕای هەڵکۆڵینە راستەقینەکان هێشتا چالاکییەك هەبوو.

ماتسۆن و شرایبەر گەشتیان بۆ هەریەك لە باکوور و باشووری شوێنە عیراقییە هەڵکۆڵدراوەکان کرد، ئەمەش بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ کۆکردنەوەی گلێنەی کەوتووی سەر رووی زەوی و دەستەبەرکردنی سوستەکانی کاربۆن چواردە بوو.

رید و هەڵبیك گەڕانە گەشتی زیاتریان بەرەو بەرزاییەکانی پشتی رەواندوز لەپێناو ئامانج گەلێکی گیانەوەرناسی (Zoö logical) و رووەکناسی (botanical) ئەنجامدا.





رایت بەرەو بانی ئێرانی ئەودیو کرماشان و لەوێشەوە بەرەو بەشی عیراقی بیابانی سووری ئەودیو روتبە گەشت گەلێکی ئەنجامدا، هەروەها کۆمەڵە گەشتێکی زیاتری بەرەو بەرزاییەکانی باکووری عیراق ئەنجامدا.

رایت پێش دوا تێپەڕبوونی بەبانی ئەنادۆڵدا بەرەو رۆژئاوا لەرێگەی گەڕانەوەدا بەرەو نیشتمان، لە مانگی حوزەیراندا بەرەو تورکیا بۆ بەرزە ولاتی هەکاری لەسەر لای باکووری رۆژهەلاتی سنووری تورکی – عیراقی، بەرەو باکوور گەشتی کرد.

بۆ گشتاندنە سەرەتاییەکان لەبارەی لایەنە جیۆلۆجییەکانی شوێنەوارناسی لە عیراقدا بڕوانە (Wright, 1955).

پێڕۆی تۆڕی چوارگۆشە بچووکەکان (Grid of small squares)، کە هیوامان وابوو بەهۆیەوە رەنگرێژی گوندەکە لەبارەی چینەکانی سەرەوەی چەرمۆ تاقیبکەینەوە گەلێك شتی لەبارەی چینناسی سەر لەبەری شوێنەکە فێرکردین. بەهەرحاڵ، ئەوەش کێشەی زیاتری دروستکرد نەك چارەسەر، (کەوابوو) رەنگبێ کار بگاتە ئەوەی، کە چەرمۆ بەر لەوەی تەواو بکۆڵرێتەوە پێویستی بە وەرزی هەلکۆلینی تر هەیە.

هاو توانی هەلکۆلینی قوتابخانەی ئەمریکی لە پەلگەوەڕەدا تەواو بکات، کە پێشتر لە ١٩٥١دا تاقیکردبووەوە.

وەرزی دیتنکاری ١٩٥٤/٥٥ لە ٣/ حوزەیراندا تەواو بوو" ئێستاشی لەگەڵبێ، تەنها کورتە وەسفێکی دەرئەنجامی وەرزەکان لە چەرمۆدا بلاوکراوەتەوە (Braid wood, 1956 b).

– ٤ –

## وەسفی شوێنەکان

شوێنە شوێنەوارەکانی پرۆژەی چەرمۆی عیراق لە وەرزە دیتنکارییەکانی ساڵی ١٩٤٧/٤٨، ١٩٥٠/ ٥١–دا هەڵیکۆڵێن یان تاقیکردنەوە، هەروەها گرنگترین ئەو شوێنانەی، کە دەستنیشانیکردبوون بەڵام تاقینەکرانەوە، لە خوارەوەدا ڕێکدەخرێن. لیستەکە بەشێوەیەکی گشتی لە نوێترین شوێنەوە بۆ کۆنترین شوێن ڕێکدەخرێت.

سیستەمی پێشکەشکردنەکە وابەستەی هەڵسەنگاندنی پەرەسەندنی چەشنی شمەکەکان (Typological) دەبێت، واتە پشت بە زیترکردنی خستنە چوارچێوەی کەتەلۆگی مەترِیاڵەکان لە شوێنە جیاوازەکان دەبەستێت وەك ئەوەی یەکێك لە کاتدا بەرەو دوا بگەڕێتەوە ( Cf. Braidwood et al 1954).

### گرد بانهیلك

ئەم گردە تەپۆڵکەیەکی نزمە نزیکەی -٥- مەتر بەرزە (pl. 6A)، کە تاڕادەیەك پلانێکی هێلکەیی هەیە نزیکەی ١٠٠ X ١٥٩ مەترە.

لەمیلێك کەمتر دوورە لە باشووری رۆژئاوای گوندی دیانە (ئێستا قەزای دیانەیە) لە دەشتی باکووری رەواندوزدا: لە دەوری ٣٦° ٤٠°-ی باکوور" ٤٤° ٣٢° رۆژهەڵاتدایە، بەرزاییشی لەسەر ئاستی رووی دەریادا ٢,٢٠٠ پێیە.

خودی دەشتەکە تەنها ٥ X ١٠ مایل پانی و درێژیەتی" دەشتەکە تەختە (rolling) و باش ئاو دەخواتەوە (Well Watered)، هەروا لوتکەی چیا بەرزەکانی کوردی دەوری دەشتەکە دەدەن.

چەند ئاوەڕۆیەك لە سووچی باشووری رۆژهەڵاتی دەشتەکەدا یەکدەگرن، کە رووباری رەواندوز پێکدەهێنن، کە لەم شوێنەوە دەچێتە گەرووی گەڵی عەلی بەگی سەرنج ڕاکێشەوە. لەو شوێنەوە نزیکە، کە لە باشووریدا شوێنی نیشتنەوەی فڕۆکە هەیە، لە ١٩٢٠–ەکاندا لەلایەن



بەریتانیا و سوپای ئیلزامی ئاشوورییەکانی سەر بە بەریتانیاوە دروستکراوە و پاشتر لەلایەن سوپای عیراقییەوە بەکارهێندرا (Hamilton, 1958, p 90).

شوێنەواری کەوتنی سێ بۆمب لەسەر لوتکەی شوێنەکەدا و سێ یان چوار چاڵی قەدبڕ ( Slit – trench) و قووڵێکی گەورە (cut) لەسەر باکووری رۆژهەڵاتی تەلانەکە (Slope)دا هەیە، کە گڵ لێیەوە براوە.

کەتەلۆگی مەترِیاڵەکانی بانهیلك گلێنەی رەنگکراوی شێوەی حەلەف لەنێو خۆدەگرێت. کارەکە لەوەدا قەتیس بوو بەقەد ئەوەی ئێمە پێویستمان پێیبوو، هەرچۆنێك بێت بانهیلك وێنەیەکی تەواوتری (rounded picture) لەبارەی پۆلەکانی نشینگەی حەلەف لە هەموو ئەوانەی بەشێوەیەکی تر لە گوتارە بلاَوکراوەکاندا (literature) فەراهەمە، بەدەستەوەدا.

### تەل ئەل – خان

ئەم گردە (pl. 6B) راستەوخۆ دەکەوێتە باشووری رێگەی هەولێر – مووسڵ لەسەر لای راستی کەناری رووباری خازر لەلای پردی مەنگوبەدا.

هەماهەنگەکانی ئەم گردە وەك بەرزی و دەوروبەری سروشتی بەشێوەیەکی سەرەکی وەك ئەوانەی گردی مەلفەعاتن، کە کتومت دەکەوێتە باکووری رێگاکە (بڕوانە ل. ٢). گردی ئەل – خان گردێکی بچووکە نزیکەی ٨٠ X ١٠٠ مەترە، رەنگبێ ٤ مەتریش بەرزبێت، بەشێوەیەکی کردەیی ئەم گردە بە سەنگەری تانکەکانی سوپای بەریتانی دەور دراوە، هەروا بەشێوەیەکی ئاشکرا پردی خازر لە هەردوولایەوە لە بەهەند وەرگرتنی ئەگەری چاوەڕوانکراوی داگیرکردنی دابەزاندنی ئاسمانی نازی لە باکووری عیراق لە ١٩٤١دا، زۆر چاك قایمکراوە.

سەنگەری تانکەکانی بەریتانی تاقیکردنەوەکەمانی لەبارەی تەل ئەل – خان ئاسانکرد، دەوروبەرەکانیشی رەنگبێ لە ئەسڵدا تاڕادەیەك لە ئەوانەی ئێستا هەن جیاواز بووبن.

لە خوار چینێکی تەنکی مەترِیاڵەکانی سەردەمی ئیسلامی (هەروەها رەنگبێ هەندێك مەترِیاڵی سەردەمی ئاشووری)، چینێکی ئەستوورتری لیتەی بێ پیت هەبوو.

لە خوار ئەمەشدا، چینێکی تەنکی مەترِیاڵەکانی شێوەی حەسوونەمان دۆزییەوە.





پەرشو بلاوبوونەوەی زۆری گلێنە شکاوەکانی شێوەی حەسوونە لەسەر رووی گردەکەدا دەبێت لە کردەکانی چاڵ لێدانی بەریتانییەوە سەرچاوەی گرتبێت.

رایت (Wright) بەشێوەیەکی کاتی پێشنیار دەکات، کە چینی لیتە بێ پیتەکە ( Sterile Silt) دەرئەنجامی داشۆرانی لیتە بووە لە گردە زوورگەکانەوە بەرەو باکووری رۆژئاوای گردەکە لەسەردەمەکانی دوای حەسوونەدا.

سەنگەری تانکەکان بەکارنەهاتبن، ئەوا زۆر گوماندارە، کە هیچ سوالەتێکی (Sherd) شێوازی حەسوونە لەسەر رووی ئێستادا دەربکەوێت — زانیاری لابەلاش بۆ کاری تەواوکردنی هەر رووپێویەکی چڕی سەر رووی زەوی چەمکی شاراوەی گومانداری دەبێت.

## تەل مەتارە

گردی مەتارە ٢٠ مایلێك لە باشووری کەرکووکەوەیە (Braid wood et al., 1952): ٣٥° ٢٣°ی باکور، ٤٤° ٢٢°ی رۆژهەلاّت" بەرزاییشی لەسەر ئاستی رووی دەریادا نزیکەی ٧٥٠ پێیە. ئەو گردە لە دەشتی بناردایە و وەکو گردەکانی پێشووی ئەم ناوچەیە گەورە نییە، تیرەکەی نزیکەی ٢٠٠ مەترە و نزیکەی ٨ مەتریش بەرزە (pl. 7A).

تەنها نیوەی سەرەوەی گردەکە ساچمەی نیشتەجێبوونی خەڵکی تێدایە" بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا گوندە ئەسڵەکە لەسەر گردێکی سروشتی بچووك دروستکراوە" شتی ناوازەی سەرنجراکێش لەو گردەدا ئەوەیە، کە لەم شوێنەوە لەسەر ئاستی گشتی دەشتی بنار (Piedmont)دا بەرز دەبێتەوە.

بە نزیکەی ٣ مایل لە رۆژهەلاّتی گردەکەدا زنجیرەی نزمی کانی دۆملان — جەبەل تەسك هەیە، کە یەکەم زنجیرەیە کە شاخەکانی کوردستان دروستدەکات.

ئەم زنجیرەیە سەرچاوەی ئاوە، دۆڵێکی بچووکیش ئێستا وشکە جگە لە وەرزی باران — لەم زنجیرەیەوە دێتە خوارێ و بە بناری گردەکەدا تێپەڕ دەبێت و هێژ بەشێکی گردەکە دادەماڵێ. بەگەڕانەوە لە زنجیرەکە لەلای رۆژهەلاّتەوە، یەکێك لە هەموو لایەکانی ترەوە درێژبوونەوەی گەورەی دەشتی بنار دەبینێت، ئینجا لێرەدا تەخت دەبێت و ئاسۆکانیشی جار بەجار بەهۆی



ئەو گردانەوە شکاون، کە لەسەردەمەکانی درەنگتر لەسەردەمی مەتارە بەشێوەیەکی زەق و ئاشکرا خەڵکیان تێدا نیشتەجێبووە.

بە نزیکەی ١٠ یان ١٥ مایل بەرەو رۆژئاوای مەتارە، ئەم گردانە بەرەو نەمان دەچن یان وندەبن" هەروەك لەپێشدا تێبینی کرا (ل. )، پشتێنەی بارانبارینی بناریش لە باشووری کەرکووکدا فراواننیە.

کەتەلۆگی مەتریاڵە شوێنەوارەکانی مەتارە زۆر لە گەتەلۆگی مەتریاڵەکانی شێوەی شوێنی حەسوونە دەچێت.

لەراستیدا مەزەندە دەکەین، کە مەتارە گوزارشت لە قۆناغێکی کەلچەری جۆراوجۆری حەسوونەی تاڕادەیەك هەژاری باشوور دەکات. گەر ئەمە راستبێت، ئەوا مەتارە رەوشی ئەمڕۆ، بۆ گوندەکانی بناری باشووری کەرکووك ئەوانەی لە هێڵی کەمبارانی زۆر نزیکن رەنگدەداتەوە، بۆئەوەی وەك گوندەکانی دەشتی ولاّتی ئاشوور لە باکووردا گەشە بکەن.

## گرد عەلیاغا

ئەم گردە دەکەوێتە سەر گردێکی زورگاوی لەسەر یەکەم سەکۆی گەورەی کەناری چەپی زێی گەورە، بە نزیکەی مایلێك لە باکووری گوندی گرد مەمك (P1. 7B): لە دەوری ٣٦° ٢٧°ی باکور، ٤٣° ٤٨°ی رۆژهەلاّت" بەرزاییشی لەسەر ئاستی رووی دەریادا نزیکەی ١,٠٠٠ پێیە.

ناوچەکە رووبەری نزیکەی ٨٠ X ١٠٠ مەتر دەگرێتەوە و پێشدەچێ پاشماوە پارچە بەردی (debris) بە قوولّی پتر لە -٢- مەتر هەبێت.

گۆڕستانێکی لە چاو نویش عەرزی باشووری گردەکە دادەپۆشێت.

گردی عەلیاغا دەکەوێتە ناوچەیەکی هەردەی (Rolling) گردە زورگاوییەکان و سەکۆی رووبارەکانەوە.

بە تێڕوانین لە بەرزی رەها، هەرێمی ئێستا بنارە، بەلاّم لەرووی تۆپۆگرافی گشتی و بارانبارینەوە تاڕادەیەکی زۆر لە ناوچەی گردە بنارییەکان دەچێت.

لای راستی زێی کتومت بەرامبەری عەلیاغایە کەندێکی تاڕادەیەك ستوونی زورگاویە، ١٠٠ پێ بەرزە، کە بەرەو باکوور شاخەکانی زنجیرەی ئاکرێ دەردەکەون.





کتومت لە باشووری گوندی گرد مەمك-دا، وادی فراوانی بەستۆرە چای بەزێ دەگات، ئێستاکە وادییەکە لە نزمترین درێژبوونەوەکانیدا تەنها لە ماوەی وەرزی بارانبارینەدا ئاوی تێدایە. کەتەلۆگی مەتریاڵە شوێنەوارییەکانی کورتە تاقیکردنەوەی عەلیاغا ئاماژە بە قۆناغێکی کەلچەری تارادەیەك هاوشێوەی کەتەلۆگی چینەکانی سەرەوەی چەرمۆ یاخود چینە بنچینەیەکانی تەل حەسوونە، دەدات.

## قەڵای چەرمۆ و شوێنە هەڵنەکۆڵدراوەکانی گەرمێن

دەشتی نێوان شاخان (intermontane)ی چەمچەماڵ دەکەوێتە نێوان زنجیرەکانی کانی دۆملان — جەبەل تەسك و کانی شەیتان حەسەن — سەگرمە داغ و نزیکەی ١٠ مایل پانە و ٣٥ مایل درێژە، تەوەرەکەشی لە باکووری ڕۆژئاواوە بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتە. ڕێگەی سەرەکی لە کەرکووکەوە بۆ خودی شارۆچکەی چەمچەماڵ نزیکەی ٢٨ مایلە، کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای ناوەڕاستی دۆڵەکە و نزیکی حەوز (water shed)ی باکووری ڕۆژئاوا — باشووری ڕۆژهەڵاتی دۆڵەکە.

ڕووی عەرزی دۆڵەکە درێژبوونەوەی فراوانی لیتەی تێدایە، جاربەجاریش بەهۆی زنجیرە ناسەرەکییەکانی چینە بەردی بەرچاوەوە داپچڕدەبن (p1. 8)، بەڵام کێڵگە سەوزە فراوانەکانی ڕووی عەرزی لیتەیی بەشێوەیەکی جدی بەهۆی ئەو دۆڵە قووڵانەوە بەش بەش دەبن، کە لە تەلانە باڵانەکانی زنجیرەکەی ترەوە دێنە خوارێ (Wright, 1952). کەمێك لەم وادانە ئاوەڕۆی هەمیشەیین" زۆرترینیشیان کانیاو و ئەو ئاوگانەیان هەیە، کە سەرچاوەکانی ئاوی چوار وەرزی ساڵن.

شوێنی چەرمۆ دەکەوێتە سەر یەکێك لەم شیوانەوە (وادی)، چەمی گەورە، حەوت میلێك لە ڕۆژهەڵاتی چەمچەماڵەوەیە، لەنێو ئەو بەشەی شیوەی ئاو لەبەر ڕۆیشتنە (drainage) دایە، کە لە کۆتای باشووری ڕۆژهەڵاتی دۆڵەکەوە دێتە خوارێ: لە دەوری ٣٥° ٣٣° باکوور، ٤٤° ٥٧° ڕۆژهەڵات" بەرزی لەسەر ئاستی ڕووی دەریادا نزیکەی ٢,٥٠٠ پێیە.

قەبارەی ئێستاکەی نزیکەی ٩٠ X ١٤٠ مەترە و قوڵی نیشتووشی لە بەرزترین خاڵدا لە سەرووی -٧- مەترەوەیە.

رایت (Wright) باوەڕی وایە بەشێکی تەواوی گردە ئەسڵییەکە ڕەنگبێ بەهۆی ئاوەڕۆی شیوەکەوە داماڵرا بێت.





کەتەلۆگی مەتریاڵە شوێنەوارییەکان ئاماژە بە شوێنێکی زۆر کۆن، بەڵام گوندێکی تەواو پێگەیشتوی کۆمەڵی جوتیاری دەدات.

شوێنەکە کۆمەڵێك قۆناغی نیشتەجێبوونی ڕۆنانسازی ( Architectural levels of buildings) و نۆژەنکردنەوەکانیان، هەروەها قاپ و ئامانی گڵێنەی کرێت (Coarse) تەنها لە سێ چینی سەرەوەی نیشتەنییە کەڵەکە بووەکەدا دەرکەوتن، پێکدەهێنێت.

ئەمانە چەند تایبەتمەندییەکی جیا کاریان لەگەڵ گڵێنە (Pottery)ی چینە بنچینەییەکانی قۆناغی حەسوونەدا هەیە.

لەکاتی ڕووپێوی لە دۆڵی چەمچەماڵدا دوو شوێنمان بەرێکەوت دۆزییەوە، کانی سوور (بە مایلێك کەمتر لە باشووری چەرمۆیە) و خورە نەمك (دەوری ٣ مایل لە باکووری ڕۆژهەڵاتی چەمچەماڵەوەیە) ئەو مەتریاڵانەی سەر ڕوویان خستە بەردەست، کە پێدەچن تارادەیەك هاوڕێکی مەتریاڵەکانی چەرمۆبن.

شوینێکی کاریگەرتر، کە جگە لە کۆکردنەوەی مەتریاڵەکانی سەر ڕووی عەرز هێشتا تاقینەکراوەتەوە — خەرابە قەرە چوار- ە، دەکەوێتە سەر قەراخی چەپی تۆق چای سەروو، کە ئاوەڕۆی سەرەکی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاو لەبەر ڕۆیشتنی دۆڵی چەمچەماڵە.

ئەم شوێنە تەپۆڵکەیەکە لەسەر گردێکی زورگاوی، کە نزیکەی مایل و نیوێك لە خوارووی گوندی قەرە چوارەو ٢٨ مایلێکیش لە باشووری ڕۆژئاوای چەرمۆیە.

لێرەشدا، تۆق چای کاتێك زنجیرەی جەبەل تاسە دەبڕێت بەرەو بنار (Piedmont) پێچ دەخواتەوە.

بەڕێز سەبری شوکری لەماوەی ڕووپێوانەکانی پێشتری خۆیدا ئەم شوێنەی دۆزیبووەوەو ڕێنوێنی ئێمەشی کرد بۆ ئەو شوێنە" هیوامان وایە لە ماوەی وەرزی دیتنکاری داهاتوومان لە عیراق ئەم شوێنە تاقیبکەینەوە.

بەڵگەکانی سەر ڕووی عەرز ئامێر و ئامرازی جۆرا و جۆر دەگرنەوە، ڕوونیش نییە ئاخۆ کۆمەڵگەی گشتی زۆر جیاوازتر لەگەڵ کۆمەڵگەی چەرمۆ یان لەگەڵ ئەوانەی ئاسۆی گشتی مەلفەعات، کەریم شەهر و گردی چای، بدۆزرێنەوە.

هەڵسەنگاندنمان لەبارەی بەڵگەی سەر ڕووی عەرزەوە تارادەیەك ئارەزوومان بەرەو دەرکەوتنی ئاسۆ گشتییەکەدا دەبات.

ئەو پارچە گلێنە کرێتانەی، کەوا پێدەچوو لە شێوەی حەسونەبن لەسەر کەند (talus)ی داشۆراوی دوو گردی تەپۆلکەی گەورەتر: تەل سەرگەردن و تەل ئیبراهیم، لە باکووری رۆژئاوای چەمچەماڵدا دەرکەوتن. ئەم دوو تەپۆلکانە، لەگەڵ دەرکەوتنی سیرامیکەکانی سامەڕا و حەسوونە لە چاڵی تاقیکاری نێردەی دوکانی دانیمارکی لە گردی شمشارەدا تێبینیان لەبارەوە درا (Ingholt, 1957)، پێشنیار دەکەن، کە چەند لایەنێکی قۆناغی حەسوونە بە تەواوی لە ناوچەی بناردا قەتیس نەبووە.

چین چینکردن (Stratification) لە گردی شمشارەدا لەگەڵ مەترپاڵەکانی وەك چەرمۆدا ئەو ریزبەندییەی دڵنیا کردەوە، کە لە چینەکانی سامەڕا — حەسوونە کۆنترن.

## گردی مەلفەعات

ئەم گردە بچووکە دەکەوێتە سەر گردێکی زورگاوی راستەوخۆ لە باکووری رێگەی هەولێر — مووسڵدا، کتومت لە رۆژئاوای پردی مەنگوبە لەسەر رووباری خازردا (P1. 6B) و تەنها چەند مەترێکی کەم لە باکووری پۆپەی ئەل — خاندایە (بڕوانە پێشووتر): بە نزیکەی ٣٦° ١٨°ی باکوور، ٤٣° ٣٣°ی رۆژهەڵات، بەرزی لەسەر ئاستی ڕووی دەریادا نزیکەی ٩٥٠ پێیە. وا دیارە ئەم گردە رووبەری نزیکەی ٩٠ X ١٢٠ مەتر داپۆشێت و قووڵیشی لە مەتر و نیوێك ١,٥ زیاترە (لە ژێر ئەو چینەی تاقیکردنەوەکانمان لە بارەی پۆپەی گردەکەدا نەکران).

گردە زورگاوییەکان و سیستەمی بەردە کلسیش لە جەبەل مەگلوبەوە بۆ جەبەل عەین ئەل سوفلا کتومت لە باکووری مەلفەعات" خازر-دا خێراتر دەبن، کە ئاوەڕۆیەکی چوار وەرزی ساڵ بەردەوامە و بە بڕێك ئاو گردەکان دەبڕێ و لەم خاڵەدا دەگاتە دەشتی ولاتی ئاشوور.

لە واقیعدا، هەریەك لە مەلفەعات و ئەل — خان دەکەونە سەر سنووری نێوان بنار و ناوچەی گردە بنارییەکان، لە شوێنێکدا، کە خازر پەڕینەوەی تێدا ئاسانە (واتە تەنکاوە).

بەرەو باشوور و رۆژئاوای هێرەکە لەوەڕگاکانی دەشتی ئاشوور هەن — لە راستیدا، ئەو بەشەی دەشتەکە بەدەشتی گوگەمێلا ناسراوە (کە ئەلیگزەندەر (ئەسکەندەر) دارای تێدا تێکشکاند).

شوێنەکە (Concrete – faced machine gun emplacement)ێکی هەیە لە قایمکاری جەنگی جیهانی دووەمی پردەکە و شوێنی پێدا پەڕینەوە (ford) بەجێماوە" شوێنی سەنگەری تانکەکانیش لە رۆژئاواوە دەوری شوێنەکە دەدات و کاولی (ruin) قولەغی بچووکی ( Small barrack)ی تێدا ئۆقرەگرتنیش لە نێوان گردەکە و قەراخی رۆژهەڵاتی رووبارەکەدا ماونەتەوە.



کەتەلۆگی شوێنەواری مەلفەعات — هەروەك دەرئەنجامی تاقیکردنەوە زۆر سنووردارەکەمان پێشانیدا — ئاماژە بە کیتی ئامرازی بەردەستێیەك دەدات زۆر کەم لە کیتەکانی گردی چای و کەریم شەهر جیاوازە، هەروا تاڕادەیەکی زیاتریش لە — ئامرازی جونییە گەورەکان ( large ground stone)ی هەریەك لەو شوێنانەی تیایاندا دەرکەوتن، جیاوازە.

دوای یەکێك لە چاڵەکانی تاقیکردنەوە پێنج چینی نیشتەی بە قووڵی زیاتر لە ١,٥م دەرخست، پێدەچوو مەلفەعات نشینگەیەکی تاڕادەیەك بەردەوامبوو بێت.

هێژ شوێنەواری رۆنانسازی سەرەتایی هەن. لەبەرئەوە بەشێوەیەکی سەرەتایی مەلفەعات-مان وەك شێوەیەکی زۆر سەرەتایی گوندێکی بچووك مەزەندەکرد( **Braidwoodet. Ol 1954** ). دوا مەزەندەکردنیش پشت بە دۆزراوەی فراوانتری لە رێگەی هەڵکۆڵینەوە و هەروا بەو تێڕوانینانەش ببەستێت، کە رەنگبێ لە رێگەی کاری سولیکی (Solecki) (١٩٥٧) لە زاوی چەمی شانەدەر-دا بەدەستبهێنرێن.

دووەم شوێن (زاوی چەمی) لەسەر زێی گەورەیە لەبناری برادۆست داغ (شاخ)دا و لە ئەشکەوتی شانەدەریش نزیکە، (واتە) ١٥ مایلێك لە باکووری رۆژهەڵاتی ئاکرێ.

زاوی چەمی هەمان شیوەی (Complexion) گشتی سازکاری بەردەستێی ( Flint industry) وەك ئەوانەی لە مەلفەعات و کەریم شەهر و گردی چای دۆزرانەوە، خستە بەردەست و وەك مەلفەعاتیش شوێنەواری رۆنانسازی (Architecture) سەرەتایی هەیە.

## کەریم شەهر و شوێنە بەر ئەگەرە هەڵنەکۆڵدراوەکانی گەرمێن

کۆنترین شوێنی والای لەهەر رووبەرێکی گرنگدا لە رێگەی هەڵکۆڵینەکانمانەوە دۆزرابێتەوە، شوێنێکە لەسەر ترۆپکی کەندێکی لیتەیی بەرز لە کەریم شەهردا (pls. 9A)، نزیکەی میلێك لە رۆژهەڵاتی چەرمۆوەیە لەسەر قەراخی راستی چەمە — گەورە، کە لە خوار چەرمۆ هەڵدەقولێت (Braidwood, 1951 C, pp. 13-15: 1952 a, pp. 24, 26, 27) رووبەرەکە، کە نیشانەی دیاردیدانی سەر عەرزی نشینگەیەکی لە کەریم شەهردا هەیە بە نزیکەی ٦٠ X ٧٠ مەتر پێوانە دەکرێت.





بێگومان چینە نیشتەجێبوونە لە چاو تەنکەکەدا (thin) لەگەڵ رووی عەرزی ئێستادا لەسەر ترۆپکی بەرزاییەکەدا هاو شوێنە (هاوکاتە)، تەلانە رووپۆشێکی تەنکی داشۆراوی هەیە لە ئەستووری سەر لای بەرەو بنکی (down – slope)ی هەڵکۆڵینەکاندا دەگاتە ٣٠ سم.

هەروەها بە درێژایی رووی کەندە داڕووتاوەکە چەند خزانێك هەبوو، وەك چەرمۆش، رەنگبێ بەهۆی داڕووتان بە درێژایی رووی کەندەکە بەشێکی نادیاری باش لە دەستبدات.

هەماهەنگییەکان نزیکەی ٣٥° ٣٣°ی باکور، ٤٤° ٥٨° رۆژهەلاٌت، بەرزیشی لەسەر ئاستی رووی دەریادا نزیکەی ٢,٦٠٠ پێیە.

کەریم شەهریش وەك چەرمۆ دەکەوێتە دۆڵی نمونەی نێوان شاخانی چەمچەماڵ، زنجیرەی کانی شەیتان حەسەن — سەگرمە داغ کتومت لە رۆژهەلاٌتی کەریم شەهرەوە بە تەواوی دیارە.

کەتەلۆگی مەتڕیاڵە شوێنەوارییەکانی کەریم شەهر بەزۆری تیغی بەردەستێکاری ( Flint blade industry) و چەند کەل و پەلێکی بەردی داتاشراو (ground stone) بوون، بەلاٌم تەنکی نیشتەنییەکەی پێشنیاری ئەوە دەکات، کە کەریم شەهر کۆمەڵی لادێی جووتیاری نەبووە بەڵکو کامپێکی کاتی (یان زنجیرە کامپێکی چەند جار دووبارە بووەوە)ی تاڕادەیەکی سەردەمە زووترەکان بووە.

دوو شوێنی دیکەی والاٌی سەرنج راکێش لە هێڵەکەدا، کە بەلایەنی کەمەوە کۆنن، تورکەکەو کەوری خان، لە ماوەی رووپێوی سەر رووی عەرز لە نزیکی چەرمۆ لە ١٩٥٠دا دەستنیشانکرابوون (بڕوانە ل).

شتومەکە دەرکەوتووەکانی تورکاکە لە ئامرازی تیغی بەردەستێی دیاریکراوی پەرشو بلاٌوی سەر رووی عەرز و ئامرازی بەردی وردی بچووك (Microliths) پێکهاتبوو، لەسەر گردێك لەلای قەراخی چەپی چەمی گەورەدا، بە نزیکەی نیو مایل لە باکووری رۆژهەلاٌتی چەرمۆدا.

ترۆپکی گردەکە وەك ترۆپکی چەرمۆ لە رووبەردا تەواو بەرفروان نییە، رووبەری تورکاکە شێوەی کەوانە نییە (Cresent – shaped) و لە نزیکی شیوێکی بچووکدایە، کە لە کانییەکی بچووك لە بەردێکی شۆڕبووەوە هەڵدەقوڵێ (دەرژێ).

دەرکەوتنی شتوومەکەکانی کەوری خانیش لەسەر گردێکی شێوە زنجیرەی بچووك بوو، کە کلکەیەك (Promontory) لەنێوان هەردوو لقی چەمی چەلگە (ئەو شیوەی کە لە خوار





گوندی چەلگەوە هەڵدەقوڵێت) دروستدەکات، هەروا گوندەکە بە مایل و نیوێك کەمتر دەکەوێتە رۆژئاوای چەرمۆوە.

خانێکی کاولبوو (ئەوپەڕی چەند سەدەیەك کۆنە، رەنگبێ قۆنگرەیەکی سەردەمی عوسمانی بێت) دەکەوێتە سەر گردێکی نزمتر کتومت لە باشووری زنجیرەکەدا.

کەل و پەلە پەرشو و بلاٌوبووەکانی سەر عەرزی ئێرەش لە تیغی بەردەستێکان (Flint blade) و تێغۆکە (bladelet) بەبێ هیچ مەتڕیاڵێکی تر، پێکدەهات.

هاو (Howe) پێیوایە، کە هەردوو گرووهی ئەم مەتڕیالاٌنە رەنگبێ تاڕادەیەك لە گرووهی مەتڕیاڵەکانی کەریم شەهر کۆنتربن.

## گردی چای

شوێنی نیشتەجێبوون لەسەر گردێکی زورگاوییە لە گردی چایدا، لە قەراخی چەپیەوە بەسەر زێی گەورەدا دەنواڕێت، نزیکەی نیو مایلیش لە رۆژئاوای گوندی گرد (مەمك)ە، شوێنەکە لە هەمان کاتی گردی عەلیاغا تێیدا تاقیکرایەوە، (بنواڕە پێشتر).

رەوش و هەماهەنگییەکانی شوێنەکە زۆر هاوتەریبی رەوش و هەماهەنگییەکانی عەلیاغان.

تاقیکردنەوەکەمان ماوە کورتبوو" لەکاتێکدا شوێنەکە ئامرازی بەردەستێکاری ( Flint tool industry) زۆر نزیکی هاوشێوەی ئەوانەی کەریم شەهر-ی خستە بەردەست، پێمان وابوو شوێنەکە بە چاڵی هەڵگرتنی دانەوێڵەی سەردەمەکانی دواتر کونکونکراوە و شوێنەوارەکانی نیشتەجێبوونی سەردەمی ئیسلامی نێوەڕاست و پێدەچێ شوێنەواری قۆناغەکانی کەمێك کۆنتریشی تێدا بووبێت.

بۆ بە تەواوی لەبەریەك هەڵوەشاندنی شوێنەکەش (untangle) کاتی زۆری دەخایاند، هەروەها پێشبینیمانکرد، کە رووپێوانی زێتر بەدڵنیاوە شوێنی دیکەی هێڵی ئەو سەردەمە دەردەخات، کە بەهۆی نیشتەجێبوونی دواترەوە پیسنەکراون (واتە خەڵکیان تێدا نیشتەجێنەبووە).

## ئەشکەوتی پەلگەوەرە

ئەم پەناگە بەردییە (Rock Shelter) (p1. 10B) لە زنجیرەی بەرانان داغ-دا، کە دەوری لای باکووری رۆژهەڵاتی دۆڵی نێوان شاخانی نموونەیی بازیان دەدات، ئەو پەناگەیە ١٤ مایلێك لە باکووری رۆژهەڵاتی چەرمۆوەیە: نزیکەی ٣٥° ٣٧°ی باکوور، ٤٥° ٩°ی رۆژهەڵات، بەرزیشی لەسەر ئاستی رووی دەریادا نزیکەی ٣،٢٥٠ پێیە ( Braidwood, 1951 c, pp. 13, 14; 1952a, pp. 23, 24, 26, 27). پەناگە دەکەوێتە خوارووی گوندی سلێمانی گرد، لە نزیکی رووبارێکی بچووك لە لایەکی دۆڵی زنجیرەی بەرانان دایە" پەناگە کە بەرووی باشووری رۆژهەڵاتدا دەکرێتەوە و نزیکەی ٧٠ مەتر لەسەر ئاستی دەشتی بازیانە، کە لە ئەشکەوتەکەوە دەکرێ سەیری شوێنێك بکرێ لەسەر رێگەی سەرەکی چەمچەماڵ — سلێمانیدا. دۆڵی بازیان زۆر لە دۆڵی چەمچەماڵ بچووکترە، تارادەیەکیش بە ئاوترە و زۆریش پارچە پارچە نابێت.

تێڕوانینێکی تەواوی سەرنج راکێش لە دەمی (زارك) پەناگەکەوە (دەردەکەوێ) بەسەر بەشی باشووری رۆژهەڵاتی دۆڵی بازیان و ئەو زنجیرانەی دەوریدەدەن، دەنوارێت. دەرکی ئەشکەوتە کە ٣ مەتر بەرزە.

ناوەوەشی ئەوپەڕی بەرینی نزیکەی ٦ مەترە و لە دەمی ئەشکەوتەکەشەوە تەنها ٥ مەتر بەرە و دوا درێژ دەبێتەوە، بۆیە گشت بەشەکانی پەناگەکە تیشکی خۆریان دەگاتێ.

قولایی نیشتەنییەکە دەرکەوت نزیکەی ٢ مەترە. دروستکراوە دەستکردەکان (artifactual)ی لە چینی شڵەژاوی سەرەکیدا دەردەستکەوتن تارادەیەك بە تەواوی لە ئامرازی بەردەستێی پارچە پارچەکراو (Chipped flint tools) قەتیس دەبن.

پیشەکاری لە رێگەی ئەم ئامرازانەوە دەرکەوت وا دەردەکەوێ گوزارشت لە سەردەمێکی پەرەسەندووی تەقلیدی زەرزیانی سەردەم درەنگتر لەوانەی گاروود (1930) وەسفیکردون، بکات.

## ئەشکەوتی باراك

ئەم ئەشکەوتە قایلترینی گرووپێکی ئەو پەناگە بەردیانە بوو، کە راستەوخۆ لە رۆژهەڵاتی گوندی جۆنە تاقیکرانەوە، ٣ مایلێك لە رۆژهەڵاتی شارۆچکەی ئاکرێ، لەسەر رۆخی باشووری زنجیرەی ئاکرێدا: نزیکەی ٣٦° ٤٥°ی باکوور، ٤٣° ٥٨°ی رۆژهەڵات، بەرزاییشی لەسەر ئاستی رووی دەریادا ٢،٦٥٠ پێیە. زارکی پەناگە کە (p1. 11A) بەرامبەری باشووری





رۆژئاوایە، بەڵام لە سەکۆکەوە درێژبوونەوەی فراوانی گردەکانی سەرکۆتای رۆژهەڵاتی دەشتی ئاکرێ بە تەواوی دیارە.

پەناگەکە لە رۆخی چەپی لایەکی دۆڵی بەرەو زنجیرەکە دەڕوات، دایە" دۆڵەکەش ئاوەڕۆ و کانیاوی هەیە.

پەناگەکە نزیکەی ١٢ مەتر بەرینە و لە پشتی زارکەکەیەوە بەرەو کەڤەرەکە ٨ مەتر دەکشێت، بەڵام پاشماوەی کۆنی ساچمە (debris)ی ژیان تەنها لەسەر کەندەکە (talus)دا چڕ بۆتەوە. هەرچەندە کەل و پەلە دەردەستخراوەکان کەمن، بەڵام بڕی سەرنج راکێشی سازکاری تیغی بەردەستی (Flint – blade industry)، لە رووی پەرەسەندنی چەشنی ئامرازە بەردییەکان (Typology)ەوە هی سەردەمی زەرزین.

## ئەشکەوتی حاجییە

ئەم پەناگە بەردییە یەکێکە لەو گرووپەی لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارەوە بەسەرنجی ئێمە سپێردرا.

ئەو پەناگەیە دەکەوێتە ناوچەیەکی داراوای کتومت لە رۆژهەڵاتی گوندی بیبە لەسەر رۆخی چەپی دۆڵێکی بەرتەسکدا، کە لە گوندی بێخمە لە رۆیشتنی زێی گەورە لە گەرووی بێخمەوە، دەکرێتەوە: نزیکەی ٣٦° ٤٢°ی باکوور، ٤٤° ١٣°ی رۆژهەڵات، بەرزیشی لەسەر ئاستی رووی دەریادا ٢،٣٥٠ پێیە.

حاجییە پەناگەیەکە ٧-١٢ مەتر بەرینە و ٢٤ مەتریش بەرەو نێو کەڤەرەکە دەکشێ.

زارکەکەی بەرامبەری باشوورە (p1. 11B)" لەکاتێکدا هیچ بەشێکی نێو ئەشکەوتەکە لەماوەی کاتەکانی رۆژدا بەتەواوی تاریك نییە، ئەوەش تا ئەوپەڕی راسترین شێوە ئەشکەوتی هەریەك لە ناوچەکانمانە.

لەژێر هەلومەرجەکانی ئێستادا، ئاو لە کانییەکی سەر رۆخی بەرامبەری دۆڵەکەدا هەیە و نزیکەی نیو میلێك دوورە و لەبەردەمی ئەشکەوتەکەشدا تەنها خودی دۆڵە بچووکەکە و رۆخی بەرامبەری دیارە.

تاقیکردنەوەکانمان لەنێو ئەشکەوتەکەدا هیچ چینێکی بەسەریەکدا نیشتووی گرنگی شوێنەواری نەخستە بەردەست، بەلاَم چاڵی ناوەڕاستی ڕێگەی تەلانە سەختەکە (talus slope) لەبەردەمی ئەشکەوتەکەدا ئامرازی بەردەستێکاری (flint – tool) جۆری زەری دەرخست، بەلاَم ئەوەندە هەیە بە تێکەڵەیەکی سواڵەتەکانی (potsherd) سەردەمی ئیسلامی و پێش ئیسلامییەوە.

## ئەشکەوتی کاوانیان

پەناگەیەکی بچووك لەسەرووی گوندی کاوانیان، زیاتر لە ٢ مایل لە باکووری ڕۆژئاوای شەقلاَوە لەسەر ڕێگەی سەرەکی شەقلاَوە — هەولێردا، بەماوەی ڕۆژ و نیوێك تاقیکرایەوە، بەلاَم بەهۆی تەنکی (Shallow) نیشتەکە و دەردەستکەوتنی کەل و پەلی بێ کەڵك وازی لێهێندرا.

ئامرازی بەردەستێی جۆری زەرزی لەبەر تەلانە سەختەکەدا (down the talus slope)دا بە پەرش و بلاَوی دەردەکەوتن.

## ئەشکەوتی بابەخەل

ئەم پەناگەیە یەکێکە لە گرووهێك پەناگە لە کلکەی (spur) زنجیرەی برادۆست، کە ڕاستەوخۆ بەرەو باکووری گوندی هاودیان بەرز دەبێتەوە، لەسەر ڕۆخی ڕۆژئاوای دەشتی دیانە.

بابەخەل لە دۆڵی نێوان کلکەکە (spur) و زنجیرەی سەرەکی برادۆستدا بەرەو باشووری ڕۆژهەلاَت دەبێتەوە و بەسەر دەشتەکەدا نانوارێت: نزیکەی ٣٦° ٤٢° باکوور، ٤٤° ٢٨°ی ڕۆژهەلاَت، بەرزیشی لەسەر ئاستی ڕووی دەریادا نزیکەی ٢,٥٠٠ پێیە، ئەم پەناگەیە لە هەموو پەناگەکانی ترمان کراوەترە، چینی نیشتەنی دەکەوێتە نزیکایەکی — تەنیشت ڕووی ستوونی کەندەکە و تەنها بە نزیکەی مەترێك لە پشتی ڕەوەزکەیەوە (Overhang) بەرەو پەناگەکە (Rock) درێژ دەبێتەوە" ئەو شوێنە ڕەنگبێ باشترین ئەو شوێنە والاَیانە بێت، کە خەڵکیان تێدا نیشتەجێبووە.

لە دەوروبەری سوچی بنکی کلکەکەدا ڕاستەوخۆ ئاو هەیە.

بابەخەل دوو چینی شوێنەواری دەرخست.





چینی سەرەوەیان تەنك بوو، هەروا جۆری زەرزی ئامرازی تیغ کاری تێکەڵ بە هەریەك لە مەترپاڵەکانی کۆنتر و نوێتری تێدابوو.

چینی خوارەوەشیان ئامرازی تەلاَشکاری بەردەستیێ (Flint flake – tool) جۆری موسەتێری ئەوانەی لە هەزار مێرد (Garrod, 1930) و ئەشکەوتە دیاریکراوەکانی تردا دەرکەوتن، تێدابوو (بڕوانە پێشتر).

لە گوندی هاودیاندا پراکتیسێکمان تێبینی کرد، پێدەچێ ئەوە ڕوونبکاتەوە، کە بۆچی ساچمەی شوێنەواری زۆر کەم لەنێو هەندێك ئەشکەوتە گەورەترەکانی وەك باراك و حاجییەدا بەجێ ماوە. پەناگەی گەورەی هاودیان بەسەر گوندەکەدا دەنوارێت و دەشکەوێتە بەشێکی ئەو کلکە شاخەی، کە ڕاستەوخۆ بەرامبەری دەشتی دیانەیە، پەناگەی بابەخەل-ی بچووکتریش لە دەوروبەری شوێنی کلکەکەیە بەرەو ڕۆژئاوا. کاتێك لە گوندی هاودیان نزیك کەوتینەوە بۆئەوەی تاقیکردنەوەکانمان دەست پێبکەین، بەبینی دووکەڵێك لەپە ئەشکەوتی گەورەی هاودیان دەهاتە دەرەوە، سەرمانسوڕما.

لە کاتی گەیشتنمان بە ئەشکەوتەکە دانیشتوان پێیان گوتین، کە چینی ساڵانەی زبڵی مەڕو بزن (کشپل Dung)ی سەر عەرزی نێو ئەشکەوتەکە دەسوتێنرێ. تەواوی عەرزی نێو ئەشکەوتەکە بەچرە دۆکەڵی شینی ئاگرەکە قانگ (aglow) درابوو.

ئەوەش ڕوون نەبوو ئایا بەشێوەیەکی سادە مەبەست پاککردنەوەی عەرزەکە یان بیرێکی گەرمکردنی پەناگەکە بووە، کە بۆ زستان باش بەکار نەهاتبوو.

کاتێك ئاگرەکە دامرکا، پێیان گوتین، کە دەبێ عەرزەکە ڕابماڵرێت و ڕووی زبری دیوارەکەش لەلایەکەوە بۆلایەکی تری ڕووی پەناگەکە دەبێت نۆژەن بکرێتەوە بۆ ئەوەی بتوانرێ لەماوەی زستانی داهاتوودا مەڕو بزن دابکرێنە ئەوێ.

گەر سووتان و ڕامالێنی لەم چەشنەش بۆ هەزاران ساڵ بەردەوامبوبێت، ئەوا ئەو کارانە ئەوە ڕووندەکەنەوە بۆچی ساچمەی شوێنەواری کەم لە هەندێك لە پەناگە فراوانترەکاندا بەجێ دەمێنن.

هەڵکۆڵینی تاقیکردنەوە (Sounding)ی دواتریش لەبەردەم دەرگای پەناگەی گەورەی هاودیاندا بە تەواوی بێ بەرهەمبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە تەلانی سەختی خوارەوەدا ئامرازی بەردینی وورد و بچووك (Microliths) دەرکەوتن (Field, 1956, p. 15).

## ئەشکەوتی سپیلك

ئەم پەناگەیە دەکەوێتە شوێنێك لە ڕێگەی شەقلاوە – هەولێرەوە لەسەرتاسەری دۆڵەکەدا بە تەواوی دیارە، ٦ مایلێك لە باکووری ڕۆژئاوای شەقلاوەوەیە: نزیکەی ٣٦° ٢٤°ی باکوور، ٤٤° ١٦°ی ڕۆژهەلاَت، بەرزیشی لەسەر ئاستی ڕووی دەریادا نزیکەی ٢,٨٠٠ پێیە.

ئەم ناوچەیەش ولاَتی کورتە بەڕوو (تەڕاش scrub – oak)ە" دۆڵەکەش لە هاوین و پایزێکی زوودا وشکە، بەلاَم کانی نزیك لەو دەوروبەرە هەن.

پەناگەکە ڕووی لە باکوورەو بەهۆی زنجیرەکانی لە دەوری دۆڵەکەدا پێچ دەخۆن دەپارێزرێت (واتە قایم دەبێت)" بەرینی ئەشکەوتەکە نزیکەی ١٥ مەترەو ٨ مەتریش بەرەو نێو پەناگەکە (Rock) دەکشێت، سەرەڕای دوو مەزەلّی ڕۆندراوی چیایی بەر تەسك، کە هەریەکێکیان بە نزیکەی ٨ مەتر زیاتر بەرەو ژوورەوە درێژ دەبنەوە.

لەژێر چینی ئەستوورتری زبڵی ئاژەڵان و ساچمەکانیشدا تەنها سوالەت (potsherd)ی نوێی دەستکرد هەن، لەناکاویشدا ئاسۆیەکمان دۆزیەوە، کە ئامرازی تەلاَشی بەردەستێی (flake tool) جۆری موستێریانی خستە بەردەست هەروەك لە هەزار مێردا بینران (Braidwood, 1956 b).

پیشەکاری موستێریانی جۆری گشتی لەم هەرێمەدا پێش سپیلك و بابەخەل لە ئەشکەوتی هەزار مێردا دۆزرایەوە (Garrod, 1930)" زانیاری لەبارەی ئەم ئەشکەوتەش بەم دوایانە لەلایەن سولیکی (١٩٥٥ و ١٩٥٧)، لە چینی (D) ئەشکەوتی شانەدەردا، کە تێیدا ئێسکە پەیکەری مرۆڤی نیاندەرتاڵ (neandertaloid) دۆزرانەوە، درێژەی پێدرا.

## جەمسەری تەلەگراف ٢٦ / ٢٢ و سەرەندور

پیشەکاری کرێتی موستێری لە کۆکراوەیەکی تێکەڵدا لە دوو شوێنی والاَی دۆزراوە لە ماوەی ڕووپێویەکەماندا، دەرکەوت: لە جەمسەری تەلەگراف ٢٢/٢٦ کتومت لە ڕۆژئاوای چەمچەماڵ و لە کلکەگردیکدا پێی دەگوترا سەرەندور لەسەر ڕۆخی ڕاستی بەستۆرەدا، کە مایلێك لە ڕۆژئاوای ڕێگەی هەولێر – شەقلاوەوەیە.

گارۆود (1928) لە ساڵی ١٩٢٧دا چەند ئامرازێکی کەمی کرێتی تاڕادەیەك شیاوی بەراوردکردنی لە زوورگەکانی نزیك کەرکووکدا دۆزیەوە. لایەنی گشتێندراوی هونەری پەرەسەندنی چەشنی ئامرازە بەردییەکان (techno – typological) دەرکەوتنی ئامرازەکانی ئەم سێ شوێنە والاَیانە لە ئامرازە وورد و دروستەکانی هەزار مێردو ئەشکەوتەکانی دیکە جیاوازە.





## بەردە بەلکە و شوێنە بەر ئەگەرە هەڵنەکۆڵدراوەکانی گەرمێن

بەردە بەلکە لە ساڵی ١٩٤٩ لە ماوەی ڕووپێوانێکدا لەلایەن دکتۆر ناجی ئەل ئەسیل و بەڕێز فوئاد سەفەر، کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارەوە نێردرابوون، دەستنیشان کرابوو (Asil, 1949).

هاو و رایت لە ١٩٥١دا لەجیاتی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئەو شوێنەیان هەڵکۆڵی ( wright and Howe, 1951). بەردە بەلکە شوێنێکی والاَیە، کە ئامرازە بەردییەکانی لە گاشەبەرد (gravels) تایبەتی پلایستۆسینی دیاریکراو لەسەر تروپکی گردێکدا و تاڕادەیەکیش تێکەڵ بەنێو (brecia) پاشماوەی ستونێکی سروشتی جیاوازی هەمان ئەو سیستەمە گاشەییە ( P1. 9B) پێکهاتووە، کە یەکەم جار سەرنجی بۆ شوێنەکە ڕاکێشا.

شوێنەکە ڕاستەوخۆ لە باشووری ڕێگەی سەرەکی چەمچەماڵ – سلێمانی دایە، ٢ مایل لە باکووری ڕۆژهەلاَتی چەمچەماڵ لە ولاَتێکی گردەلاَنیدا، کە لایەکی لقێکی گەورەی دۆڵی لقی چەمچەماڵی سەرچاوە سەرەکییەکانی تۆق چای دروستدەکات: نزیکەی ٣٥° ٣٣°ی باکوور ٤٤° ٥٢°ی ڕۆژهەلاَت، بەرزیشی لەسەر ئاستی ڕووی دەریادا نزیکەی ٢,٢٥٠ پێیە.

دەردەستخراوەکانی ماوەی سێ ڕۆژی هەڵکۆڵین لە ئامرازی کرۆکی دولا (Core – biface)ی جۆری ئەشولیان و ئامرازی گاشە (pebble tool) و تەلیشی بەکارهاتوو ( Utilized flakes) پێکدەهات.

بێگومان ئەم ئامرازانە کۆنترین مەترِیالّی چاخی بەردی کۆنن، کە تا ئێستا لە عیراقدا هەڵکۆڵدرابن.

دوو دەرکەوتنی دیکەی ئاسۆی بەردە بەلکە لە ماوەی ڕووپێوییەکەماندا لەبارەی دۆڵی چەمچەماڵدا دۆزرانەوە (بڕوانە ل. ). ئامرازەکان دەکەونە سەر ڕووی عەرزەکە، بەلاَم بەهەمان گاشە بەردە تایبەتییەکان کاریان تێکراوە.

لە چەمی بازاڕ، کە تێیدا لقە سەرەکییەکانی چەمچەماڵ و چەرمۆ بە یەك دەگەن، سێ مایلێك لە باشووری ڕۆژهەلاَتی چەمچەماڵدایە، دەستە بێور (Hand axes) و تەڵێشە ئامراز (Flake tool) دەرکەوتن.

هەروەها دەستە بێور ڕاستەوخۆ لەسەر تەلانی نزیك لە چەرمۆش دەرکەوتن.

# کۆمەڵگە شوێنەوارییەکان

پێڕۆی وەسفکردن هەروەك لە بەشی چوارەمدا لە نوێترینیانەوە بۆ کۆنترینیانە.

لێرەدا مەزەندەکردنمان لەبارەی ریزبەندی پەرەسەندنی چەشنی ئامرازەکانی (Typology) رووندەبێت، چونکە کەتەلۆگەکان بەزۆری سادە دەبن کاتێك لە ئالۆزترین شوێنی گوندەکانەوە بەرەو پەناگە بەردییەکان دەگەڕێنەوە.

## گرد بانەهیلك

هەڵکۆڵینە ئەزموونیەکان (Sounding)[1] لە چوار چاڵی مام ناوەندیدا کران (دوو چاڵی دیکەش، بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا مەترپاڵی شڵەژاویان خستە بەردەست، بەلاّم لە قوڵی تەنکدا وازیان لێهێنرا).

رووبەری گشتی دەرخراوی پشت قوڵی دەرەوە نزیکەی ٧٠ مەتری چوارگۆشە بوو. نزیکەی نیوەی ئەم رووبەرە گشتییە مەترپاڵی تێکەڵ بە گڵێنەی بە چەرخەی گڵکار دروستکراو و پارچە ئاسن، هەروەها گڵێنەی رەنگکراوی جۆری حەلەفی خستە بەردەست.

شوێنەوارە رۆنانسازییەکانیش لەم ناوچە تێکەڵەدا لە پاشماوەکانی خانووی لەبەر دروستکراو، کە پلانێکی راستیان هەبوو، پێکدەهاتن.

---

(١) خاتوو واتسۆن سەرپەرشتیاری راستەوخۆی هەڵکۆڵینە ئەزمونییەکان بوو، ئەمەی خوارەوەش لە تێبینییەکانی پوختە دەکەین.

خاتوو واتسۆن سەردانی مۆزەخانەی شوێنەواری حیتی لە ئەنقەرە لە حوزەیرانی ١٩٥٥-دا کرد، ئینجا بە بوارپێدان و هاوکاری هەریەك لە دکتۆر نەجاتی دولۆنای، بەڕێوەبەر، و خاتوو سەعدەت ئۆنات، جێگر، بەدرێژی گڵێنە رەنگکراوە بلاّونەکراوەکانی حەلەفی لە تلکی دۆزرابوونەوە لە نزیك گۆمی وان، تاقیکردنەوە. هەروا کۆکراوەکانی سەر رووی عەرزی ئینستیتیوتی رۆژهەلاّتی و ماتسۆنی، کە لەتەل ئارپەچیە و تەل حەلەف و تەل چەگەر بازاڕدا دۆزیبوونیانەوە، بە ئینستیتیوتی رۆژهەلاّتی گەیاند.





لەبەرئەوەی زانیاری شوێنەواری پێوەند بە پەرەسەندنەکان لەسەردەمە مێژووییەکانی ئەم بەشە دوورەی عیراقدا بەشێوەیەکی پراکتیکی (لەبەردەستدا) نییە، ئەوا سەردەمی کتومتی توخمەکانی دواتر لە ناوچە تێکەڵەکەوە نازانین. دەشێ وێنابکرێت، کە هێندێك لە بناغە بەردەکان (Stone Foundation) بەندیوارن بەسەردەمی گوندەکانی پێش مێژووەوە.

لە دوو تاقیکردنەوەی تەلانی باکوور و باکووری رۆژهەلاّتی گردەکەدا هیچ برێکی مەترپاڵی تێکەلاّوی بتوانرێ هەڵبسەنگێندرێ نەدۆزرایەوە و وەسفی داهاتوی شتە جۆرا و جۆرەکانی کۆمەڵگەی پێش مێژووی بانەهیلك لەگەڵ گڵێنەی رەنگکراوی حەلەفدا، لەسەر ئەم دوو کردەیەدا بنیاد دەنرێت.

خۆڵی پاك چوار مەتر لە ژێر سەر رووی عەرزدا لە تاقیکردنەوەی سەر تەلانی باکووری رۆژهەلاّت دۆزرایەوە.

رۆنانسازی (Architeeture) بە شێوەیەکی نەدار لە تاقیکردنەوەکەدا رووندەبوویەوە.

پارچە دیواری لە بەردی کلس دروستکراو، رۆنتر بیلێین مۆرە (تەوفTauf) هی رۆندراوی راست (reetilinear) بوون، دۆزرانەوە (بڕوانە ل. ).

لە تاقیکردنەوەی سەر تەلانی باکووریشدا شوێنەواری ئاگردانی دروستکراو (built hearth) یان تەنوری قوڕی بە ئاگر رەقبوو (oven of fire- hardend clay)دەرکەوت.

چینە عەرزەکانی دواتری یەك بەدوای یەك بە ئاسانی روون و بەرچاو بوون و شتومەکەکانیشی ژمارەیەکی شیاوی هەڵسەنگاندنی ئەو پارچە سەمە بەردانەی (lime stone boulder) تێدابوو، کە رەنگبێ لە ئەسڵدا مەبەستێکی رۆنانسازی یان هەبووبێت. سیرامیکی رەنگکراوی جۆری حەلەف دەکەوێتە نێو چوارچێوەی جۆرە گڵێنەیەك بە نادیاری پێی گوتراوە، حەلەفی رۆژهەلاّت.

ئەو جۆرە گڵێنەیە لە پێکهاتە (texture)-دا زیاتر لە گڵێنەکانی تەل ئارپەچینە و تلکی تەپە (شامیرا- مالتی) دەچێت نەك لە گڵێنەکانی تەل حەلەف و تەل چەگەر بازاڕ و یونس- کەرچە مێش.

رەنگەکەش لە رەنگی هەمیشە لوسی جۆری یەك رەنگ (monochrome)-ی حەلەفە.

بانەهیلك جیاواز لە چینەکانی سەرەوەی ئەرپەچینە، تەنها پارچە گڵێنەیەکی خستە بەردەست رەنگی سپی پێشاندەدا (هەروەها تەنها حەوت یاخود هەشت سواڵەت (Sherd)-ی خستە بەردەست بەکارهێنانێکی باوی هەریەك لە رەنگی سوور و رەش- یان پێشاندا).

سەرەڕای ئەوەش، ئەوانەی، کە تایبەتمەندی لاوێنەی، دەفری نقیشك، یان هەیە، لە سێ قاپ و ئامان زیاتر نین.

شێوەکانی جۆری دیکەش (ئەمانەی لای خوارەوە) دەگرنەوە: دەفری لاخڕ ( Round- side bowls)-ی سادە، کە هێڵی ڕەنگکراوی نموونەی حەلەف و ڕۆخی بەشە بەشی چوارگۆشە کراو (Square- sectioned)-یان هەیە، کە هەمیشە زۆر پێدەچێ نیشانەکانی درێشم (tick)-ی ڕەنگکراو پیشان بدەن، و دەفری پەلتر (Shallower bowls)، و گەلێك پارچە دەفری خڕ، کە لە لێوارەکانی نەخشیان هەیە، شا کاشی بەرزی گەورەی زۆر جوان (Collared jars) (کە لەوانەی بچوکتری یەخەداری تەل ئارپەچینە دەچن)، و گەلێك شا کاشی یەخەداری نزمی بچوکتر، هەروا چەند مەنجەلێکی زۆر کورت و ئەستوور (Squat)، کە لای هەڵاوساو (bulging)-یان هەیە(The büche of Tell al-Halaf).

هەروەها چەند قاپ و قاچاخێکی (النمیات) (miniature) شێوە جودا جودا دەردەکەون. بابەتی ڕەنگی شێوەی گلێنەکانی بانەهیلك (ل. ) نەختێکدەچێتەوە سەر ئەوانەی پێشتر زاندراون، بە تایبەتیش ئەوانەی تەل ئەل-حەلەف و ئارپەچییە.

شێوەی سەرکە گا (bucranium) لە بانەهیلك-دا دەگمەنە، هەروەك لە تیلکی تەپە (بە لایەنی کەمەوە لە نێوان ١٥٠ سواڵەت یان زیاتر، کەلە تیلکی تەپەدا دۆزراونەتەوە)-شدا دەگمەنە.

نموونەی کەمەکانی بانەهیلك ئەوانەی مەلوان پێیان دەڵێ ((سەرکەگای شێواز کراو stylized bucranium)) پێشاندەدەن (mallowan and Rose 1935).

لە لایەکی ترەوە پێکهاتەکەی گوڵی چوار پەڕ (quatrefoil) و خاچی ماڵتایی بە تەواوی باوە، هەروا نموونەیەکی باڵندەی گوزارشتکەر دەردەکەوێ.

لە سوستە (نموونە sample)-ی بانەهیلك-ماندا گلێنەی ڕەنگکراوی جۆری سامەڕا یان جۆری حەسوونە نییە.

هەرچەندە لێرەدا هیچ ڕوونکردنەوەی بەراوردکاری ناکرێن، چونکە زانیاری زۆر کەم لە بارەی گلێنە بێ ڕەنگەکان (plain wares)-ی زۆرترین شوێنەکانی دیکەی حەلەفی بلاۆکراونەتەوە، بەڵام گلێنە بێ ڕەنگەکانی بانەهیلك سەرنج ڕاکێش. لە بانەهیلکدا دوو پێکهاتەی بنچینەیی هەن، لەگەڵ ئەوەشدا هەر یەکێکیان دەچێتە پۆلی ئەوی تر.

یەکێکیان ڕووە عەرزێکی پرتەقاڵی و پڕ لە کا (chaff- filled)ی هەیە" ئەوەی تریان تارییە (heavier)، کە عەرزێکی قاوەیی هەیە، هەندێك جاریش بریقە لەسەر ڕووەی دەرەوەیدا هەیە، هەروەها کەمێك کا یان هەر نییە.

شێوەکان [لەمانە] پێکدێن: شاکاشی لاری_شاندار (sloping- shouldered jars)، و دەفری سادە لە هەردوو پێکهاتەکە، و کەشەفی بن تەخت (flat- bottomed trgys)، هەروا شاکاشی یاخود مەنجەڵی دەسکدار (lugged).

دەسکەکان (کە زۆربەیان لە شوێنەواردا شکاون و بە پەرش و بلاوی دۆزراونەتەوە) هەندێك جار تەواو گەورەن، لە جەستەوە ٥—٦ سم و ٣—٥ سم ئەستورن" ئەو گلێنانە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا کارا بوونە.

لە سووستەی بانەهیلکدا گلێنەی ڕەنگکراوی جۆری حەلەف نزیکەی ٦٠٪-ی کۆی زۆربەی سواڵەتەکانەو، گلێنە بێ ڕەنگەکانیش ئەوانەی دەمێنێتەوە پێکدەهێنن.

تەواوی کەل و پەلە جودا جودا بە ڕوون و ئاشکرایی سوود بەخشەکان لە دروستکراوی قوریندا دەرکەوتن.

ئەم کەل و پەلانە لەمانەی (لای خوارەوە) پێکدێن:

سەرکە تەشی (spindle whorls)و، بێژنگ (sieve) (کە بریتین لە پانکەڵە قەرِی سورکراوە تیرەیان ٤-٥ سم ە چەندین کونیان تێکراوە)و کەلوپەلی شێوە ڕەحەتی (funnel)، هەروەها پانکەڵەی قوڕین و عەلّقەی سورکراوە. سواڵەتەکان (pot sherd) وەك پانکەڵەی (سەرکەتەشی؟) و تەڵێشی ڕنەك (chipped scrapers) بەکارهێندراون، ڕنکەکە ڕەنگیٚ بۆ پێست دەماڵێن (کەوڵکردن)، بەلاَم زۆرتر پێدەچێ بۆ گلێنە دروستکردن بەکارهێندرابێت.

پەیکەڕۆکەکان، شیاوی باسە ئەوانەی جۆری دایکە خوداوەند، لە دۆزینکارییەکانماندا دەرنەکەوتن.

بەردەشێکاری (flint industry) لە بانەهیلك-دا کاریگەر نییە، بە شێوەیەکی گشتی زیاتر لە تەڵێشی بەرکەوتوو (casual flakes) و تیغە تەڵێش (flake- blade) پێك دێت نەك تیغی باش تیژکراوی (well trimmed blade) لە کرۆکی هەڕەمی دروستکراو.

داسوکەی بەردەستیٚ هەمیشە لە تیغە تەڵێشن، کە جگە لە کاتی چەند کولبونێك (blunting)ی کاتی نەبێت نیشانەی تیژکردنەوەیان لەسەر نییە. دەسك (sheen) شوێنەواری کاتی دەست بۆ کردنی قیر (؟) شوێنی سەرنجدان.



ئامرازە بەردەستەکانی جۆری دیکەش، کە دۆزراونەتەوە، پێك دێن لە: چەند ڕنەکێکی کەم (scrapers)و سیٚ تا چوار مکارە (drill)-ی سادە، هەروا ژمارەیەکی کەمی ئامرازی بەردی ورد و بچووك (microlith)، کە لەو ئامرازە بەردییە بچووکانەش، چوادانەیان جۆری نوك پان یاخود نیمچە لاتەرین، یەکێکیان کەوانەییە (lunate)، یەکێکی دیکەشیان ئامرازێکی بچووکی دوو نوکە (double- pointed).

ئامرازی بەردی ئۆبزید-یش بەچەند برێك هەبوون، بە شێوەیەکی سەرەکی تیغی بەکارهاتوو یاخود سادەن.

ژمارەیەکی کەم لە تیغە بەکارهاتووەکان کەلن (notched).

چەشنەکانی جونی گەورە (heavier ground stone) و ئاونگ (mortar) و بکوت (دەسکەئاون pestles) و جۆرەکانی دیکەی بەردی هارین (بەردا ئاش milling- stone) هەبوون.

ژمارەیەکیش پارچەی دەفری لە بەرد دروستکراوی باش (well made stone bowls) هەن.

ئامرازی بەردی بێوری تەواو داتاشراو (ground celts)ی جۆری بێور، کە ڕۆخی بڕەریان هەیە دەرکەوتن. هەروەها شوێنەواری پیشەکاریەکی کەلوپەلی بەردی لەچاو باش ڕەوشاو (ornamental)ی دروستکراودا، هەبوو.

ئەم شوێنەوارانە لە ئارایشتی بازنەی ئۆبزیدی و گەردەنبەند (pendant) و یاخود لەو مۆرانەی، کە نوکرەکردنی(cross hatched)- یان لەسەرە، هەروەها مت و مووری بەردی (stone beads) پێکدەهاتن.

درێشە (awls) کان یاخود ئامرازی سمینی لە ئیسقانی مەچەك و قولەپیٚ (metapodial) دروستکراو، دەرکەوتن.

پۆلێنکردنی سەرەتایی ئیسقانی گیانەوەران لە لایەن ڕید (reed)ەوە، بزنی ماڵیکراو ( capra hircus)، کە شێوەکانی ئەو بزنە (ماڵییە یان کێوییە) لە بەڵگەکانی ئێمەدا بەر گومانە، واتە، گاران (bos sp.)، سەگ یاخود گورگ (canis sp.)، بەراز (sus scrofa)، پێشاندەدا، شێوە کێوییەکانیش بەم شێوەیە پیشاندەدا، کەلەمانە پێك دێت: ئاسکی (شوار)ی ڕوو (capreolus capreoius)، ڕێوی (vulpes)، بزن (capra aegagrus)، پڵنگ (panthera pardus)، دەڵەك (martes foina)، هەروا جۆر پشیلەیەکی نەناسراو.

ئێسقانەکانی ولاخە بەرزەی ئەسپ شێوەی (aquid) دەگمەنیش دەردەکەوتن، وا دەردەکەوێ گشت ئەو ئێسقانانە لە چینە عەرزییەکاندا دۆزرانەوە و رەنگبێ لە جۆری کۆنتێکستی حەلەف- یشدا نەبن.

هێلکە شەیتانۆکەکان (shell)ی جۆری گەورەی لولپێچی وشکانی (Land snail) ( hielix salomonica)ش باو بوون.

لێکۆڵینەوەی شێوەی رووەکەکانیش کاتێك دەردەکەوتن، تەواونەکرا.

وا دەردەکەوێ بانەهیلك بە شێوەیەکی سەرەکی شوێنی یەك سەردەم بوبێت، بەلاّم بە لایەنی کەمەوە لەسەر تروپکی گردەکەوە بەرەو رۆژئاوا چەند شوێنەوارێکی نیشتەجێبوونی دواتری هەیە. بە دڵنیاییەوە گڵێنەی زۆر بەرچاوی شێوازی رەنگکراوی حەلەف لە کۆمەڵگایەکی سەرنج راکێش و باش پێشکەوتودا، دەردەکەوێ.

سەرەڕای قەبارەی قەتیزبووی سوستەکان، دیار نەبوونی پەیکەرۆکەکانی دایکە خوداوەند-یش (mother- goddess) نادیارە، ئەویش دووبارە پرسیار لە بارەی ئەوە دروستدەکاتەوە، ئاخۆ ئەو پەیکەرۆکانە لە کۆمەڵگای خەلەفی کلاسیکیدا بەڕاستی ئایتمێکی ئاسایی بوونە (R.J.and L. Braidwood1953). لە ئەنجامی دیارنەبوونی بەردەشێکاری باش وەسفکراوی جۆری حەلەف، ئەوا پیشەکاری بە پۆپە نەگەیشتووتری بانەهیلك، بوونی پیشەکاری حەسوونە لە بناردا رەتدەکاتەوە،

ئەمەش بە شێوەیەکی سەرنج راکێش لەگەڵ پیشەکارییە کۆنترەکانی تیغە باش دروستکراوەکان لە چەرمۆ و کەریم شەهر لە ناوچەی گردە بنار-یەکان و دۆڵی نێوان شاخەکان، کە بانەهیلك- یان تێدا هەڵدەکەوێ، دژیەك دەبێت.

بوونی ئامرازی ورد و بچووك (microlith) لە هیلکدا پێشنیاری ئەوە دەکات، کە نەبوونی ئەم ئامرازانە لە شوێنەکانی دیکەدا، کە گڵێنەی رەنگکراوی جۆری حەلەف-یان هەیە، رەنگبێ بە شێوەیەکی سادە و ساکار بەهۆی کەم سەرنجدانەوە بێت.

بانەهیلك، لەسەر بنچینەی گڵێنە رەنگکراوەکانیدا، وا پێدەچوو لە دەوروبەری هەمان کاتی تیلکی تەپە و پێش چینەکانی (TT6)-ی ئارپەچییەدا، خەڵکی تێدا نیشتەجێ بوبێت.



مەتریاڵە دۆزراوەکان لە تاقیکردنەوەکانی بانەهیلك-دا وەك قەبارە لە چاودا بچووکن، لە کاتێکدا بانەهیلك رەنگبێ [بە] شیکردنەوەی تەواوانە یەکەم وەسفی هزری سەرتاپای کۆمەڵگە شوێنەوارییەکەی شوێنێك بخاتە بەردەست، کە گڵێنەی حەلەفی تێدا بێت.

## تەل ئەل- خان

سەنگەری تانکەکانی بەریتانی لە تەل ئەل- خاندا بۆ تاقیکردنەوە بەکارهێندران[٢].

نزیکەی -٥- مەتر زیاتر لە رووە شلۆەکەی (شاخەشینکە crumbling) لەسەر تەلانی رۆژهەلاّتی گردەکەدا قۆناغ قۆناغ لەلایەکەوە بەرێز لەسەر یەك کەوتووە، کە ئەوەش بە شبە شیونێکی ستوونی روون و ئاشکرای بەرەو خوار تاوەکو خۆڵی پاك داوە، لە قوڵی نزیکەی -٣- مەتردا.

لە قاتی (humus)دا گڵێنەی ئیسلامی (هەروا رەنگبێ هەندێ گڵێنەی ئاشوریش) بەچەند برێك دەرکەوتن، لەژێر ئەم قاتەشدا، بە قولاّیی نزیکەی -٢- مەتر چینێکی پاك و لیتەیەکی باش تێکەڵ هەبوو.

ژمارەیەکی کەمی پارچە گڵێنەی حەسوونەش لە لیتەکەدا دۆزرانەوە، بەلاّم قاتی پێکهاتوو لە مەترِیاڵ یان چڕبوونەوەی مەتریاڵەکان لە نزیکەی قوڵی دوو مەتر بەسەرەوە، دەرنەکەوتن. چەند ,,قاتێکی،، زوو لەناوچوو لەژێر ئەم قوڵییەدا

دۆزرانەوە بەچەند برێکیش لە گڵێنەی جۆری حەسوونەیان خستەبەردەست.

بەهەر حاڵ، شوێنەواری رونانسازی نەدۆزرایەوە و مەتریاڵەکانی دۆزرانەوەش تا رادەیەك بەتەواوی لە سواڵەت و پارچەی ئامرازە بەردییەکان پێکدەهاتن.

سەرەڕای بەرتەسکییەکانی، سوستەی سواڵەتەکانی تەل ئەل- خان (بنۆڕە ل. ) زۆر لە گڵێنەکانی چینی سێیەم لە تەل حەسوونە نزیك دەبنەوە.

(٢) خاتو برۆمان سەرپەرشتیاری راستوخۆی هەڵکۆڵینی کاری دیتنکاری بوو، ئەمەی خوارەوەش لەسەر بنچینەی سەرنجە دیتنکارییەکانی خۆیدا بنیادکراوە، کە بۆ ئەوبەشەی لەسەر گڵێنەیە بەکاردێن.
دکتۆر جۆزیف ئارز کالدوێڵ (ئێستا لە مۆزەخانەی دەوڵەتی ئیلینۆیزە و لە ١٩٥٥-٥٧ قوتابی دەرچووە لە بەشی ئەنترۆپۆلۆژی زانکۆی شیکاگۆ) هەروەها دکتۆر ماتسۆن بە هاوبەشی درێژە پێدانی لێکۆڵینەوەی دەربارەی گڵێنەی ئەل-خان گرتە ئەستۆ، تێبینیەکانیش لێرەدا پشت بە لێکۆڵینەوەی سەرەتای کالدوێڵ دەبەستن.





له پۆلی کەلوپەلی کرێتەکانیش، تەوەقی سپێکردنی (دانەوێڵە) (husking trays) و ژمارەیەکی کەم شا کاشی (Jar) شیر دەرکەوتن.

گڵێنە جوانەکانیش لە سواڵەتەکانی سەبەتەی نەخش لەسەر هەڵکەنراوی ستاندارد ( standard incised) و سەبەتەی ڕەنگکراو- هەروا نەخش لەسەر هەڵکەندراو جۆرەکانی سەبەتەی ڕەنگکراو، پێکدێت.

سواڵەتە ڕەنگکراوەکانی سامەڕاش لە سواڵەتی دەستکرددا قەتیز بووبوون.

شوژکاری بەردی (chipped stone industry) سوستەی ئەل- خان لە ڕاستیدا جۆرێکی نەدارە، کە هەروەها لە تەقلیدی حەسوونەی گشتیش نزیك دەبێتەوە.

ڕەنگبێ کەمی سوستەکان بە هۆی نەبوونی ئامرازی تیغ و ئامرازی ئۆبزیدییەوە بێت.

ژمارەیەکی کەمی پارچەکانی جوونی (grund stone)، کە بە شێوەیەکی سەرەکی دەسکە ئاونگ و بەردی هاڕین، دۆزرانەوە.

تاکە مورویەکی کونکراوی کورتی قوچەکی بەردی ڕەشی پۆلیشکراوی دۆزرایەوە.

هەندێك ئێسقانی گیانەوەرانیش دەرکەوتن، بەڵام هێشتا نەتوێژراونەتەوە، هەروەها هیچ دۆزینەوەیەکی دیکەی هونەری دەستکرد نەبوون. وێکچونی گشتی دەردەستکەوتەکانی ئەل خان لەوانەی جۆری شوێنگە، تەل حەسوونە (لە ڕاستیدا تەنها ٢٥ مایل لە باشووری ڕۆژئاواوە دوورە)، و تایبەتمەندی ستراتیگرافی چینە لیتەکەش لە فراوانکردنی هەڵکۆڵینەوەکانماندا ساردیان کردینەوە، ئەگەر چینە لیتەکە بە هۆی داشۆرانی قۆناغی دوای حەسونە لە گردەکانەوە بەرەو باکووری ڕۆژئاوا بوو بێت، هەروەك ڕایت پێشنیاری کردووە (ل. ).

ئەوسا دەوروبەرەکانی هەنووکەی ئەل خان پێدەچێ بە هیچ کلۆچێك ئاماژە بە سەنتەری حەسوونەی ئەسڵی گردەکە نەدەن.

شوێنە بەسوودترەکانیش بۆ لێکۆڵینەوەی فراوانی زانیاری کۆمەڵگەی حەسوونەی ئاسایی بەدڵنیاییەوە لە هەرێمی گشتیدا دەدۆزرێنەوە.



## تەل مەتارە

کۆمەڵگەی مەتارە بە دڵنیاییەوە دەتوانرێ تارادەیەك بە کۆمەڵگەیەکی نەداری جۆراوجۆری باشووری حەسوونەی ئاسایی دابنرێت.

دوای ئەوەی ڕاپۆرتێك پێشتر (لەبارەیەوە) بلاوکرایەوە ( Braidwood et al 1952)، لێرەدا وەسفی شوێنەکە تا ئەوپەڕی کەم دەکرێتەوە. ٤٦٠ مەترێکی چوارگۆشە وەبەرچاوخراوە، نزیکەی ٣٦٥ مەتر لەو ڕووبەرەوە بەرچاوخراوە لە سێ کردەی سەرکیدا هەڵدرایەوە.

گەورەترین ئەستوورایی نیشتەنیە دۆزرایەوەکە لەسەر خولی پاکدا (Virgin soil) نزیکەی - ٥- مەتر بوو، کەوا دەردەکەوێ نزیکەی پێنج تا شەش چینی نۆژەن کردنەوە یاخود گۆڕانی ڕۆنانسازی بگرێتەوە.

خانووەکانی مەتارە لەچاودا بە شێوەیەکی باش بە دیواری جەبلە (Tauf) ڕۆندراوانی هێڵ ڕاست (rectilinear)ی باش دروستکراو بوونە (بنۆڕە ل. ).

باشترین نموونەی پارێزراوی دۆزراوە، چوار ژوری هەبوو، وا پێدەچوون بەرەو باشووری ڕۆژئاوا بەسەر حەوشەکەدا نواڕیبێتیان.

شوێنەواری تەندوری هێلکەیش یاخود ئاگردانی سورکردنەوە (parching hearth)، کە بەلایەنی کەمەوە بە شێوەی پاژەیەکی بەقوڕ لە کۆتاییدا شێوەی کەوانیان وەرگرتوە، دۆزرانەوە ( cf .p. ).

لە سەرەتای قوڵترین سێ کردەی گەورەدا چاڵی هێلکەیی درێژی خودان ڕێکردەیەکی نامۆی خودان دیواری بەئاگر ڕەقبوو تاوەکو سەر خۆڵی پاك هەڵکۆڵدران.

گڵێنە کرێتەکانی زۆر لە گڵێنە کرێتەکانی حەسوونە دەچن، کەلە تەوەقی سپیکردن (husking trays) و ژمارەیەکی کەم شا کاشی تایبەتی شیر، و شا کاشی گەورە خودان شانی شۆڕبوونەوە بەسەر جەستەدا، پێکدێن، (بە هەڵە لە گوتارە ئەسڵییەکەماندا پێی گوتراوە "شا کاشی شیر").

گڵێنەی سادەی جوانتر لەوانەی لە خودی تەل حەسوونە دۆزرانەوە، هەروەها گڵێنەی قڵیشی قڵیشکراوی تاڕادەیەك ئاڵۆزتر، هەمن.

لە دوای بۆچونەکەی لێۆد و سەفەر، کە هەڵکۆڵەکانی تەل حەسوونەن، حەز دەکەین گلێنە ڕەنگکراوەکانی مەتارە زیاتر بەهی سامەڕا سەیر بکەین نەك بە تەقلیدی سەبەتە ڕەنگکراوەکانی حەسوونە.

گلێنە سادە جوانترەکان و ڕەوشاندنی قەڵیشی نەخشاو (incised)ی ئالۆز و ڕەوشاندنی ڕەنگکراو لە چینەکانی خوارەوەی مەتارەدا دەرنەکەوتن. بەردی قۆچەقانی (sling missiles) و سەرکە تەشی (whorls) لەباوترینی کەلوپەلە قوڕینە سورکراوەکانن، بەڵام پەیکەرۆکەی (دایکە خوداوەند)ی بێ شێوە (amorphous) و پارچەی کەمی شکاوی پەیکەرۆکەی گیانەوەران دەرکەوتن، هەروەها پانکەڵەی سەیر (odd disks) و تەنکە رووپانی کانزایی (plaque) دۆزرانەوە.

دووبارە لە تەقلیدی گشتی حەسوونەدا، بەردستێکاری بەردەوام دەبێت لەوەی تەڵیشە بەرد و تیغە تەڵیش بخاتە بەردەست و تیغی تایبەتیش زۆر دەگمەنن.

مەتریاڵەکانی داسوکەی خودان دەسك (sheen) و شوێنەوارەکانی دەسکی قیڕیش لەباو ترینی ئامرازەکانی تیغە تەڵیش و تەڵیشەکانن، لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی کەم لە حاڵەتی پارچە تیغ دان.

بە شێوەیەکی نامۆ، تایبەتمەندی خاك ڕنی شوژی (shipped hoe) حەسوونە دەرنەکەوتن.

ئامرازی ئوبزیدی هەن و دەبن بە تیغ (یان شۆژی باو)، لە کاتێکدا ژمارەیەکی کەمی پارچەکانی توێژاڵی ئامرازی بەردی ورد (microlith) دەردەکەون، تەڵیشێکی تیغ یەك لا بکوت،(side blow blade- flake)ی پانی لا ناتەریبیان لە نێودایە، لەو جۆرەی لە چەرمۆدا دۆزرایەوە (بنوارە ل. و p1. 18b Ath row،). تێبینی کردنێکی بەسوودە، کە شوژکاری بەردی (chipped stone industry) خودی تەل حەسوونە ڕەنگبێ وەك هاوشێوەکانی لە مەتارەدا تەواو بێ هیوا نەبێت.

ئەم تێبینییە هی یەکێك لە هاوڕێ بچووکەکانمان، فرانك هۆڵ - ٥، کە لەسەر کۆکردنەوەی بەڵگەکانی سەر رووی عەرزی تەل حەسوونە بنیاد دەنرێت، کە لە ماوەی سەردانەکانیدا لە ١٩٥١ و ١٩٥٤/ ٥٥ دا، ئەنجامی داوە.

هۆول (Hole) بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا سەرە هاوێژك (projectile point)ی سوری کلیلی جۆری (جاولان) ی لە یاد نەبووە. (cf. R. J. and L. ،p. 30A 1953،)





Braidwood)، بەلام هێندێك تیغی بەردەستێی باش ڕێککراو و ژمارەیەك ئامرازی بەردی ورد و بچووکی (microliths) لە ڕووی تەکنیکییەوە لەیاد بووە.

لە نێوان کەلوپەلی جونی (ground stone)شدا ئاونگ (mortars) و دەسکە ئاونگ و جونی (pestles) و جۆرەکانی دیکەی بەردی هاڕین (milling stone) لە باوترینی کەلوپەلەکانن.

بەردە بێور (celts) باو نەبوون.

نموونەی جۆرە بێورێك و چەند جۆرە تەوشویەك (adz) دۆزرانەوە" ئەو ئامرازانەی بە شێوەیەکی سەرەکی بە تەواوی داتاشراو (ground)ن، بەڵام وادیارە بە گوێرەی ڕێگەیەکی لەبار و گاشەبەردی هەڵبژێراوی بەیەکدا دراو (لێدراو) دروستکرابن.

نەخاك ڕنی شوژی حەسوونە و نە هیچ بەردە بێورێکی پارچەکراو و خاکڕن (chipped- and- hoecelts)یش دەرکەوت.

ژمارەیەکی تەواوی مورووی سادەتر و جۆرێکی مۆری پانکەڵە (seal stone)ی تا ڕادەیەك لاکێشەیش هەن.

مێخە بەردینەکان (stone nail)و جۆرێکی قوپچەی خڕی خودان پارچە شولی نێو دەسك (ang)ی چەماوە (شێوە. ٥، لای چەپ)، و مورووی مەڕمەڕی خودان کونی گرێ (loop- bored marble bead)، کە پێدەچێ مورووی قەپیلکە کەسپك (cowrie- shell bead)ێك دەربخات (شێوەی.٥، لای ڕاست) ئەو کەلوپەلانەش تاڕادەیەکی زۆر بۆ مەبەستە بەراودکارییەکان گرنگن. (بنوارە دواتر).

درێشە ئێسقانەکانیش بە تەواوی باوبوون، کە هەندێکیان وردە ئێسقانی دەرەکی (articular surface) ئێسقانی ساغی مەچەك و قولەپێ (metapodial) یان هەیە.

هەروەها پارچەکانی دەرزی سەرخڕ (pin)ی ئێسقان و دەرزی درومان و تیغە_پەراسو (rib- blades) و پواز (gouges)یش، دەرکەوتن.

مورووی ئێسقانیش هەن، کە یەکێکیان قڵیشدارە (groored)، هەروەها مورووی لە پارچە ڕەقەی قەپگر (snapped)ی سەدەفی دداندار (dentalium shell) باوبوون.

لێکۆڵینەوەکانیش لە بارەی مەتریاڵە بەدەست دروستنەکراوەکان، کە گیانەوەرانی بڕبڕەکان (invertebrate) و بڕبڕەدارەکان (vertebrate) دەگرنەوە، هێژ تەواو نەکراون.

هەڵبیك (1953a) جۆرە جۆیەکی دوو ریزی دیاریکرد (two- row barley).

ژمارەیەکی کەمی زۆر نەدارانەی نێژراوە پارێزراوەکان هیچ جۆرە پراکتیزێکی ئاشتنی تۆکمەی پێشان نەدا.

سەرەڕای وێکچوونە گشتییەکانی کۆمەڵگەی مەتارە لەگەڵ ((سەبەتەکانی)) کۆمەڵگەی حەسوونەدا، وەك گڵێنەی رەنگکراوی حەسوونە و سەبەتەی رەنگکراو، هەروەها گڵێنەی رەنگکراو- و نەخش لەسەر هەڵکەندراو، و گڵێنەی شێوە ناسەرەکی رووـڕەشی مشتوومالکراو (burnished)، ئەوا شەقڵە تایبەتییە دیاریکراوەکانی جۆری شوێنەکە وا دیارە لە دەست درابن. هەروەها خاك رنی شوژ و سندوقی دەغڵ و دانی بەقیر داپۆشراوەهن. گەر هەروەك لێودو سەفەر پێشنیار دەکەن، کە دەبێت گڵێنەی ەنگکراوی مەتارە بە تەواوی وەك بەرهەمی دوا بەدواییەکی کەمتر یاخود زیاتری شێوە گڵێنەی رەنگکراوی سامەڕا سەیری بکرێت، دواجار ئەوە شتێکی سەرنج راکێشە تێبینی بکرێت، کە موروی مەڕمەڕی ( simulated cowrie- shell) و قوپچەی خڕی خودان شوڵی خواری نێودسك (bent- tanged) بە هەر شێوەیەك بێت تا ئێستا تەنها لە خودی سامەڕادا دۆزراونەتەوە ( R.J. and L.Braidwood1953 ، ).

هەر چۆنێك بێت، لایەنی سەرلەبەری کۆمەڵگەی مەتارە، لایەنی حەسوونەیە، هەروەها هەروەك لە پێشەوەشدا پێشنیارکرا (ل.   )، رەنگبێ مەتارە گوزارشت لە کۆمەڵگەیەکی تا رادەیەك جۆراوجۆری نەداری باشوور بکات، لە ناوچەیەکدا، کە باشترین هەلومەرجەکانی ناوچەی بنار (piedmont zone)ی تێدا بەرەو نەمان چوونە.

لێرەدا زۆر پەیوەندی بە بابەتەکەیەوە هەیە، تێبینی بکرێت، کەلە گومان بردنی ئەوەی نەبوونی سەبەتە و جۆرەکانی گڵێنەی کەوچ (کرێت_coarse)ی حەسوونە لە راپۆرتە فەراهەمەکانی دەربارەی باگۆز و خودی سامەڕا کراون بە هۆی وەرگرتنی دەنگوباسەوە بێت لە لایەن هەواڵنێراوە، هەڵە بووینە ( R.J. and L.Braidwood, 1953 ).

لە سەرەتای مارتی ١٩٥٥ لە گەشتێکماندا بۆ باگۆز بەبڕێکی زۆر سواڵەتمان کۆکردنەوە، کە بە تەواوی پەرش و بلاوبوون و ئەوەندەی توانیشمان هەندێك شتومەکی دەستکردی دیکەمان دۆزییەوە.



تەواو روونە، کە گڵێنەی کەوچ و باوەکانی هاوشانی گڵێنە رەنگکراوە جوانەکانی سامەڕا دەکەن لە باغوزدا بە هیچ شێوەیەك لە جۆری حەسوونە نین.

ئەوەی بۆ باغوز راستبێت رنگبێ بۆ خودی سامەڕاش راستبێت.

کەواببوو زۆرترمان پێناچێ لە گومانی ئەوەدا هەموار بین، کە رەنگبێ باغوز و سامەڕا بە شێوەیەکی سادە گوزارشت لە ((سەبەتەی)) ((standard)) جۆراوجۆرتری کۆمەڵگەی حەسوونە بکەن، کە تەنها گلێنەی رەنگکراوی تایبەتییان هەیە تا ئێستا دۆزرابێتەوە.

## گردی عەلیاغا

سێ هەڵکۆڵینی[٣] تاقیکردنەوە (sounding) رووبەرێکی گشتی نزیکەی ٤٥ مەتری چوارگۆشەیان دەرخست. شیاو نەبوو هەڵکۆڵین لە تروپێکی (crown) گردەکەدا بکرێت، چونکە تروپکی گردەکە گۆڕستانێکی لەسەرە بێگومان ئەم گۆڕستانە هی سەردەمی ئیسلامیە، بەلاّم بۆ ماوەیەکی درێژتر لە لایەن خەڵکی گوندی (گردمەمك)ەوە بەکارنەهاتووە.

هەڵکۆڵینە ئەزموونییەکان کتومت لە رۆژئاوای ( stone- covered outlines of the graves)دا کران، کە بەسەر رێڕەوی زێدا دەنوارن.

جگە لەو شوێنەوارانەی، کە بە شێوەیەکی روون کۆمەڵگەی گوندێکی تۆکمەی پێش مێژوو پێکدەهێنن، شوێنەواری گرنگی دیکەی مەتریاڵە دەستکردەکان نەبوو، تاوەکو وەسفبکرێن.

خۆڵی پاك لە دوو هەڵکۆڵینی ئەزموونیدا دۆزرایەوە و پێشدەچێ لەژێر رووی عەرزەوە لە هیچ شوێنێکدا لە ١,٥٠_٢,٠٠ مەتر زیاتر نەبێت.

گەورەترین هەڵکۆڵینی ئەزموونی (لە ٢٤مەتری چوارگۆشەدا) بەلایەنی کەمەوە رێزبەندی سێ ((نهۆم)) یاخود چینی خۆڵی پێکهاتوو، کە شوێنی بچووکی خەڵوز و نیشانەکانی دیکەی چالاکییەکانی دیکەی ژیانیان تێدابوو، دەرخست.

(٣) خاتو برۆمان سەرپەرشتی هەڵکۆڵینەوەکانی تاقیکردنەوەی دەکرد، و زۆربەی ئەم وەسفەش لە تێبینیە دیتنکارەکانەوە دەکرێت. توێژینەوەی کالدوێلز — یش لە بارەی گڵێنەوە هێشتا بەکاردەهێنرێت





لەو چاڵەی کە کۆمەڵە شوێنەوارێکی چاڵۆکەی نارێك یاخود رووبەری دابەزیو (depressed)ی تێدابوو، خۆڵی پاك دەرنەکەوتن.

لێواری چاڵەکان لەچاودا لەرووی عەرزەوە نزیك بوون و بۆ رەنگرێژیش ئاسان نەبوون، ئەم چالانە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا وەك ئەو چالانەی لە چینە بنچینەییەکانی مەتارەدا تێبینی کران، لا (side)ی زۆر ستوونیان نەبوون.

سیستەمەکانی چاڵ لێدان یاخود بەرەو خوار دابەزین هەروا بەرەو خوار دابەزینەکان (depressions) لە عەلیاغادا بە شێوەیەکی تەواو پێشنیارکردنی ٤مەتر پانیان بەلایەنی کەمەوە دەرخست.

ئەو چالانەی چاڵە خانوو (pit- house) تیل نیشاندەکەن بە هیچ شێوەیەك دڵنیانین.شوێنەواری (post- holes) و بەڵگەی دیوار دروستکردن بە مۆرە (tauf)تێبینی نەکراون.

رێکدانانەکانی خڕە بەرد (boulders)ی بچووکی تەختی رووبار، لە بارێکدا وەك بەر (lining)ی ئاگردانێکی شێوە تەشت (basin- shaped)، دەرکەوتن (p1. 13A).

بە شێوەیەکی ئاودامانی، لەو بەشە قەتیسبوانەی عەلیاغا، کە دەرمانخستن دەرخستنێکی روون و بەرچاوی گومانبڕی چالاکی رۆنانسازی نەبوو.

چاڵە پەلەکانیش (shallow pits) رەنگبێ جۆرێکی چالاکی حەوشی کێڵگە گوزارشتیکەن، نەك رۆنانسازی. بێگومان گلێنە دروستکردن لەلایەن دانیشتوانی ئەسڵی عەلیاغاوە پیادەکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەرمەهەکانیان لایەنێکی لەچاو سەرەتاییان هەیە (بڕوانە ل. هەروا p1.15-18).

جۆرە گلێنەیەکی کەوچی سادە (simple coarse) پانە بڕگە ئەستوور، کا پێوەکراو ( chaff- tempered) و کەم سورکراوە، باوبوو، بەڵام جۆرێکی گلێنەی سادەی جوانتریش دەرکەوت. شێوەی ئاسایی شا کاشییەکی شاندار (shouldered jar) یاخود دەفرێك بوو تایبەتمەندی (dougle- ogee) چینەکانی خوارەوەی حەسوونە هەیە.

کەشەفەکانی (trays) لەلا دیمەندا (profile) وەك کەشەفی توێکڵ لێهەڵکردنی دانەوێڵەی

ئاسایی حەسوونەن، بەڵام بەبێ ناوەوە زبرکردنی ئەنقەست، هەبوون.

قولچە (lug) یاخود دەسك (knop)ی قوڕی بەکارهاتوو لە ژێر لێواری هەندێك شا کانشیدا دەردەکەوێ، کە پێکدێن لە چەند بارێکی کەمی "چاوەکانی" مودێل کراو، تەنها دوو سواڵەتی



نەخشکراو هەروەها پارچەیەك تا دوو پارچەی سواڵەتی بچووکی خودان شوێنەواری تەگەری نەخشی رەنگکراویش، دەرکەوتن.

کەلوپەلە قوڕینەکان پۆلێکی بچووکی بچووك پێکدەهێنن.

ئەم کەلوپەلە قوڕینانە چەند پانکەڵە سواڵەتێکی کونکراو (سەرکەتەشی؟) و سەرکەتەشی شێوە پەنجە و چەند پارچەیەکی کەمی دیار و بەرچاوانەی پەیکەرۆکەی مرۆڤ و کەل و پارچە تولّ و (Rod) و گویەك (ball) و قوچەکێك (cone) و ژمارەیەکی کەم و مورد و مت-یان دەگرتەوە.

بڕۆمان باوەڕی وایە، کە پەیکەرۆکەکان لەوانەی چەرمۆ دەچن، بەلاّم کەل و پارچەکانی عەلیاغا دەریدەخەن ئەو پەیکەرۆکانە پەیکەرۆکەرۆکەی گیانەوەرانە نین.

دووبارە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا بەردە شێکاری عەلیاغا لە تەقلیدی حەسووندا زۆر نەدارە.

سەرتاپای جۆرەکان بە شێوەیەکی سەرەکی رنەکە تەڵیشی زبڕن (rough flake scrapers)، هەروەها نە تیغی باش لێدراو (well struck blade) و نە کرۆکە تیغیش (blade cores) دەرکەوتن.

ژمارەیەکی کەمی گاشە شوژی شێوە بێوری گەورەتر ( larger celtlike chipped pebbies) و هەروەها گاشەی تەڵیشکراو (pebble flaked) رەنگبێ وەك ئامرازێك بۆ چەپە چاخکردن (chopping) بەکارهاتبن، دەرکەوتن.

کەل و پارچەی تیغی بچووك و تیغۆکە (bladelet)ی دروستکراو لە بەردی ئۆبسیدی بەچەند بڕێك دەرکەوتن، بە هەر حاڵ جۆری چەرمۆی تیغە تەڵیشی یەك لا بڕ ( side blow blade- flake) دەگرنەوە.

جۆری بەردەجوونیش (ground stone) زۆر کەمن بە شێوەیەکی سەرەکی کە کەل و پارچەی ئاونگی کرێتی بەردی (blolder) و دەسکە ئاونگ و جوونی ژێر ئەگەر، پێکدێن.

دوو پارچەی بێور بەردینی پۆلێشکراویش لەسەر رووی عەرزدا دۆزرانەوە.

پارچەیەکی دەفری بەردینی بنکە تەخت هەیە. کەلوپەلە لە ئێسقان دروستکراوەکان لەمانە پێکدێن پارچە تیغێکی (spatulate) و چەند درێشەیەك (awl) و موورویەکی شێوە پیپ (barrel- shaped)ی تەخت.

چەند پارچەیەکی گڵە سوریش (ochre) دەرکەوتن.

شوێنگرتنی رووەکە بچووکەکانە لەناو پارووی قوڕین و ناو سواڵەتەکاندا هەروەها ئێسقانی گیانەوەرانیش هێژ بە درێژی نەکۆلڕاونەتەوە.





نێژراوێکی پێچخواردوو (flexed burial) لە بارێکی نەداردا، لە ڕۆخی گەورەترین هەڵکۆڵینی ئەزموونی بەتەواوی دەرنەخراودا دۆزرایەوە و گرێمانکرا بۆ گۆڕستانە ئیسلامییەکە بگەڕێتەوە.

هەڵکۆڵینە ئەزموونییەکان لە عەلیاغادا تەواو بە دەرخستنی تایبەتمەندی نشینگە ئەسڵییەکەوە قەتیسکرابوون.

نەبوونی شوێنەواری پۆزەتیڤی ڕۆنانسازی تارادەیەك سەرسووڕهێنە.

قاپڵبونێکی گشتی هەبوو، کە گڵێنەکان لە گلێنەکانی هەریەك لە چینەکانی هەرە سەرەوەی چەرمۆ و چینە بنچینەییەکانی قۆناغی حەسوونە دەچن، ئینتیباعی بڕۆمان دەربارەی بەردەستیێ و ئامرازە ئۆبزیدەکان و پەیکەرۆکەکان ئەم بەراوردکارییە گشتیەی شوێندانانی نشینگەکە دەچەسپێنیێ.

ئەگەر دراو لە بارەی چەند جۆراو جۆرییەکی هەرێمی لە ڕووی تەکنۆلۆژیاوە، دەرکەوتووەکانی چینەکانی هەرە سەروی چەرمۆ و عەلیاغا و چینە بنچینەییەکانی حەسوونە ڕەنگبێ لە دەوروبەری هەمان کاتدا گەشەیان سەندبێت.

پێویست ناکا وەك ئەوەی جارێك کردمان، ئەوە بکەین، کە عەلیاغا گوزارشت لە قۆناغێکی کرۆنۆلۆژی تەواو دەکات تاوەکو بخرێتە نێوان ئەو دوانەی دیکەوە (Braidwood et al, 1954).

## قەڵای چەرمۆ

هەروەها ڕەنگبێ لەدیاردیدەکانی سەر ڕووی عەرزی ئێستاکەشدا دەربکەوێت، کە بەشی مایەوەی گوندە ئەسڵییەکە نزیکەی ٣,٢ ئاکراس (١,٣ هیکتار) یاخود نزیکەی ١٣,٠٠٠ مەتری چوارگۆشە دەگرێتەوە.

بە گوێرەی بۆچوونی رایت (بڕوانە ل.    ) ئەوەندەی سێیەکێکی ڕووبەری ئەسڵی گوندەکە لە لای باکووری ڕۆژئاواوە پێدەچیێ بە هۆی ئاوی شێوەکەوە دامالڕابێت (    ،. fig،P1. 8B ).

ئەو ڕووبەرانەی لە لایەن نێردەکەوە[٤] دەرخران بەگشتی نزیکەی ١,٣٧٠ مەتری چوارگۆشە بوون و لە چەند بارێکیشدا تەنها بۆ قولاّیی مەترێك یاخود کەمتر دەبوون.

(٤) کاری دیتنکاری لەماوەی وەرزی ٥١/١٩٥٠ لەلایەن ئادامز (Adams) و لە ماوەی وەرزی ٥٥/١٩٥٤یشدا لەلایەن برۆمان-ەوە سەرپەرشتیکرا، تێبینیە دیتنکاریەکانیان بۆ وەسفی دواتر بەکارهێندراون. توێژینەوەی ئادامز دەربارەی گلێنەکانی وەرزی ٥١/١٩٥٠ توێژینەوەکانی ماتسۆن و کالدولێشیان خرایەسەر، کە هەروەها لێرەدا پشتیان پیێ بەستراوە.



کردە گەورەترەکانی یەکەم و دووەم وەرز یەکسەر لە گردەکەدا کران، لەسەر ڕووبەرێکی ٣٥٠ مەتری چوارگۆشەدا، هەروەها لە قولّی نزیکەی حەوت مەتر لە ژێر تروپکی گردەکە، ١٣٠ مەتری چوارگۆشەی خولّی پاك دەرخرا.

گەر پڕۆفایلی هەڵکەندنی هەنگاوێك بە گوێرەی ڕوخساری کەندەلاّنەکە (bluff) (کردەی A ) لێکبدەینەوە، ئەوا شەش قاتی هەیە لە گەورەترین کردەدا دەرخران (II)، هێڵەکانی نزیکەی شازدە قات یاخود چینی پێکهاتووی خودان ساچمەی پاشماوەی ژیان ڕەنگبیێ بژمێردرێن.

لە دەستپێکردنی کردەکەماندا (I)، ڕووی عەرزەکەی بە شێوەیەکی گرنگ لە ڕووی بەرزایەوە لە تروپکەکە نزمترە، تەنها هەشت "قات"ی گەورە لەسەر خوڵی پاك-دا دەرکەوتن، کە یەك تا دوو لەو قاتانە دابەشکران (ژووری دیکە) یاخود نۆژەنکردنەوەی نا سەرەکیان هەبوو.

کردەی دووەم تەنها گەیشتە قاتی شەشەمی لە ژێر ڕووی عەرزەکەدا، ئەستوراییی ئەم پاشماوەی ساچمەکانی نیشتەجیێ بوون (Occupational debris) لە نیوەی ئەستورای گشتی لە دەوروبەری کردەی (A)دا تێبینی کرا، کەمتر بوو.

ئینجا کاتێك وەرزی سێیەم دەستی پێکرد، بە شێوەیەکی هەڵەشانە (roshiy) گریمانکرد، کەلە قولّیدا بە تەواوی چەرمۆ-مان سوستە وەرگر (sampled) کردووە.

لەبەر ئەوە، بڕیارماندا هەولّی دەرخستنێکی ڕەنگڕێژی گوندەکە لە چینەکانی هەرە سەرەوەدا لە ڕووی پانییەوە، بدەین.

ئەزموونەکانمان ئاماژەیان بەوەدا، کە ئەم کارە دەستەی ئاسایی خۆمان و تاقمەیەکی (crew) پەنجا هەڵکۆڵە ڕیشی دەوێت بۆ نزیکەی دە وەرزی هەڵکەندنی یەك بە دوای یەك بۆ ڕامالّینی تەواوی ڕووی عەرزی چەرمۆ بە ڕێگەیەکی خێرای دەستەبەرکراو، دواجار بۆ تەنها قولاّیی ئەوپەڕی نزیکەی ٢ مەتر.

بە دڵنیاییەوە بۆ بەتاڵکردنی گردەکە بە تەواوی زیاتر لە بیست و پێنج وەرزی هەڵکەندنی دەخایاند. بەداخەوە، شوێنەوارناسان لەبەر چەند هۆکارێکی جیاواز، چ ئابووری بێت چ

قەرزاری خاتو برۆمانین بۆ تێبینیەکانی دەربارەی پەیکەرۆکە قوڕینەکان، قەرزاری لیندا بریدووین بۆ تێبینیەکانی دەربارەی ئامرازە بەردەستیێ و ئۆبزیدیەکان، قەرزاری ئادەمزین بۆ تێبینیەکانی دەربارەی دەفرە بەردینەکان، هەروەها قەرزاری هاتولا مۆهۆلی ناگیین بۆ تێبینیەکانی دەربارەی کەل و پەلە بچوکترەکانی (ground stone).





ستراتیژ، ڕەنگبێ بولدۆزەر لە شوێنەکانی ئەم جۆرە بەکارنەهێنن و ڕامالینی (stripping) چەرمۆش بە تەواوی شتێکی نەشیاو بوو.

کورتە ڕێگەیەکی پێویستبوو.

ئەو کورتە ڕێگایەی دامانهێنا بۆ ڕەنگرێژیکردنی تۆڕە چوارگۆشەی ٦x٥ مەتر بوو ( 6P1. 8 fig) هەروەها بۆ هەڵکەندنی ئەزموونی ٢ مەتری چوارگۆشە بوو لە یەکەی تۆڕی چوارگۆشە (grid)دا بەقەدەر ئەوەندەی پارە و کات بواربدات.

هەماهەنگییەکانی تۆڕی چوارگۆشەیی بۆ کورتکردنەوەی (intercept) ئەو توخمە ڕۆنانسازیانە بوون، کە لە کردەی یەکەم  دووەمدا لە گۆشەیەکی ٤٥ْدا زانیبوومانن (Cf. P1. 13B).

دیاردیانەکانی ڕووی دەرەوە (المؤشرات السطحية) ئەوەیان پێشنیار کرد، کە نزیکەی ٣٦٠ دانە لەم یەکە تۆڕە چوارگۆشانە بگەنە پاشماوەی ساچمەکانی نیشتەجێبوون ( Occupational debris)، کەلە دەرخستنەکانی وەرزەکانی زوترماندا تاقینەکرابوونەوە.

ڕێوشوێنمان گرتە بەر بۆ هەڵکەندنی ١٥١ چاڵی تاقیکردنەوە لە ماوەی بەهاری ١٩٥٥دا.

قولایی چاڵەکان بەو شەقلانەی تیایدا لە ناو دەردەکەوتن دەگۆڕا، تێکرای قوڵی نزیکەی ١,٧٥ مەتر بوو، جگە لە تاقیکردنەوەیەك نەبێت لە سەنتەری باشووری گردەکەدا، نزیکەی ٤ مەتر لە ژێر ڕووی عەرزەکەدا لەو خاڵەوە، گەیەندرایە قوڵی پاك.

بەداخەوە، ئەوەی ئەم سیستەمەی چاڵ تاقیکردنەوەیە پیشانیداین ئەوەیە، کە زۆر بە ڕووی کورتە ڕێگا بۆ تاقیکرنەوەی ئەوەی لەژێر زەویدا بەڕێوە دەچیّ، نین.

بڕگە پچڕ پچڕەکان (intermittent section) هێژ دەبێت بە درێژی بکۆڵدرێتەوە، بەلاّم وا دەردەکەویّ، کە هەڵسەنگاندنی ئەو بڕگە واتادارانەی بە تەواوی بۆ لێکۆڵینەوەکان هیوامان پێیانبوو، ڕەنگبێ نەشیاوبن.

چینەکانی (strata) ژێر زەوی شوێنە شوێنەوارییەکان ڕەنگبێ بە ڕێگا گەلێك زەویدا ڕۆبچن (pitch) و بەرز ببنەوە (toss)، کە هێڵە کونتورییەکانی ڕووی دەرەوەی ئێستاکەیان کەم ئەوە پێشنیار دەکەن، پێوەری وێناکردنی هۆڵی گوتارە تەقلیدییەکانی شوێنەوارناسینیش، کە چینەکان لە گردێکدا وەك چینەکانی کێکێك بن، ئەوە سادەکردنێکی زۆر زۆر گەورەیە.



بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی چینەکان (pitcging and tossing) لە چەرمۆدا وادەرکەوت لە چەند بەشێکی گردەکە زیاتر بێت.

ئەوەی بە گشتی چوارگۆشەی تاقیکردنەوەکانمان پێشنیاری دەکات لە لایەن پلانی ڕەنگرێژییەکەوە ئاماژەی پێدەدرێت (ش.٦٠).

کۆمەڵەی چوارگۆشەکانی بەخاڵ خاڵکردنی بچووك (stippling) جیاکراونەتەوە (بۆ نموونە چوارگۆشەکانی S13،R1a، p17،N18، etc ) دەرکەوتنی ڕووی عەرزی ناوچەی مەتریاڵە خۆڵەمێشییە خاکییە تەواوەکان پێشان دەدات، کە بەرەوخوار بە ئاراستەی ڕۆژئاوا نزم دەبێتەوە و بە ژێر چینی شەشەمی کردەی دووەمدا دەڕوات.

ئەو کۆمەڵە چوارگۆشەیەش، کە بە شێوەی جیاواز بە هۆی خاڵ خاڵکردنی بچووکەوە جیاکراونەتەوە (بۆ نموونە H9) نیشانە بە ڕووبەرێکی تایبەتی دەکەن، کە بە قولاّیی ٢ مەتر شەقڵێکی ڕونانسازی تێدانییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە پێکهاتەیەك و لیتەیەکی نارنجی – پرتەقاڵی زەردی خودان چڕبوونەوەی جاربەجاری چینە قوڕی بەسەر یەکدا کەوتووی سالاّنەی (Varved band) لیتەی پاکی، تێدایە.

بە شێوەیەکی ڕوون و بەرچاویش پاشماوەی یەکبەدوای یەکی ئەستێڵی قوڕی وشکبووەوە ( mud puddle) لە نزماییەکان (depressions)دا دەبینرێن.

(ڕایت لەکاتی تاقیکردنەوەی بەشەکانی ناوەوەی خانووە خشتە قوڕەکانی بەم دوایانە کاولبووی باشووری کەرکوك-دا هەمان دیاردەی تێبینی کرد).

لەژێر قولاّیی دوو مەتردا، چاڵەکانی تاقیکردنەوە لەم ڕووبەرەدا شوێنەوارەکانی ڕۆنانسازی و چڕبوونەوەکانی سواڵەتیش دەخەنە بەردەست.

سواڵەتەکان (potsherd) بە ژمارەیەکی زۆر کەم لە کردەی یەکەمدا بە بڕێکیش لە بەشی ڕۆژئاوای کردەی دووەمدا دەرکەوتن.

لە نێو ڕووبەرەکەدا، کەبە وردی بە هۆی چاڵەکانییەوە تاقیکرایەوە، سواڵەت دۆزرانەوە بۆ ئەوەی لە نزیك ڕووی عەرز تەنها لە سیّ خاڵی پەرش و بلاّودا چڕ بکرێنەوە (لە نزیکی K23، X16،L12 and، دوا بەشی چڕبوونەوەکە لە بەشی ڕۆژئاوای کردەی دووەمدایە).

چاڵەکانی تاقیکردنەوەی دەوروبەری (T16،U15،V14 and ) یەکسەر لەژێر رووی عەرزەکە شوێنەواری چەند چینێکی ساچمە رێژکردنی (pebble paving) بەردە لمی درزبردوو (Cracked)یان، خستە بەردەست.

هەرچۆنێك بێت، چەرمۆ شوێنێکی شلۆاوی نا سەرەکیانە نەبوو، بە شێوەیەکی روون و بەرچاو نە کێشی ستراتیگرافیەکەش پشت بە پێکهاتە ئەسڵییەکانی دەبەستێت.

جگە لە چەند پارچە ناڵێکی ئێستر و مێخی ئاسن و قەوانە فیشەکی زەردی (brass) تفەنگ و پارچە دەسکەڵە (bottle)ی شووشەی نوێ، ئەوا چەرمۆ خۆی لە خۆیدا لەسەر بنەمایەکی تۆکمەی چەسپاوە.

سەرەڕای ئەوە، هەر پێشنیارکردنێکی ئەوەی، کە چوار چڕبوونەوەوەکەی سواڵەتەکانی نزیك رووی عەرز ئاماژە بە نیشتە جێبونێکی گرنگانەی دواتری (چوار خانووی پەرش و بلاّو) بدەن، ئەوا بۆ تاقیکردنەوە نابێت. هەروەها چڕبوونەوەی جار بەجاری سواڵەتی تۆکمە و سواڵەتی هاوشێوەی گلێنە کەوچەکانی وەك سواڵەتەکانی بنکی رووبەری لە لیتە پێکهاتووی دەوروبەری (H9) لە قولاّیی زیاتر لە دوو مەتردا هەن.

هەروەها ئەو راستییە هەیە، کە گشت پۆلە دەستکردەکانی دیکە (بۆ نموونە بەردە شێکاری)، کە لە چوار رووبەری نزیك بەچڕبوونەوەی گلێنەی رووی عەرزدا دۆزراونەتەوە، بریتیین لە بەشە تۆکمەکانی کۆمەڵگەی چەرمۆی گشتی. لە راستیدا، گلێنەکان لە دوای بەشی ماوەی گوندی چەرمۆدا خۆیان دەردەخەن، ئەو گلێنانە چ لە قولاّیی دوو مەتر زیاتر لەژێر رووی عەرزەوە چ لە چینی پێنجەم لە خوارتر (کۆنتر)، لە کردەی دووەمدا نەدۆزرانەوە.

ماوەی گشتی چەرمۆ دەبێت زۆری نەخایاندبێت. لە گوندەکانی دراوسێی چەرمۆ ئەوە فێربووبن، کە پێدەچێ تێکڕای بواردانی زۆری ماوەی تەمەنی خانووی شێو نەگرتوو ناڕێکی (casually)دیوار لە قوڕی وشککراوە بە خۆر دروستکراو و بەقوڕ خۆڵە بانکراو ( mud-finished roof)، یازدە ساڵ دەبێت.

گەر هەریەك لەو شازدە قاتانەی پێشتر باسکران مانای نۆژەنکرنەوەیەکی جودای رۆنانسازی بگەیەنێت (رەنگبێ هەر یەکێکیشیان ئەو مانایە نەگەیەنێت)، بە لایەنی کەمەوە ماوەی گشتی تەنها نزیکەی ٢٥٠ ساڵ بووە.



لە کۆتایدا، پێش ئەوەی کۆمەڵگەی چەرمۆ وەسف بکەین، پێویستە ئەوە تێبینی بکەین، کە هێندێك خۆڵ چ لە بنار (piedmont) و چ لە ناوچەی گردی بناردا شوێنەوارەکانی داشۆڕان (leaching) و دروستبوونی کۆنکرێتەکانی بەردە لمی بچووك، پێشان دەدات.

ئەمەش بریتییە لە شەقڵێك لە مێژووی دروستبوونی جۆرە خۆڵێکی خودان پێکهاتەیەکی لمی بالاّ و بەهۆی تێخزانی ئاوی باران بە نێو (humus)دا، داشۆڕانی بەلایەنی کەمەوە هێندێك لە کاربۆنەکان و دروستبوونی نێو بەسەریەکدا کەوتوە کە نوێکانیان (شلبوونەوەی نێو بەردی کونۆچکەدار) (redeposition) لە نێو بارستەی بچووك (nodules) یاخود کۆنکرێتەکاندا دروست دەبێت.

ناوچەی ئاو تێخزان و کۆنکرێتەکان لە چەرمۆدا باش جیادەکرایەوە، هەروەها هێندێك لە ناوچەکانی دیکەمان ئەو دیاردەیان پیشاندا.

ناوچەی کۆنکرێتە تێخزاوەکان لە چەرمۆ لە خۆڵی ئاسایی پێکهاتوو لە پاشماوەی ساچمەکانی نیشتەجێبوون (occupational debris)دا دەگاتە نزیکەی ١,٥ مەتر.

رایت بە رێکەوت باوەڕی وایە هۆکارگەلێکی جۆراوجۆر هەن گلاونەتە ئەم پرۆسەیەوە هەرگیز ئەو پرسەیە وەك دیارخەرێکی کرۆنۆلۆژی راست و دروست سوود بەخش ناکەن.

لە چەرمۆدا وا دیار بوو تۆکمەیی ئەسڵی عەرزی دیوارە مۆرەکان (tauf) بۆ قولاّیی کۆنکرێتی بەردە لمەکان دارِمابێت.

هەروەها ئەمەش ئەوپەڕی قولاّیی نزیکەیی رووەکە زۆر رەگ داکوتراوەکانی وەك رووەکە دڕکدارە گەورەکانە.

لەبەر ئەوە تەنها ئەو هێما رۆنانسازیانەی لە سەرووی نزیکەی مەتر و نیوێك قولّیدا توانیمان نەخشەکێشان بکەین، بریتیبوون لە بوون و رێزکردنی ئەو بەردانەی وك بناخەی دیوار یاخود بەردڕێژکردن (pavement) (P1. 13B) بەکارهێندراون و رووبەری زۆر سوربوونەوەی ئاگردان یاخود فڕنەکانیش هەبوون.

لەژێر ئەم قولاّیەشدا ئەگەری رەنگرێژکردنی دیواری قوڕین (tauf) بە خێرایی زیادی کردووە.

خانووەکانی چەرمۆ بەزۆری لەسەر بناخەی بەردی زبر، لەقوڕ (tauf) دروستکراون.





هاوواتای کتومتی ئینگلیزی بۆ وشەی (**طوف**)ی عەرەبی نییە.

وشەی (pisē)ی فەرەنسیش بە زۆری لە گوتارە بڵاوکراوە شوێنەوارییەکاندا بەکارهێندراوە، بەڵام لەوەدا ناکتومەتە، کە تیل نیشانی فشارکردنی قوڕی شلتری نێوان قاڵبە دروستکراوەکان دەکات. وشەی (adobe) ئەمریکی ئیسپانیش، یان قوڕی بەخۆر وشکراوەی سادەیان دیواری خشتە قوڕی بەخۆر وشکراوە دەگرێتەوە.

لە عێراقدا هێژ دیواری قوڕین (tauf) بە شێوەیەکی گشتی وەك دیواری باخچە یاخود هەسار بەکاردەهێندرێت، هەروەها نە قاڵب بەکاردەهێنرێن و" نە دیوارە قورینەکۆنەکانیش (tauf) شوێنەواری ئینتیباعی قاڵبەکان پێشان دەدەن.

دیواری قوڕین (tauf) لە قوڕێکی تێکەڵی تەواو شل دروست دەکرێت بۆ ئەوەی خواروترین ڕیز (course) بەدەستی ڕۆنەر (وەستا) بۆ بەرزی نزیکەی ٣ تا ٤ ئینج بەبێ کەوتن شێوە وەربگرێت، ڕوویەکی ستویشی لە بەرامبەر لاکەی تردا هەیە.

"ڕیزی" یەکەم دادەنرێت، ئینجا ڕۆنەر بە شێوەیەکی سادە پێش ئەوەی "ڕیزی" دووەمی بخاتە سەر ڕۆژێك یاخود تاوەکو تەواو بەخوار وشکدەبێتەوە چاوەڕوان دەکات، دوای ئەوەش دووبارە دەبێت ڕۆنەر چاوەڕوان بکات، هەروەها بەم شێوەیە.

تێکەڵە قوڕەکە لە کا (straw) یاخود گیا پێك دێت بۆ ڕێگرتن لەدرز بردن (cracking)، هەروەك کا- یان- گیا کتومت بۆ ئامادەکردنی خشتەقوڕی بەخۆر وشککراوەی دواتر (لبن) بەکار هێندراوە.

ڕەنگرێژیکردنی دیواری مۆرە (Tauf)لە کۆنتێکستی شوێنەواریدا کردەیەکی لاوازە.

کۆتەرە (stub)ی دیوارەکە هەمیشە بە بەرزیەك دەمێنێتەوە لە ٢ تا٣ پیچ تێناپەڕێ.

کاتێك کەسێك کۆتەرەکە دەدۆزێتەوە، (دەبینێ) بە تەوفی لە بەر یەك هەڵوەشاوی بەشەکانی سەرەوەی هەمان دیوار (هەروەها لەت و پارچە خۆڵەکانیی [کەستەڵە گڵ [earth debris- لە سەربانەکەوە کەوتبوون) دەورەدراوە، کە کاتێك ڕۆندراوەکە ڕۆخاوە ئەوانەش هەڵوەڕاون (tumbled down).

کۆمەڵە خۆڵی تەوفی لەبەر یەك هەڵوەشاو (tauf- disintegration product) لە هەمان جۆری گشتی و پێکهاتەی وەك خودی کۆتەرەی دیوارەکەیە.



بەڵام کۆمەڵە گڵە لەبەریەك هەڵوەشاوەکە ئەو تەختە تیکە (Cleavage planes) ستونیانەی نییە، کە ڕووە ئەسڵییەکانی خودی دیوارە هەیانبووە، هەروەها کۆمەڵە گڵەکە ڕیزی چینە ئاسۆییەکانی لە شوێنی خۆیدا پێشان نادات.

ڕیزی چینە ئاسۆییەکان (Horizontal bedding lines) لە تەپڵە سەری هەر "ڕیز" یکدا دەردەکەوتن، ڕەنگبێ ئەوانەش بەهۆی دروسبوونی جۆرە دەزولەیەکی ئاومژ (capillary)ی قوڕی پاکتر بۆ ڕووی هەر "ڕیز" یکەوە بن، کاتێك ڕیزەکە وشکدەبێتەوە.

ڕیزە چینەکان وەك هێڵی ئاسۆیی پشتێنە قوڕی پاکتر و ڕوونتر (یاخود تاوتاویش تاریتر) بە ئەستوری نزیکەی نیو ئینچێك دەردەکەون. تەوەروەشێنی باش ڕاهاتوو بۆ ئەوەی بە سوکە لێدان (light taps) "هەست" بە تەختە تیکە ستونییەکانی ( Vertical cleavage planes) ڕووی دیوارەکان بکات بە تەورێکی یەك نوکی بچووك ( light single- tined pick) بەکاردەهێنێت.

هەروەها لە هەمان کاتدا بە وردی چاو بەدوای نیشانەکانی قاڵبە خۆڵی بە-کا- پتەوکراوی لەبەر یەك هەڵوەشاوە و هێڵی چینە ئاسۆییەکاندا دەگێڕێت.

سەرەڕای ئەوەی هێندێك لە میوانەکانمان لە کۆمپانیای پترۆلیۆمی عێراقی لەسەر ئەوە ڕشتبوون، کە بە شێوەیەکی سادە دیوارە قوڕینەکانمان دروستکردوون کاتێك هەڵمانکەندوون، بەڵام دیواری تەوف شیاوی هاوڕێکبوونن، هەروەها لەسەر ئەو بناخە بەردانەی لەژێریانەوەن فیتاوفیت دەبن.

خانوو نموونەی چەرمۆ خانوویەکی ئاڵۆزی ئەوپەڕی باشوورە لە چینی پێنجەمی کردەی دووەمدا (P1. 1AA).

ئەو خانووە بناخەی بەردە (stone- founded) و دیوارەکانیش قوڕن (tauf- walled)، لە ڕەنگرێژیدا ڕاست و ڕێکە (Rectilinear)، بە نزیکەی ١٥-ی ڕۆژئاوای باکوور نواڕیوویەتە ڕۆژهەڵات.

بەرەو ڕۆژهەڵات (ئەوەندەی دۆزینکارییەکمان بەرێوەچوون) ڕووبەرێکی واڵا هەبوو" یەکسەر لە نزیکی باکوورەوەیە (هەروەها ڕەنگبێ بەرەو باشووریش) خانووی دیکە هەبووبن.

لە درێژایی چەند بۆشاییەکی واڵا (ژوور) هەسارێکی بەدیوار (بێگومان سەرپۆش نەکراووبوە) بۆ ئەوەی لە لای ڕۆژئاواوە خانووەکە دەور بدات، دەرکەوت.





دیوارەکانی سنووری باکوور و باشووری خانووەکە لەوانەی یەکسەر لەو نزیکانەوەن جیاوازبوونە؛ لادیوارەکانیش (party walls) بەکارنەهاتوون. نێوەوەی خانووەکە بۆ حەوت بۆشایی (ژوور) ڕاست و ڕێك دابەشکراوە، ئەوە روون نەبۆتەوە ئاخۆ لە راستیدا گشت ئەم بۆشاییانە ژووربوونە یان نا، رەنگبێ بەش بەشکردنی قوڕەکانیش (tauf) بەتەواوی نەگەیەندرابنە کاشخانکەکەوە (ceiling).

ژوورێکی درێژ (٢,٢x٥,٦ مەتر) بە درێژایی لای پێشەوەی رۆژهەڵاتی خانووەکە باکوور-باشووری گرتووە، داڵانێکی بەرتەسك بەدرێژای لای پێشەوەی باشوور ڕێگەی گەیاندۆتە ئەم ژوورە، هەروەها پێدەچێ بەنێو دیواری رۆژهەڵاتدا (لە نزیك سوچی باشووری رۆژهەڵاتدا) دەرگایەك هەبووبێت.

پارچە پەردەیەکی دیواری تەوف هەبوو، کە بەڕوون و ئاشکرایی خراوەتە سەر چینە قامیشکە (reed flooring)* بۆ جیاکردنەوەی هەردوو نیوەی باکوور و باشووری ژوورە درێژەکە.

شێواز(arrangement)ی ڕێکخستنی چوار "ژوورەکان"ی باکووری داڵانەکە بەدرێژایی لای رۆژئاوای خانووەکە شێوازێکی بەیەکەوەلکاو (Compact) بوو، هەروەها هەر ژوورێك زۆر بچووکبوو (لەدەوری ١,٥x٢,٠ مەتر) بوون.

یەکێك لەم "ژوورانە" تەندۆرێکی تێدابوو، کەلە هەسارەکەوە لە لای رۆژئاواوە گردراوە، دوو "ژوورەکە"ی باکووری ژووری یەکەم پێدەچێ کەندوو بووبن (bin) بۆ هەڵگرتنی دانەوێڵە، هەروەها "ژوور"ەکەی رۆژهەڵات رەنگبێ ئەویش بۆ دانەوێڵە تیاهەڵگرتن بەکارهێنرابێت.

هۆو پێناوی هاتن و چوون (circulation) لە نێو ئەم یەکە بەیەکەوە لکاوانە (complex)دا روون نەبوو؛ پێدەچێ کە بەش بەشکردنەکان نزم بووبن و پێشدەچێ کەلە داڵانەکەوە لە لای باشوورەوە خشابنە نێو یەکە ژوور بەیەکەوە لکاوەکانەوە (complex).

کەوابوو، هێندێك کاریگەری گەرمکردنەوە و وشککردنەوەی تەندورەکە پێدەچێ بۆ تەواوی خانووەکە گوێزرابێتەوە.

* دیاردەی قوردانی هەردوولای چەپەر یاخود چیغ بۆ جیاکردنەوەی یا روونتر بلێیین بۆ دوو بەشکردنی ژورێك ئێستا کە لەلای زۆرێك لە گوندەنشینەکانی کوردەواری بەردەوامە و بە ((تانۆك)) نێودەبرێت _وەرگێڕ.



گومانی تێدا نییە چێشت لێنان لەلای رۆژئاوای هەسارەکەدا کراوە؛ چەند پارچە دەستاڕێکی دانەوێڵە وردکردن (cracking) یا هاڕین (grinding) لەسەر قاتە سادەکەی حەوشەکەدا دەرکەوتن.

پێشنیارکراوە (Braid wood et al p. 526, 1953)، کە ئەم تەندورانە بۆ مەبەستی دانەوێڵە سوورکردنەوە (parching) یا "برژاندن" (popping) بوونە، نەك بۆ مەبەستی نان کردن، بەلاّم گەواهییەکی راشکاوی برژاندنەکە نییە.

بە شێوەیەکی گشتی عەرز (floor)ی نێوەوەی خانووەکانی چەرمۆ لە چینێکی تەنکی کۆکراوەی پاك لەسەر چینە قامیشان پێکهاتوون.

بەکارهێنانی چینی قامیش بۆ قاتەکانی عەرز بە شێوەیەکی گشتی لەژێر هێڵی داشۆرانەکەدا تێبینی کرا.

ماقوڵە گریمان بکرێت، کە دیواری ناوەڕاست (central partition) لە خانووی نێوبراودا (کە ژوورە درێژەکەی لە لای رۆژهەڵاتەوە لە کەندوی کۆمپلێکسی تەندوورەکە جیاکردۆتەوە) بەرزبۆتەوە تاوەکو بۆ سەربانێکی نزمی سادەی دوولا لێژ (gable) بۆتە دینگە دیوارێکی-کاریتە ئاسا (ridge- bearing point)، سەربانەکە بە کژورەکی کژۆڵە** ( rafters of sapling) دروستکراوە، کە توێکڵە قامیش یا دەوەن (brush) بەسەربانەکەدا داهێلراون ئینجا قوڕیان لە نێو رۆکراوە و پاڵ و ڕێك کراوە [واتە قوڕە پەستکراوە ( puddled and packed)) تاوەکو رووی سەربانەکە دروستبووە.

بە لایەنی کەمەوە، ئەم (کارە) ئێستاکە لە گوندەکانی دەوروبەردا پراکتیزە دەکرێت.

درێژە پێدانەکانی تەندورێکی قوڕین لە پاشماوە ساغترەکانی خانوویەکدا لە کردەی دووەم ٦-دا باشتر بینرانەوە (P1. 1AB).

لێرەدا دووبارە، ئەو فڕنەی وا دیاربوو بە تەواوی بەقوڕ (Tauf) گومەز خڕکرابێت ( domed over)، لە ڕێگەی دەرچەیەکی تاڕادەیەك شێوە کێڵە (Shaped- scoop)***ی بچووك لە

** (١)کژورەك= خێزەر، تەختە (یا پێ راهێڵ)ی سەری دارەڕا بەپانی دابنرێ.
(٢) کژۆڵە= چرپێ و ئالاّش بۆبن قوڕەبان.

*** (١) کێڵە= کەوێژ، بریتیە لە پێنوێك دەغڵ و دانی پێدەردەهێنن.

چینی قاتی عەرزیدا لە ژووری تەنیشتییەوە (نزیکترین لێی) یا (پتر پێدەچێ لە هەسارەکەوە گردرا بێت.

دوکەڵ کێشەکە لە برگەدا نیمچە بازنەیی بوو. (بەنێو کەرەنا (flue)ەکەدا) هەروەها راستەوخۆ لەسەرووی کەلێنی دەرچەی سوتەمەنی شێوە- کێلەکەدا تێکەڵ بە دیوارە قورەکە بووە.

قاتی تەندورەکە کەمێك لە قاتی دەرچەی سوتەمەنی (دەوری ٢٥سم) بەرزتر بووە هەروەها بەرەبەرە بەرەوپشتی تەندورەکە لار بۆتەوە.

هەریەك لەدوو قاتەکە لە چینێکی دەرەوەی قوڕی لیتەیی پاك پێکهاتووە، کە رۆگێراون (burnish)* و بەئاگریش رەقبوونە (fire- hardened)*، لەسەر چینە بناخەیەکی تەنکی خۆڵ و بەرد و چەوی کرێتی باش تێکەڵکراو بە —کا-. [ئەمەکراوە].

بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا ئەم رووی دەرەوەی عەرزانە بەخێرایی [بەئاسانی] درزیان بردووە، چونکە پاشماوەکانی تەندوورەکە کەژمارەیەك عەرز رۆگرتنەوەی دووبارە (reflooring)یان پێشانددا.

کا تێکەڵکردنی زۆری بەکارهاتوو لەم قاتانەدا هێندێك لە باشترین شێوەکانی دانەوێڵەیان (ئەوانە هەڵێك پێشتر دۆزیبونییەوە-ئاسۆس) خستە بەردەستی هەڵبێك.

خانووە پارچە پارچەکە لە کردەی دووەم -٦- دا (p1. 1AB) دوو شەقڵی دیکەی سەرنج راکێش پێشاندەدات.

رووی دەرەوەی دالآنەکە بەرەو نێو ژووری تەندوورەکە کەلەبەرێکی چوارچێوەی دەرگا (recessed jamb)ی تێگیراوە، دەکرێ گریمان بکرێ بۆ ئەوەیە خودی دەرگاکە بتوانێ بە تەواوی فیتی نێو کەڵەبەرەکە بێت.

دانانی تەختە بەردێك لە نێو دیواری پشتەوەی ژوورەکەدا لەسەر تەختە بەردەکەدا لەنێو دیوارە قورەکە (Tauf)دا دەربیجەیەك (Slit)* هەبووە.

(٢) رۆگۆتن (burnish) تاس و لوس دانی قوڕی قاتی عەرزی نێو خانووی قوڕە، بەگڵ لەجیاتی چیمەنتۆ _وەرگێڕ.

* (٣) fire- hardened، شوێنێکە ئاگری لەسەر کرابێتەوە.

* (١) دەربیجە= قولێر، کونی رووناکی لە ژووردا.

* (٢) رێسمانە، داری نێوان رێسمەی سەرەوە و خوارەوەیە.





بە شێوەیەکی روون و بەرچاو ئەم دەربیجەیە پەنجەرەیەکی تەنك (دەلاقە)ی خودان ژێر بەردە پەنجەرە (stone sill) بووە، لەگەڵ ئەوەشدا پێدەچێ ئەم پەنجەرەیە لە دیوارێکی دەرەوەدا نەبووبێت.

سەرەڕای ئەوە هەریەك لەم توخمانەی خوارە و لە دالأنی نێو براودا لەدەست دراون.

بە شێوەیەکی روون و بەرچاو خستە چوارچێوەی دەرگا لە چەرمۆدا شێوازێکی سەرەتایی (Rough) دروستکردنی دەرگای بەکارهێناوە (لە رووی شێوە سەرەتاییانەی تەختەی وەرئاڵێندراو (dressed) یا تەنی پێستە پۆشکراوەوە؟) لەسەر رێسمانەیەکی ستونی ( Vertical swivel- post)* خودان توخمەکانی راگرتنی رێسمانەکە لە سەرەوە و خوارەوەی دەرگاکەدا.

نموونەگەلێکی لە جێگای خۆیاندا هەن، ئەوە پێشاندەدەن، کە لای خوارەوەی رێسمانەکە ( -post swivel) لە گرێژەنەیەکی (stone door socket)* وەك ئاونگێکی ئاساییدا خولاوەتەوە.

لای سەرەوەی رێسمانەکە بە هۆی بەردێکی درێژەوە راگیرکراوە، زۆرترینی بەردەکەش دەبێت لەسەرچوار چێوەکەدا بەشێوەیەکی ئاسۆیی لەنێو دیوارە قورەکەدا پاڵخرابێت جگە لە بەشە دەرپەڕیوە کۆکراوەکەی نەبێت بۆ ئەوەی رێسمانەکە رابگرێت (P1. 20:4).

هەروەها ئەم جۆرە بەردانە لە نزیکی دالأنەکەدا دۆزرانەوە" لایە (end) کونکراوەکان بەوردی تەواوکرابوون و تەنانەت جوانیشکرابوون، لە کاتێکدا لای قونچکەکان (butt) بەزبری بەجێهێڵدرابوون.

سەرەڕای ناتەواویان، بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا شێوەی رۆنانسازی چەرمۆ وێنەیەکی سەرەتاکانی هەستکردن نییە بە پیشگەرییەکی نوێ.

توانستەکییەکانی نەرم و شلی قوڕ (tauf) وەك مەتریاڵی خانوو دروستکردن وادیارە تەنانەت خەڵکی کۆنترین چینەکانیش دەبێت باش لێی تێبگەین، هەروەها ئەو رۆنانسازییەی ئێمە دۆزیمانەوە هیچ پێشکەوتنێکی تایبەتی لە ماوەی خەڵك تێدا نیشتەجێبوونی شوێنەکەدا دەرنخست.

هەوڵەکانمان بۆ گەیشتن بە بیرۆکەیەك لە بارەی

رەنگرێژی سەرلەبەر گوندەکە، تەنانەت لە چینەکانی هەرە سەرەوەشدا بێت، ئێستاشی لەگەڵ بێت بێ هیوا بوونە (بنوارە ل. ).

* گرێژەنە: پاژنەی دەرگا، ژێر رێسمە، شیمك (بەردێکە).

یەکە بە یەکەوە لکاوەکان (complex) لە کردەی دووەم -٥-دا بەروون و ئاشکرایی ئەوە پێشان دەدەن، کە خانووەکان بەیەك ریزی لەپاڵ یەك بە لایەنی کەمەوە لە دوو بەر (side)دا دروستکراون.

بەلاّم رووبەرە والاکانی لاکانی دیکە رەنگبێ فراوانبووبن" ئێمەش هیچ پێشنیارێکی چەسپاومان لە بارەی شتێکەوە نییە، کە لەوانە لە شەقام نزیك ببنەوە.

مەزندە دەکەین (Braid wood and Reed, 1957)، کە سەرجەمی ژمارەی خانووەکانی گوندی چەرمۆ پێدەچێ لە بیست و پێنج خانوو تێنەپەربێت، هەروەها مەزندە دەکەین، کە ژمارەی دانیشتوانی گوندەکە نەگەیشتبنە زیاتر لە ١٥٠ کەس.

لە هێندێك لە چینە کۆنترەکانی (lower) کردەی یەکەمدا کۆمەڵە چاڵێکی هێلکەیی سادەمان لە عەرزەکاندا (floors) دەستنیشانکردن، کە یەکەم جار بە //تەشتی گلێنەی لە شوێنی خۆیاندا کرێچن*\\ (baked- in- place pottery basin)، نێومانبردن لە کاتێکدا لە راستیدا رەنگبێ ئەمانە قژمۆك (receptacles)* بوون، هەروەها بەیەکەوە رێزیان بەدەوری کۆمەڵە ئاگردانێکی قوڕی لەو جۆرە دروستکردووە، کە تەنانەت ئێستاکە لە خانووە سادەترەکانی عەرەبی و کوردەواریدا ئاساییە.

هەرچۆنێك بێت، هێندێك لە //تەشتەکان\\ بەردی زبریان تێدابوو، کە پێدەچێ بە گەرمی وەك //بەردی کولاّندن\\ بەکارهێندرابن.

ئەم چاڵە ئاگردانە هێڵ بە دەوردا هاتووانە (fired clay- lined) دەبێت بە هەمان رێگەی تەندورە ناوبراوەکان ئامادەکرابن، لەگەڵ ئەوەشدا، کە تەندورە نێوبراوەکان بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا گومەز خڕکراون، بەلاّم رەنگبێ لەم بارەیەوە جیاوازییەك [خاڵێك] نەبێت زۆر بە تەواوی ئەم دوو جۆرە لە یەکتری جیابکاتەوە.

بە چەند وشەیەکی کەم، وا دەردەکەوێ بەڵگەیەك نەبێت، کە ئەم چاڵە هێلکەییانە قژمۆك (receptacles) بوونە یان نا، یاخود وەك پێشکەوتنێکی پێشوی دەفرە گلێنە خۆش راگوێزەکان (portable) دەربخرێن.

* (١) کرێچ: هەر چینێکی لە قوڕی سورکراوە دروستکرابێت.
* (٢) قژمۆك: قەپوشك= کاسەی گوڵ.





روونترین تۆماری دەفرە گلێنە خۆش راگوێزەکان لە بەشی رۆژئاوای کردەی دووەم، لە وەرزی ١٩٥٠/٥١-دا دۆزرایەوە، ئەم کورتە وەسفەی خوارەوەش لەسەر ئەو دۆزرانەوەیە بنیاد دەنرێت.

زۆرینەی سواڵەتەکان لە وەرزی هەڵکۆڵینی ١٩٥٤/٥٥-دابەدەست هێنران (بنوارە ل. ) رەنگبێ زانیارییەکان فراوانبکەن، بەلاّم بە شێوەیەکی سەرەکی گشتاندنەکانی دواتر ناگۆڕن.

سەرجەمی ٢٠٤ سواڵەت (کە ئادەمز باوەڕی وایە لە ٣٥-یان زیاتر بە دەفر دانانرێن) لە دۆزینەوەکانمان، لە وەرزی ١٩٥٠/٥١ لە قاتەکانی ٥و٤و٣-دا دەرکەوتن.

ژمارەی سواڵەتەکانی سەرقاتی پێنج (٥)، کە کەمترین گلێنەی تێدا دەرکەوتن، تەنها ٦٥ سواڵەت بوون.

گلێنەکانی قاتەکانی پێنج و چوار و سێ لەسەر بنەماکانی شێوەی دروستکردن (fabric) و تەکنیکی رووی دەرەوە (surface treatment) و جوانکاری (decoration) (لەگەڵ بەسەر بەیەکداچوونی چەشنی پەرەسەندنی کەلوپەلەکان لەسەر قاتەکانی ٣و٢-دا)بەئاسانی لە گلێنەکانی هەرسێ قاتی سێ و دوو و یەك جیا دەکرێنەوە.

هەرچۆنێك بێت ئادەمز دوو گروهەکە بە دوو گروهی گلێنەی جیاواز دانانێت و بەرچاوییەکی بەردەوامی گەورەیی تەقلیدی پیشەگەری سەرەڕای جیاوازی، دەبینێت.

گلێنەکانی چەرمۆ دروستکردن و لە رووی رەنگەوە بەلای رەنگی سەوزدا دەکەن (Vegetable- tempered)*، زەردێکی تۆخ بۆ پرتەقاڵی- زەردێکی تۆخ بۆ روپۆشکراون، هەروەها بە زۆری کرۆکێکی نەئۆکسێنراوی* تاری لەسەر قوڕێکی خۆش وردەشکێدا ( clean break)* دەردەخەن.

زیاتر لە نیوەی گروهی گلێنەکانی زووتر، بەزۆری لەسەر سواقێکی سوور (red slip) یا دیکۆراتیۆنێکی رەنگکراو، رووەکانی دەرەوەی لوس کراویان پێشاندەدات.

* (١) (vegetable- tempered): (المائل الى الاخضر)
* (٢) نەئۆکسێندراو (unoxidized).
* خۆش و وردەشکی (clean break)= خۆ نەگرتووە ئاسان بشکی و وردەبێ.

هێڵی سادەی شێوە ڕەنگراوەکان بە زۆری ڕێکوپێککردنی لاری (oblique) هێڵی خاڵە ڕەنگکراوەکان (blobbed) پێشان دەدەن (P1. 15:12- 17).

لەسەر هێندێك سواڵەتەکاندا ڕووشانەکان (scraches) بەژێر هێڵە ڕەنگکراوەکاندا درێژ دەبنەوە.

لەڕووی شێوەی سادەی خۆیەوە، گلێنە کۆنەکانی چەرمۆ توانای تەکنیکی لە گلێنەکاری (potting)دا پێشان دەدەن، هەروەها بەهیچ شێوەیەك پێناچێت، کە گوزارشت لە سەرەتاکانی هەستکردن بە پێشەگەرییەکی نوێ بکەن.

قاتەکانی هەرە سەرەوەی هەمان کردە (operation) نزیکەی ١٢,٠٠٠ سواڵەتی خستە بەردەست، بەلاّم ئەمانە وادەردەکەون لە نموونەگەلێکە کەم تواناتری هونەری گلێنەکارییەوە سەرچاوە بگرن.

ڕێگەی دروستکردنەکە (fabric) چ لەڕووی کرێتی و ناسکییەوە لە گروهی زووتر کرێتتر و ناسکترە، ڕووی دەرەوەی دەفرەکان وادەردەکەون کەمتر گرنگیان پێدرابێت، هەروەها شوێنەواری کەمی نەخشی ڕەنگکراو هەیە (P1. 15:1- 11).

ئارەزوویەکی گشتی هەبووە بۆ ئەستوورکردنی دیواری جەستەی تەواوی جۆری شێوە و قەبارەکان، لەگەڵ ئەوەشدا خۆش وردە شکی (clean break) خۆنەگرتوو ئاسان بشکێ و وردبێ (هەنووکە)* دەفرە گەورەکان بەڕەهایی دەردەکەوتن.

(ئێستاکە) نەخشاندنی نەرمۆڵە یا هەڵکەندنی (incised) دەرکەوت، هەروەها جۆرێکی ئاوازەی قولّپە* دەسك (lug handle)ی کونکراو دۆزرایەوە.

هەروەها لە کاتێکدا ئادەمز گۆڕانێکی تەواو لەجیاکردنەوەی تەقلیدی سیرامیکی گلێنەی کۆنتر و نوێتری چەرمۆدا نابینێت، هەریەك لە کالّدوێل و ماتسۆن هاوبەشییەتی (commonality) تەقلیدی گلێنەکاری گلێنەکانی نوێتری چەرمۆ لەگەڵ گلێنەکاری علیا ئاغا و چینە بنچینەییەکانی حەسوونە، جەخت دەکەنەوە (بڕوانە P1. 15:18).

* (١) هەنووکە= ئێستاکە، لەم دەستەواژەیەدا تەنها بۆ ڕونکردنەوەیە نەك ئاماژەدان بکات.

* (٢) قولّپە (lug)= قولّف، دەسکە گۆزە و چیتر.



لە کاتێکدا ڕێگەی دروستکردنی گلێنە نوێترەکانی چەرمۆ وادەردەکەوێ لە ڕێگەی دروستکردنی تەواوی گلێنە کۆنترەکان لەخوارتر بێت، ئەوا پێشنیاز دەکرێت، کە ڕەنگبێ جیاوازییەکە تا ڕادەیەك وابەستەی کاریگەرە کیمیاییەکانی خۆڵەکە بووبێت لە مەتر و نێوی هەر سەرەوەی چەرمۆدا (بڕوانە ل.       ) دوای سەردەمی خەڵك نیشتەجێبوون لە شوێنەکەدا.

ئەمە لایەنێکی ئەو توێژینەوە دوور و درێژی گلێنەکانە، کە ئێستا لە حاڵەتی پرۆسیستەکردن دایە، هاوشان لەگەڵ بیرکردنەوە لە دەرکەوتنی جۆری دیاریکراوی قەبارە و شێوەی گلێنەکانی (دەفر و ئامانی ماڵ) تایبەت بە بەکارهێنانی گونجاویان و ڕادەی دەلاّندنیان* (permeability) و هەروەها سەرنجدانی سەرنج ڕاکێش ئەوەیە، لە چینەکانی سەرەوەدا دەفری گلێنەی درێژ و گەورەتر دەردەکەون، کە جێگەی دەفرە بەردینە درێژە کۆنترەکان دەگرنەوە.

بەلاّم قاپە نزمەکان (پەلەکان) یا شێوەکان وەك ژێر پیاڵەی لەبەرد دروستکراو بەردەوامبدەن، لەبەر ئەوەی ڕەنگبێ دروستکردنی جۆرە رووبەبانە* فراوانەکان (broad open)ەکانی سیرامیك (profiles) فێربوونێکی ئاڵۆزتری گلێنەکاری لەوەی گلێنەکارەکان (potters)ی چەرمۆ مومارەسەیان کردووە، ویستبێت.

هەرچۆنێك بێت، ئادەمز بە تەواوی بەوە قایل نابێت، کە شوێن گرتنەوەکە ڕاستەوخۆ بێت و بەدڵنیایشەوە بەڵگەی جێگرتنەوەیەکی دەفرە بەردەکان لە لایەن دەفرە گلێنەکانەوە بە ژمارەیەکی زۆر لە نێو هێلی (Range) گوندی چەرمۆدا نابینێت.

کۆمەڵگەی چەرمۆ وا دەرناکەوێ کە کەلوپەلە قوڕینەکانی ئەو شێوانەی، کە بە شێوەیەکی روون مەبەستە بەسوودە تایبەتی و ڕاستەوخۆکان پێشنیار بکەن، دەوڵەمەند نەبووبێت.

موری و متە قوڕینەکان تەواو باو بوون، هەروەها بەم شێوانە دەرکەوتن: گۆیی (spherical) و هێلکەیی تەخت (flattened elliptical) و پیپ (barrel) و شێوە ئەڵماسی تەخت مورووی جووت کون (double- pierced “toggle”)یش دەرکەوتن.

ئامرازێکی گەورەی بە وردی دروستکراوی شێوە چنگی (سەگ)یش پێدەچێ هینینۆکی قیر (ئامرازی تیهەڵسوین) (bitumen- dauber) بووبێت دۆزرایەوە.

* (١) دەلاّندن= دادان=تکان، لێ چوونی شلە لە دەفرێك.

* (٢) رووبەبان= کاودز= چکی جك= قاپێ کە دیوی قوڵی بەرەو سەربێ.

قوچەکێکی قوڕینی خودان هەڵکەندنێکی زەمبەلەکی (spiral) بە وردی دروستکراو لەسەر بنکەکەی ڕەنگبێ وەك مۆری تەخت (stamp seal) بۆ سەر قوڕی تەڕ بەکارهێنرابێت، دۆزرایەوە، بەلاّم هیچ چاپکردنێکی شێوەی مۆرەکەمان نەدۆزیەوە.

ئەوە سوود وەرگرتنێکی ڕاستەوخۆی کەمی کاتێگۆری ئەو شێوانەیە، کە خەڵکی چەرمۆ ڕوونترین شوێنەواری تێگەیشتنیان لە شێوەکانی قوڕی نەرم بەجێهێشتووە.

برۆمان دوا توێژینەوەکەی لە بارەی ٥,٠٠٠ پارچە پەیکەرۆکەی مرۆڤ و گیانەوەر (P1.61) و لە بارەی ئەو شێوانە (form)ی هێشتا دەکرێ بواری کاریان وێنابکرێت وەك شێوە خڕ و قوچییەکانەوە تەواو کرد.

کەلوپەلەکانی ئەم گروهە گشتییە لە سەرتاسەری هێڵی قولێیەکانی چەرمۆدا دەرکەوتن.

زۆرترینی پەیکەرۆکەکان بچووکن، زۆر بە وردی شێوە نەکراون، زۆر بە کەمیش سورکراونەتەوە.

لەچەند بارێکی دەگمەندا تەواوی ڕووی دەرەوە بە قوڕە سوور (red ocher) ڕوو پۆش دەکرێت. بەڕادەیەك، کە شوێنەکە بە تەواوی تاقیکرابێتەوە، ئینجا ڕەنگبێ چەند گۆڕانێك لە چینە بنچینەییەکانەوە بۆ چینەکانی سەرەوە تێبینی بکرێت" بۆ نموونە (١) گیانەوەرە شاخدارەکان تەنها لە چینەکانی سەرەوەدا دەردەکەون، (٢) پەیکەرۆکەکانی مرۆڤ لە چینەکانی سەرەوەدا زۆر ئاڵۆز دەبن، (٣) پەیکەرۆکە دووقاچەکانیش (double- wing bases)* (P1.16:14-15)( وا دیارە تەنها لە چینەکانی سەرەوەدا دەربکەون.

بەلاّم ئەمانە درێژەدانەکانی نێو پەرەسەندنی ئەو گروهە گشتییەن، کە بەدڵنیاییەوە بەرهەمی تەقلیدێك بووە لە شێوە دروستکردندا.

پیشەکاری ئۆبزیدی و بەردەستێ لە چەرمۆدا (P1s. 17-19) ئامراز دروستکردنی- تیغە (blade)، کە لەچاودا گۆڕانێکی کەم لە سەرتاسەری تەمەنی نشینگەکەدا پێشان دەدات.

بەشێکی زۆری ئامرازەکان لە بەردی ئۆبزیدی دروستدەکرێن.

پێداویستییەکانی ئامێری ئۆبزیدی لە چینە کۆنترەکاندا (lower) وا دەردەکەوێ تا ڕادەیەك لە چینە نوێترەکان (upper) سنووردارتر بووبێت.

* (double- wing bases) (پارچە دووقاچەکان)



هەرچۆنێك بێت، ئارەزووی دووبارە پارچەکردن (rechipping) و دووبارە بەکارهێنانەوەی ئامرازە ئۆبزیدییەکان و لەچاو ژمارەکەمی پەلە بەردە بێکەڵکەکان (worthless chips) ڕەنگبێ ئاماژە بەوە بدات، کە دانیشتوانی چەرمۆ بەردی ئۆبزیدی تەواویان لە هیچ کاتێکدا لێ نزیك نەبووە تاوەکو ئامرازە بێکەڵکە فڕێبدەن.

ئامرازە بەردە وردەکان (microliths)، کە لەبەردەستە و بە تایبەتیش لە ئۆبزیدی دروستکراون، لە سەرتاسەری چینەکاندا بە شێوەیەکی تۆکمە لە ئامرازە گەورەکان زۆرترن.

سندوقی ئامرازەکانی چەرمۆ بە تەواوی سادەیە، بەلاّم بەگشتی ئامرازەکان بە شێوەیەکی باش و جوان دروست دەکرێن.

لە نێوان هەریەك لە ئامرازە گەورەکان و ئامرازە وردەکاندا تیغە سادە تیژنەکراوەکان "بەبێ هیچ چاکردنێك(asis) بەکارهێندراون و بە تەواوی زاڵن [واتە بێشومار زۆرن].

شوێنەوارەکانی قیر لەسەر چەند تیغێکی تیژنەکراوە (unretouched)دا هەروەها لەسەر چەند ئامرازێکی تیژکراوە (retouched)دا دەدۆزرێتەوە.

لە نێوان ئامرازە گەورەکاندا، تیغە تیژکراوەکان بەدرێژایی ڕۆخەکە (جاربەجاریش لە نووکەکە (end) و تیغە داسەکان بلاّوترین ئامرازن.

ڕنەکی تەڵیزمە خڕ (round flake- scrapers)ە بە وردی دروستکراوەکان و نووکە وردە ڕنەکەکانی سەر تیغەکان (neat end scrapers on blade)، کونکەرەکان (سمبە borers) و تیغە کەلبووەکان (notched blades) هەن، بەلاّم بە بڕی کەمتر.

لە نێوان ئامرازە بەردەستی وردەکانیشدا، تیغە بچووکە خودان لەلەکەرە تیژکراوەکان (nibbling retouch)ەکان لە ڕۆخەکاندا و کەمتریش لە نووکەکاندا بە ژمارەیەکی زۆر هەن.

هەروەها تیغە کەلبووەکان و کونکەرەکان و تیغە داسەکانیش لە سەرتاسەری چینەکاندا هەن، بەلاّم بە ژمارەیەکی کەم.

پارچە بەردە ئۆبزیدییەکان تا ڕادەیەك بە تەواوی ئامرازی وردن (Microlithic) (Cf. P1. 18B).





ژمارەیەکی کەمی تیغە گەورەترەکان لە کۆنترین چینەکاندا دەدۆزرێنەوە، کەچی ژمارەیەکی زۆریان لە چینەکانی سەرەوەدا دەدۆزرێنەوە (بەزۆری تیژنەکراون بەلاَم کەمێکیان ڕۆخیان تیژە)، وەلیّ هێشتا بە بڕێکی کەم.

ئەوەی پەیوەندیشی بە ئامرازە بەردینە وردە (microlithic) قەبارە گەورەکانەوە هەبێت، تیغۆکەی خودان لە لەکراوی تیژکراوە (bladelets arith nibbled retuch) لەسەرێکەوە بلاَوترینیان، بەلاَم ئەو تیغوکانەی ڕۆخی تیژکراویان هەیە لە رووی ژمارەوە لە ریزی دووەمن.

تیغە کەلبووەکان دەگمەنن.

بە شێوەیەکی ئالۆز، بەلاَم تیغە تەلێزمە لاکوتە (side blow blade- flakes) جیاکراوەکان (کەلە پارچەی بەلاری لێدراوی پارچەی تیغە زەمبەلەکییەکان (blade sections) بە تیژکردنەوەی دوابەدوای یەك دروستکراون) بە تەواوی لە چینەکانی سەرەوەدا باون.

بوونی سێگۆشە و لەبزینە (trapezes) دەگمەنەکان چی لە بەردەستیّ یا بەردی ئۆبزیدین تەنها لە چینەکانی سەرەوەدا هێشتا زۆرشیاوە تێبینی بکرێت، [چونکە] ئاسایترین شێوەن (form) لە شوێنەکانی دیکەدا.

پیشەکاری بەردی پارچە پارچە کراو (chipped stone شوژ) لە ڕووی قەبارەوە بە تەواوی کاریگەرە.

تەنها لە وەرزی ٥١/١٩٥٠ دا زیاتر لە ١٠٠,٠٠٠ پارچە ئامرازی بەردەستیّ و ئۆبزیدی (پەلە بەردی بێکەلّکیشیان تێدایە) دۆزرانەوە، کە ئامرازە ئۆبزیدەکان ژمارەیان لە ٤٠٪ سەرجەمی ئامرازەکان بوو.

کەلوپەلەکانی چەرمۆ لە بەردی داتاشراو (ground stone) (P1s. 20-21) چالاکی جۆراوجۆری زیاتر لەوەی هێژ دەتوانین لەهەر گروهێکی ترەوە تێی بگەین، پێشنیار دەکەن.

لە جۆری بێوەرەکان یا پوازەکان (ceits)، جۆرەکانی قەبارە-ڕێکی بەتەواوی داتاشراو و پارچەی بێورشێوە زۆرن، لەگەلّ ئەوەشدا شێوە گەلێك هەن جەستەی پارچە پارچەکراو هەروەها پارچەی داتاشراویان هەیە.

ئەمانە پێدەچیّ تیغی خاکڕنی کێلاّن (hoe blades) بن، بەلاَم پێدەچیّ هەم وەك بێوریش بەکارهێنردرابن.



بەردە خڕە گەورە کونکراوەکان وەك ئەوانەی بەزۆری پێیان دەگوترێت لاپیتە ( digging-stick weights)* و سەرە قولاپەکانی تەونکردن (loom weights) یا سەرە دەمبوسە بەردینەکان دەگمەنن.

جیاوازی نێوان قەبارە و شێوەی دەستاڕ (P1. 20:5-6) و بەردی کوتان (rubbing stone) (metate and mano) و نێوان ئاونگەکانی بەردی (bouider) و دەسکە ئاونگەکاندا (P1.20:1 – 3) جیاوازییەکی زۆرە.

هەمیشە بوونی ئەم کەلوپەلانە بەلایەنی کەمەوە کوتانی دانەوێلّە بۆ پەلّۆلّە (یا حەلّوا Porridge) پێشنیار دەکات، گەر لێکردنی ئارد بۆ نان پێشنیار نەکرێت (بڕوانە ل.     ).

هاوڕێککردنەوە ئەزموونییەکەی هەلّبێك (Helbaek) لە بارەی ناوکە بەرووەکانەوە (ل.     ) ڕەنگبیّ ئاماژە بە بەکارهێنانێکی ئەم کەلوپەلانە بدات، لەگەلّ ئەوەشدا تێبینییەکانی دالّیەبیرك (Dahlberg) دەربارەی ددانەکانی پرسیارێك لەبارەی بەکارهێنانیان بۆ خواردن جووین (food preparation) دێنێتە ئاراوە (بڕوانە ل.)، هەروەها هێندێك لە کەلوپەلە بچووکترەکان ڕەنگبیّ بۆ هاڕینی ماددە خۆراکییەکانی دیکە بەکارهێندرابن.

پارچەی (ocher)یش زۆر بوون، هەروەها بەرد (stone palettes) دەرکەوتن.

لە ڕووی جوانناسییەوە (Aesthetically)، پیشەی دەفری بەردین زۆر قایل کەر بوو.

دەفرەکان بە زۆری لە مەڕمەڕ دروستکرابوون و بەزۆری چواردەورێکی لاڕەق و دیواری جوانانەی پۆلیشکراوی تەنکیان هەیە.

بە شێوەیەکی روون و بەرچاو دەفر دروستکەرەکان مەڕمەڕەکەیان ئەوەندە بە وردی هەلّبژاردوە و بە شێوەیەکیش دروستیان کردوە، کە دەمار دەرکردنی بەردەکەیان بەهۆی هێلّی ئاسایی یا لارە هێلّی ڕەنگە جیاوازەکانەوە خستۆتە سەر کردەی جوانکارییەکەوە.

(mace head) و پارچە مکارە (groove abrading)* ی ئەو جۆرە جاربەجار پێی گوتراوە بەهرەمە* (shaft- staingteners) یا موورو شمشاتکەر (polisher) و بەردەسان* ( whet

* لاپیتە (digging- stick weights): ئامرازێکی کشتوکالّی سەرەتاییە وەك قلچك یا مەساسەوایە، کە سەرێکی تیژە.





(stone و وێنە مشتومالکەر (fine- grained polishers) هەروەها قاونی (disk) کونکراوی قەبارەی "سەرکە تەشی" (spindle- whorl) تەواو دۆزرانەوە، بەلاّم بەژمارەیەکی بێشومار نا.

ئامرازێکی دیکەی سەرنج راکێش دەمە زەمبەلەکێکی گەورەیە (drill bit) لە شێوەی گاشەیەکی رێك و پێکی "بەکارهاتوودا"، مهۆلی-ناگی (Moholy- Nagy) تێبینی کردووە، کە رووە پێچپێچوکەکەی دەرەوەی دەمە زەمبەلەکەکە کتومت فیتی ئەو پارچانە بووە، کە گوزارشت لە قۆناغی سمینی سەرەتایی دەکەن، لە دروستکردنی بازنەی بەردیندا (stone bracelets) (بروانە دواتر).

شێوەیەکی نووکگرە (bit mounting)ی خودان نووکە بەردێکی بادەری پێچ و مۆرە شێوە (bound) بە هۆی سیرمە (thong)وە لەسەر کۆتایی دەسکێکی داردا وادەرکەوت یا بە مەتکە (bow- drill) یا بە گردۆنێکی بەردین (stone weighte crank- drill) بۆ بەکارهێنان پراکتیس بووبێ.

تەوەرەکانی دەرگاش لە پێشەوەدا وەسفکران (ل.    ).

بەردی داتاشراو (Ground stone) لە چەرمۆدا باش وەبەرچاو کەوتن وەك //جوانکەر// هەروەها وەك گروهانی بەسوودی راستەوخۆ.

مووروی لولوکی و پیپی (barrel) و جووت قوچەکی تەخت (flattened biconical) باوبوون، موور و گەلێکی پیپی یەخەدەرا (collared)یش دەرکەوتن، هەروەها مووروویەکی لولەکی خودان هەلّکەندنی //پەتی// زەمبەلەکی دۆزرایەوە.

گواشۆرە یا ملوانکەکان (pendant) هەمیشە سادەن، جگە لە چەند نموونەیەك نەبێت، کە نەخشی هەلّکەندراویان هەیە.

* (١) مکارە: ئامێری دار هەلّکۆلّین و قەلّیش لێهەلّکردنەتی.
* (٢) بەهرەمە (arrow straightener= shaft- straghitener (5) baton): ئامێرێکە لە چەرخی ئۆریانسی و ئاخیرو ئۆخری چەرخی بەردی کۆندا بەکارهێندراوە و لە ئێسقانی شاخی ئاسك دروستکراوە، کە کونێك یا زیاتری هەیە، بۆ دارکۆلّین یا بەرد بەکاردەهێنرێ، بەلاّم لە ئاسن دروستدەکرێت.
* (٣) بەردەسان: بەردێکە چەوردەکرێ بۆ تیغ سوین بەکاردەهێنرێ.





لەبەر ئەوەی توانامان نییە لە بەکارهێنانیان تێبگەین، ئەوا لێرەدا ژمارەیەکی زۆری کەلوپەلی شێوە دەسکی ئاونگی جوان داتاشراوی بچووك (P1. 21:9-10) و ئەو خڕە تۆپە بەردینانە رێکدەخەین، کە ناوچەکە خستینییە بەردەست، هەروەها هێندێك پانکەلّەی بەردینی بچووکتر //قوچیپە، مێخ// هتد رێکدەخەین.

ئەو کەلوپەلانەی وەك بازنە (bracelets) (P1. 21:1-6) پۆلێن کران بە تایبەتی باش دروستکرابوون.

ئەو شتانە هەمیشە لە مەڕمەڕ دروستکراون لە پانە بڕگەشدا هێلکەیی (Ovoid) یا خڕن، سەرەڕای ئەوەش رووی دەرەوەیان هێندێك جار هەلّکەندراو و قۆقز (concave) یا تەنانەت بە شێوەیەکی چەقچەقۆکەیی (spirally) قلّێشیان لێ هەلّکەندراوە.

ئەم شتومەکانە دەبێت میللی بوبن، چونکە بە لایەنی کەمەوە ٢٢٥ جۆری تەواو لە سەرتاسەری کردەکەماندا دەرکەوتن.

ئەو شتانەی کە گوزارشت لە ئەمووستیلەی پەنجە دەکەن هەم لە بەردی داتاشراو ( ground stone) و هەم لە ئێسقان دەرکەوتن.

چەند نموونەیەکی بەردی داتاشراوی جوان (هەروەها یەك تا دوو داتاشراوی بەردی کرێت و یەکێکی قوری زبریش)ی جۆرێکی سەیری شتەکان هەن.

دکتۆر کۆرنیلیۆس دەبلّ بوو. ڤێرمۆلن پرۆفیسۆری میزرانی (Urology) لە قوتابخانەی پزیشکی زانکۆی شیکاگۆ، لە تێبینی کردنی سێ نمونەی زۆر باشدا ئەو بۆچونەی پێشکەش دەکا، کە ئەم شتانە لە رووی قەبارە و شێوەوە بە تەواوی پێشنیارکەری پارچە کێرێکی مرۆڤی تەواو پێکەیشتوون.

سەرکە کێر (glans penis) هاوشان لەگەلّ بنکی شێوە کێریدا (penile corona) و پاشماوەکانی چەرمی دوای سوونەتکردن ( foreskin) بەباشی دەردەکەون. سەرنج راکێشە تێبینی بکرێت، کە قولّترین کونەکان لەسەر پێشەوەی ناوەڕاستی (proximal face) شتەکان لە شوێنی بۆری میزکردن (urethra) دان کاتێك میزەکە بە نێو بەشی سکی (بەشی خوارەوە)ی کێرەکەدا رۆیشتووە لە کاتێکدا گەورەترین نزماییەکانی (چالّۆکە)ی بەشی پێشەوە

(dorsal) دەکرێ وەك ئەو کلۆرییەی بەهۆی کۆتایی هاتنی خانەی رەپبوونی کێرەکانەوە (corpora cavernosa)[*] دروستبوون، وەسفبکرێن.

گەر لە راستیدا شتەکە نموونەیەکی ئەو پەڕی کێربێت، ئەوا شێوەکەی بە دڵنیاییەوە تا رادەیەك ئاماژە بە سوونەتکردن (خەتەنە cricumcision) دەدات.

هێندێك شتەکانی ئەم شێوەیە لە قەبارە سروشتییەکان بچووکترن و کونەکانی نیوەڕاست تەواو پێشان دەدەن، هەروەك ئەوانە بەڕاستی لەسەر شولی بچووکدا چەسپکراوبن. هەروەها ئەوانە لە بنکەدا قڵیشێکی پلەکراوی سەیریان، کە مەبەستی ئەمە روون نییە.

باوترین ژمارەی ماددەکان ئامرازە لە ئێسقان دروسترکاوەکان بریتین لە سمتۆك (awl).

ئەم سمتۆکانە کورتبن یا درێژبن پانبن یا باریکبن، قۆنداخی لوسکراو یا قۆنداخی ئێسقانی پێ سروشتیان هەیە.

هەندێکیان شێوەی ئەستێولك[*] (Spatulate)یان هەیە و پێدەچێ نووکەکانیان تیژنەکرابن.

ئەو دەسکە ئێسقانە سادانەی بە هۆی پێچ و مۆرە (drilling) وە بە درێژایی تەوەرەی ئێسقانی پێ (Palange) کونێکی گەورەیان تێکراوە، باوبوون.

دەمبووس و دەرزی ئێسقانیش دەرکەوتن“ دەرزییەکان هەندێك تاو لە هەمان نووکدا پێچ و مۆرە کرابوون و هەندێك تاویش سەنتیمترێك یا زیاتر لە خوار نووکەکەوە پێچ و مۆرە دەکران.

عەڵقەی سادەی دروسکراو بە هۆی بڕینی ئێسقانی درێژ بەلاو و نیوی (transversely) و بڕگەکانی وەك کلك (ferrule- like)ی لە ئێسقانی درێژ دروستکراو هەبوون، کە بە شێوەیەکی سادە پێدەچێ عەڵقەی تەواو نەکراو بووبن.

هەروەها مووروی تەنکتری ئێسقانی لولەکی دەرکەوتن.

---

* corpus cavernosum= cavernous body= corpora cavernosa: بارستەی شانەیەکی ڕەپدارە توانای لێك جیاکردنەوەی گەورەی کشانی خوێنی هەیە، بە تایبەتی یەکێك لەوانەی قەبارەی جەستەی کێر یا قیتکە (clitoris) دروستدەکات.

* ئەسایولك: هەستێڤکێ ٠spatulate):



سێ شتی دیکەی لە ئێسقان دروستکراو تا رادەیەك نائاسایین: (١) کەوچکی باش دروستکراوی خودان دەسکی کونکراوی کورت یا درێژ هەندێك دەسکی قڵیشکراوی زەمبەلەکیان هەبوو (P1. 21:8)و (٢) سمتۆکی لە بڕگەی ئێسقانی درێژ دروستکراوی خودان دەسکی خڕ لە سەرێکی قۆنداخەکەدا کۆتایی پێهێنراوە و بە شێوەیەکی لاریش لەلاکەی بەرامبەردا لە نێو نووکێکی شێوە قەوارتك (gouge like)ی تاڕادەیەك خڕشدا چەسپکراوە (P1. 21:7)، هەروەها (٣)ئەو جۆرە گۆاشۆرە یا ملوانکەیە( bulbous off- center bead- pendants)ی، کە ئەوانەی نەتوفیان دێننەوە یاد (Garrod and Bate, 1937، P1.xx2:2). شتوومەکی وەك قوپچەی کوونکراو لە قەپێلکە شەیتانۆکە دروستکرابوون و هەمیشە دوو کوونی دریلی جومك (twin) یان هەبوو ئەنجامی هەردوو چاوەکەیان دەدا.

بڕگە قەپکرەکانی شەیتانۆکەی ددانداز (dentalium shell) پێدەچێ وەك مووروو بەکارهێندابن، هەروەها دەستکردێکی دروستکراو لە قەپێلکی پی زك (gastropod shell) هەبوو.

نموونە پەرش و بلاوەکانی شەیتانۆکەی دۆلکەیی (clam shell) رووباری دروست نەکراو پێدەچێ وەك کەوچك یا رنەك بەکارهێندابان.

سەرەڕای بوونی چینی قامیش بۆ قاتی عەرزەکان (بنواڕە ل. ) حەسیری چندراو یاخود سەبەتەش هەبوون.

بەداخەوە، هیچ یەکێك لەو شەقڵە تیاچەسپاوانەی بانگەشەمان بۆیانکرد ئەوەندە گەورەنین تاوەکو چی رۆخەکان یا شێوە و قەبارەی گشتی حەسیرەکان یاخود سەبەتەکان، پێشانبدەن.

چنینی سادەی خوارەوە و سەرەوەی هێندێك لە شەقڵە یا چەسپاوەکان پێشنیاری حەسیر چنین دەکات“ روخساری جووت پێچراوی ئەوانەی دیکەش پێشنیاری سەبەتەی چنی دەکات، ئەم پێشنیارەش بە هۆی ئەو راستییەوە بەهێز دەبێت، کە لە راستیدا هێندێك لەم شەقڵە تیا چەسپیوانە لە چینێکی تەنکی قیر پێك دین (بڕوانە. ل )، هەروەك هەولێکی رێ لە ئاوگرتنیش دراوە.

سەرە تریانی بەقیر رووپۆشکراو- (bitumen- coated basket- trays) هێژ لە چەمچەماڵدا بەکاردەبرێن.

هەروەها قیری بە زۆری تیغە بەردەستێکانەوە نوساوە دۆزرایەوە، و بەکارهێنانیشی وەك پێنوسی دەسك دروستکردن لە باری داسێکی بەردەستێ بە چوار توخم قوقلێندراو (carved)دا روونبوویەوە.

بەڵگەی خودی مەتریاڵی دەسکەکە نییە، بەڵام گریمان دەکەین، کە دەسکەکە لە دار بووە.

برۆمان شەقڵی تیاچەسپاوی روونی چینی رەنگبێ لەسەر دوو تۆپەڵە قوڕی بچووکدا، تێبینی کرد.

ئەو ریشاڵانەی لە چینەکەدا بەکارهێندابوون هێشتا نەناسراونەتەوە.

لە دۆزینەوەکانی چەرمۆدا ناشتنی بەر مەبەست بە شێوەیەکی روون و بەرچاو گەر دەریش کەوتبن کەمە.

بە ئەگەری زۆرەوە، گوماندەکەین مردنێکی چاوەڕوان نەکراو بە هۆی داتەپینی سەربانی ئەشکەوتەکە بۆ نێوەوە روویدابێت، هەروەها بە هیچ شێوەیەك شوێنی ناشتنی ستانداردکراو کفنکراو (Beigaben)* بەرچاونەبوون. رەنگبێ گۆڕستانێك راستەوخۆ لە دەرەوەی گوندەکەدا هەبووبێت.

زۆربەی مەتریاڵە خاوەکانی چەرمۆ (دروستکراو و دروستنەکراو) هێشتا توێژینەوەیان دەوێت، بەڵام ئەم ناساندن و راڤەکردنی فەراهەمی وەك ئەمە رەنگبێ یا گرنگی شارستانی یا ژینگەیی هەبێت لە بەشەکانی دواتردا پێشکەش دەکرێن.

مەتریاڵی ئێسکە پەیکەری مرۆڤ لە هیچ بارێکدا باش پارێزراو نەبوو.

سەرنجی دیتنکاری ناڕوونی ئوتن و بارت و ئاماژەی بە جۆرێکی فیزیکی گشتێندراوی ناوچەی دەریای نێوەراستدا.

تاکە پارچە کە لەسەری بە درێژای توێژراوە، ئێسکە پەیکەرێکی دەم و چاوە (JII s4) لەلایەن پرۆفیسۆر جێی. لۆرنس ئەنجڵ لە زانکۆی پەنسلڤانیا، ئینستیتیوتی بۆفی (Baugh) توێکارزانی (Anatomy) یەوە، تاقیکرایەوە.

بۆ ئەنجل وادەرکەوت شێوەی گشتی دەم و چاوێکە تایبەتمەندی رەگەزی ئێرانی هەروەها ناوچەی دەریای نێوەڕاست پێشاندەدا...

دکتۆر ئەلبەرت دالیە بێرگ لە تاقیگەی زۆلەری مرۆڤناسی ددان لە زانکۆی شیکاگۆدا توێژینەوەیەکی لە بارەی ژمارەیەکی ددانەکانی مرۆڤ گرتە ئەستۆ. ددانەکانی خەڵکە چەرمۆ لە رووی قەبارەیەوە مامناوەنجی بۆ بچووك بوون و لە رووی شێوەشەوە بە تەواوی نوێ بوون.

* کفن (Beigaben)=bambabagia =bambax=bambac: پێدەچێ بە ئەسڵ تورکی بێت (pamuk) یا فارسی بێت (pamba cotton): پۆشاکێکە دەشتی وەردەپێچن.



ددانەکان هێژ هارەڕن و شکانی مینای ڕۆخەکان (marginal enamel) پێشان نادەن" بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا پارچەی بچووکی زۆر خراپبوون بە هۆی خواردنەوە نەبوون، کە هۆی زۆر گەورەی داماڵران یا درزبردنە.

لەبەر ئەوەی ددانەکانی بەردەستی داڵیە بێرگ گوزارشت لە ژمارەیەکی زۆری تاکەکەسان ناکەن، ئەوا نیشاندانی ئەم بەڵگەیە هێژ ناڕوونە.

هەر چۆنێك بێت، رەنگبێ ئەوە پێوەندی هەبێت بە بەکارهێنانی ئەسڵی دەستاڕ و بەردەکانی هاڕینەوە و ئاونگە خڕە بەردە (boulder)-ەکان و دەسکە ئاونگەکانەوە (بڕوانە. ل ).

هەڵبێك لە نامەیەکدا (Nov.11, 1951) ، کە دەربارەی تەواوی خۆراکی رووەکە جۆراوجۆرە دۆزراوەکانی تێبینی کردوە، ئەوەی نوسیوە //رەنگبێ ئەوە ساڵانێك بخایەنێت و کارێکی گەلێك زۆریشی پێویست بێت بۆ ئەوەی وێنەیەکی رێکخراو لەبارەی تەواوی ئەم درێژ پێدانە سەرسامکەرانەوە دروستبکرێت.

توێژینەوەکەوەی بەرەو پێش دەچێ و هێندێك لە درێژە پێدانەکانیش لە بەشی هەشتەمدا ئاماژەیان پێدەدرێت.

سەرنج راکێشە لێرەدا تێبینی بکرێت، کە هێندێك نمونەی تایبەتی هەردوو جۆرەکەی گەنمی چەرمۆ زۆر لە شێوەی گەنمی کێوی هاوشێوەی ئێستاکەیاندا ماونەتەوە ( Traticum dicoccoides and T. aegilopoides)، لە کاتێدا ئەوانەی دیکە وا دەردەکەون شێوەی سەرەتایی بن یا لە T.dicoccum یا لە T.monococcum نزیك دەبنەوە.

هەڵبێك ئەم پێشنیارە لە بارەی بەرهەمەکانی گەنمی تایبەتمەندییەکی تێکەڵ وا مانا دەکات، کە ناکرێ چەرمۆ گوزارشت لە قۆناغە زۆر سەرەتاییەکانی کشتوکاڵ بکات، تەنانەت گەر هەڵبژاردنی باشترین تۆوی دانەوێڵەش لە لایەن مرۆڤەوە بووبێت هێشتا دوور نەیگواستۆتەوە.

جۆی چەرمۆ گونجانێکی نزیك لەگەڵ جۆرە کێوییەکانی Hordeum spontaneum پێشاندەدات، بەڵام تەوەرەیەکی بەهێزی هەبووە، لە راستیدا جۆیە کێوییەکان تەوەرەکەیان زۆرتر یا کەمتر زوو دەشکێت. بە پێچەوانەی ئەو پێشبینیانەی، کە جۆی زۆر کۆنی چەرمۆ رەنگبێ شەش ریز بووبێت، جۆی چەرمۆ دوو ریز بووە.





هەڵبێك باوەڕی وایە، كە یەكەم جار جۆ لە ئەنجامی بوونیدا وەك گژوگیایەك لە كێڵگەكانی گەنمی چێندراودا، چێندراوە.

هەروەها هەڵبێك رووەكە خۆراكییە نا دەغڵ و دانەكان بەم شێوەیە نیو دێنێت: ((پۆلكەی كێڵگە (ماش pea) و نیسك و كزنی شین (blue vetehling) ))، لەگەڵ ئەوەشدا پێدەچێ هێشتا روون نەبێت ئاخۆ ئەمانە پێشتر چێندراون یان بە شێوەیەكی سادە دەرئەنجامی خۆراك كۆكردنەوەی بوونە.

دووشت (لە هاوڕێككردنەكەیدا باسكراون) ئاماژە بەوە دەدەن، كە خۆراك كۆكردنەوەی لە چەرمۆدا هێشتا گرنگی هەبووە، ئەم دوو شتەش پاشماوەكانی فستەق و ناوكە بەڕوون (P1. 28 D).

زانیارییەكی دیكەی گیایی (botanical) لە چەرمۆوە بەردەستە لە ناسینەوەكانی خەڵوزی دارینەوە لە لایەن پرۆفیسۆر ئێلسۆ ئێس. باگهون لە تاقیگە گیاییەكانی (توێژینەوەی گیا) — زانكۆی هارڤەردەوە وەردەگیرێت.

بە هۆی تایبەتمەندی پاراستنی سووستەكان (sample)ەوە، باگهون (Barghoopn) توانی تەنها ناسینەوەی رەگەزەكان نەك جۆرەكان ئەنجامبدات.

لە پەنجا جۆری تاقیكراوە، چل و پێنجیان بەڕوون (هەندێكیشیان بەری داری گەورەن)، دوانیاندارگەزن (tamarisk)و دوانیشیان داری بەقلی (leguminous)ن ( prosopis, cf mesquite)* و دانەیەكیشیان ناناسرێتەوە.

لەبەر ئەوەی لە بەشی چوارەمدا وەسفەكانی رید (Reed) بۆ روونكردنەوەی ئێستاكەی لە بارەی توێژینەوەكەی دەربارەی پاشماوەی گیانەوەران، هەن، رەنگبێ لێرەدا لیستەكەی لە بارەی گیانەوەرانی كاتێك و سەردەمێك (fauna)دا بەسبێت.

تەنها لە بارەی بزنەوە بەڵگەی راشكاوی شێوەزانی (morphlogy)ماڵیكردن هەیە (No.4).

* (١)prosopis: وشەیە گریكییە (prōsōpis) = burdock= بەزۆری بە (prosopon) بەكاردەبرێ: رەگەزی دەوەنێكی لقداری خولگەیی یا نیمچە خولگەییە (لە خێزانی داری بەقلی)یە قەدێكی لولەكی و گوڵی بچووكیشی هەن.

(٢) mesquite: رووەكێكە لە رەگەزی (prosopis)، بریتییە لە دەوەن یا دارێكی رەگ ڕیشاڵی باشووری رۆژئاوای ئەمریكا.



بێگومان ئەمە مانای ئەوە نییە، كە هێندێك گیانەوەری یەك بە دوای یەكی ماڵیكراو لە چەرمۆدا پێش ئەوە میگەڵنەكرابن یا بەجۆرێكی دیكە گرنگییان پێنەدرابێت. سەرەڕای ئەوە، رید سەرنج دەدات، كە دوو ((نیمچە جۆر))ی بزن رەنگبێ بە شێوەیەكی كردەیی وەك یەك بووبن، چونكە بێگومان ماڵیكردن هێژ تا رادەیەك لە قۆناغێكی زوویندا بووە.

زۆر سەرنج دان بە گیانەوەران هەروەك بە هۆی پەیكەرۆكەكانەوە دەركەوت زۆر زۆرە، بەڵام روون و ئاشكرا نییە.

رید (Reed) پەیكەرۆكەیەكی بچووكی خودان كلكێكی لێك ئالاو (P1. 16:2) بە شێوەی سەگ دادەنێت (بڕوانە.ل      ).

١. شێوەیەكی خێزانی ئەسپ (An equid) (رەنگبێ Equus hemionus)، كەرە كێوی بێت)

٢. ئاسك (Gozella subgutterosa).

٣. بزنە كێوی (Capra hircus aegagrus).

٤. بزنی ماڵیكراو (Capra hircus hircus).

٥. مەڕ (Ovis orientalis).

٦. شێوە مانگایی (Bosl [?] primigenius).

٧. ئاسكی سوور (cervus elaphus).

٨. ئاسكی ڕو (capreolus caoreolus).

٩. بەراز (sus scrofa).

١٠. ورچ (ursus arctos).

١١. گورگ (canis lupus).

١٢. ڕێوی (vulpes vulpes).

١٣. پڵنگ (panthera pardus).

١٤. پشیلەیەكی بچووكی نەناسراو (بەقەدەر پشیلەی ناوماڵ).

١٥. كوڕەبشە (meles meles).

١٦. دەڵەكی قرتێنەر (martes foina).

١٧. كرتێنەرانی نەناسراو.

١٨. كەمێك باڵندەی بچووكی نەناسراو.

١٩. كیسەڵ (testudo graeca).

٢٠. ماسییەكی نەناسراو.

٢١. قرژاڵی ئاوی پاك (potmon potamios).

گەورەترین گروهی ئێسقانی گیانەوەران، كە رید دڵنیایە نێچیری كێوی بوونە لە بەراز و مەڕ و ئاسك پێكدێن.

بێگومان ئەمە پێوەندی بە پرسی راوكردن و نەبوونی نووكە هاوێژكەكانی بەردەستێی ئاسایی یا ئۆبزیدیەوە هەیە لە پێشەی بەردی پارچە پارچەكراوی چەرمۆدا.

گەر كەوان (bow) زاندرابێت و بەكارهێندرابێت، رەنگبێ تیرەكان (arrows) هەر بەتەنها تیژكرابن* یاخود لە نووكە مایكرۆلیتی جۆرەكانی ئێستاشی لەگەڵ بێ خۆی لە خۆیدا نەناسراونەتەوە، دروستكرابن. دەستكەوتی قەپێلكی هێلكە شەیتانۆكەكان(snail shell) بەتایبەتیش لە چینە زۆر قوڵەكاندا ئەوەندە زۆر بوو، چەندین جۆری نەشكاوی ژمارە گەلێكی (cubic- foot boxes)مان دۆزییەوە.

دكتۆر فریتس هاس (Fritz Haas) توێژەر و كۆكەوەوەی بێبڕە نزمەكان ( curator of lower invertebrates) لە مۆزەخانەی مێژووی سروشتی شیكاگۆ و دكتۆر جۆزێف سی. بكوێرت (Joseph c. Bequaert) لە مۆزەخانەی گیانەوەرناسی بەراوردكاری زانكۆی هارڤەرد دا، جۆرەكەیان (species) بە (Helix slaomonica)* ناساند، كە بریتییە لە قەپێلكە شەیتانۆكەیەكی وشكانی گەورە.

* واتا هەر ئەو مەتریاڵەی تیرەكەی لێ دروستكراوە تیژیان كردووە.

* (١) Helix: بریتییە لە قەپێلكە شەیتانۆكەیەكی كەلەیەكی ئەفریقی و ئۆراسیایی (لە جۆری خێزانی O-Helicidae)ە سیپەلاكدارە.





قەپێلكە شەیتانۆكە دۆلكەییە رووبارییە ئاساییە كەمترەكانیش بە (Unio tigridis) ناسێندران.

دكتۆر ستوارت ئیێ ی. هارس و رێڤ. ئێم. ئێچ. ئی. جێی(ی). بیگز، توێژینەوەی رۆڵی ئێكۆلۆژیان لە بارەی ئەم بێبڕانەوە لە ئەستۆگرت.

توێژینەوەی بەردناسی (petrological) لە بارەی دەستكردە بەردەكانی چەرمۆوە هێشتا تەواو نەكراوە.

رایت تێبینی كردووە، كە زۆرترینی مەتریاڵە خاوەكانی چەرمۆ وا دەردەكەوێ لە كەڤەرەكانی نێو نەواڵی (wadi) خوار شوێنەكەوە هێندرابن، كە بەژینگە كاریان تێكراوە و لە زنجیرەكانەوە بەرەو رۆژهەڵات غلۆر بوونەتەوە.

هیلی نیشتەجێبوون لە چەرمۆدا كۆنترین دەركەوتنی بەردی ئۆبزیدی بە برێك لە رێزبەندی ناسراوی عێراقدا نیشاندەكات.

دەركەوتنی بەردی ئۆبزێدی و شووشەی بوركانی دروستبوو لە ژێر بارودۆخی تایبەتدا، لە چاودا سنووردارە.

نزیكترین شادەمار (mother lodes)ی بەر ئەگەر لە چەرمۆوە دوو سەرچاوەی هێشویی توركین لە ناوچەی گۆمی واندا و نزیكەی ٢٥٠مایلی هەوایی لە باكووری چەرمۆوەن هەروەها شادەمارەكانی نزیك ئەكسەرەرین و نزیكەی ٦٥٠ مایلی هەوایی لە باكووری رۆژئاوای چەرمۆن (kökten, 1952).

جگە لە سەرچاوەی (بەردی بوركانی و ئۆبزیدی) (occurrences) گەلێك دوورتر لە توركیا و شادەمارەكانی ئیجە و ئیسیوپیادا، هیچ شادەمارێكی دیكە قسەی لێوە نەكراوە، ئەوەش زۆر جێگای گومانە، كە هەریەك لەمانە پێوەندی بە شتەكانەوە هەبووبێت. فراوانی بازرگانی گواستنەوە، كە برِی بەردە ئۆبزێدییەكان لە چەرمۆدا، پێشنیاری دەكات گەلێك كاریگەرە.

ئەوەش دڵنیامان دەكاتەوە، كە بازرگانی و گەیاندن لە پێشدا لە ماوەی زۆر لە یەكتری دوورەوە كراوە هەروەها لەوەش دڵنیامان دەكاتەوە، كە پێشكەوتنی شارستانییە راستەقینە هەرێمییە دابڕاوەكان ناكرێ شیاوی وێنا كردن بن.

شوێنەوارەكانی بەردی ئۆبزیدی لە ئەشكەوتی زەرزی یا تەنانەت لە ئاسۆ كۆنترەكاندا (بەڵام بە برێكی زۆر كەمتر) رەنگبێ هەروەها تیل نیشانی نەبوونی دابڕانی هەرێمی بكات، بەڵام زەحمەتترە دیاریبكرێت.

(٢) unio: مرواریەكی گەورەیە لە جۆری خێزانی unionidae-ە.

چوار سووستە (sample) لەو نۆ سووستانەی ئەگەری قیریان هەبوو لە تاقیگەکانی پترۆلیۆمی عێراقی لە کەرکووکدا[٥] تاقیکرانەوە و دەریانخست قیریان تێدایە، هەروەها بە لایەنی کەمەوە لە سووستەیەکی تردا شوێنەواری نەوت هەبوو. سەرەڕای ئەوە، یەکێك لە چوار سووستە قیرەکان لە زەفتێکی تەواو (pure asphalt) بوو، کە بریتییە لەو راستییەی سەرچاوەی قیرەکە بە سێ شوێنی قیر لێتکانی (seep) ناسراو لە ناوچەکەدا قەتیس دەکات.

یەکێك لەم سێ شوێنانە(لەسەر گەرمەداغە) تەنها نزیکەی دوانزە مایلێك لە چەرمۆوە دوورە.

سووستەکانی دیکە ناپوختترین پێدەچێ لە ژمارەیەك داچۆڕگەی قیر (seep)ەوە لە هێندرابن لە ناوچەی گشتی چەمچەماڵ - کەرکووك دا.

لە نموونەکانی دەسك دروستکردنی دەسکی تیغە داس و سووستەیە سەبەتە — یا حەسیرێکی تیا چەسپیودا (ل. ) قیرەکە بەشێك بوو لە قاڵبێکی ماددەی قوڕین.

هەڵسەنگاندنێکی راڤەکاری گشتی لە بارەی دەستکەوتەکانی چەرمۆوە وا دەردەکەوێ ئاماژە بە دوو لایەنی دژیەك بدات.

توێژینەوەکانی هەریەك لە هەڵبێك و رید دەیانەوێ تەنها رووداوی ماڵیکردنی زۆر پاژی (partial) تا ئەم ساتە و وا بەستەبوون بە خۆراك کۆکردنەوەوە جەخت بکەنەوە، کە دەبێت هێشتا بەردەوام بووبێت (بۆ نموونە، گیانەوەری راوکراو و هێلکە شەیتانۆکە و هێندێك رووەکی خۆراکی کێوی وەك ناوکە بەروو هەبوون).

لایەنێکی دیکەی "سەرەتاییبوونی" کۆمەڵگە بە زیندویی مانەوەی تەقلیدە کۆنەکانە لە ئامادەکردنی ئامرازی بەردەستیدا" بە تایبەتی لوغزەکە سەرنجدانی لیندا بریبیدووە، کە هێندێك لە جۆری ئامرازە کۆنترەکان وەك دەردەکەوی تەنها لە چینەکانی سەرەوە تردا دۆزرابنەوە (ل. ).

لە لایەکی دیکەشەوە لە بارەی دروستکردن (coin)ەوە، ئالۆزی رێژەیی لە دروستکردنی رۆنانسازی و لە شێوەکانی رۆنانسازییە نا سەرەکییەکانی وەك تەندورەکاندا پێشاندراوە

(٥) ئەمە یەکێکە لەو دڵفراوان-یە زۆرانەی، (I.P.C) لەم بارە تایبەتیەدا پێی گەیاندین، هەروەها قەرزاری هەیەك لەمانە بووین: بەڕێز. دی. ئی . بونیان لە بەشی ئەندازەی نەوتدا و بەڕێز لیۆدامیسن و بەڕێز. ئێچ. ڤی. دونینگتۆن لە بەشی زەوی ناسی و بەڕێز. جێی. دەبلیوو. بۆید و بەڕێز. بی. ئارِ. ڕێینسفۆرد- هانێی لە بەشی کیمیادا.



هەروەها سەرکەوتنی گشتی لە کاری بەردە بە جوانی داتاشراوەکاندا وا دەردەکەون ئاماژە بە تەقلیدێکی راهاتوو لەگەڵ ژیانی نیشتەجێ بووندا هەروەها سەربەستبوونێك لە فشاری بەردەوامی بەدوای خۆراك گەڕاندا، بدات.

ئەم سەربەستییەش رەنگبێ بە تایبەتی لە گروهی دەفرە بەردەکاندا (لەگەڵ وەدەرخستنی ئەوکاتەی لە دروستکردنیاندا بەسەر براوە)، دەست نیشان بکرێت.

هەروەها پێدەچێ پێویست بێت پەیکەرۆکە قوڕینەکان لێرەدا لیستبکرێت.

ئەو ئامرازانەی، کە بەهۆیانەوە لە بەشەکانی گەڕان بە دوای خۆراکدا تێدەگەین بە شێوەیەکی لۆژیکی خودی خۆیان لایەکی دیکەی جووت جەمسەری لە سەرەوە پێشنیارکراوە راڤە دەکەن.

هەروەها بێورە بەردەکان (بێور، تەوشۆ، یا خاك ڕن) و بەردەکانی هاڕین دەرکەوتن، هەرچەندە لە رووی پەرەسەندنی چەشنی ئامرازە بەردییەکانی شوێنە کۆنترەکانی دیکەی مەلفەعات و کەریم شەهرەوە خراپتر دروست کرابوون، هەروەها بە شێوەیەکی ماقوڵ هەروەك لە لایەن خۆراك کۆکەرەوەکانەوە بەکارهێنراون لە خۆراك بەرهەم هێنەکانیشەوە بەکارهێنراون.

داسوکەکان بۆ یەکەم جار (لە رزبەندییەکەماندا) لە چەرمۆدا باوبوون، هەروەها رەنگبێ گریمانبکرێ، کە ئەو داسوکانە لە دانەوێلە دروونەکردنەوەشدا بەکارهێندرابن، هەروەها گریمانکردنێکی ماقوڵ دەبێت دەسکەکانیشیان لە برینەوەی قامیشەوە پەرەیان پێدرابێت. هێندێك جۆری بێوەرە بەردەکان (celts) و بەردەکانی هاڕین و ئەو گرنگییەی بە ئامادەکردنیان دراوە رەنگبێ گوزارشت لە کاریگەرترین لایەنی گشت ئەو ماددە دەستکردانە بکەن، کە لە بەدوای خواردندا گەرانی ئالۆز قەتیس کراون.

دەمانەوێ ئەو تیل نیشانەی، کە هێندێك کەس لە ئەنجامی نەبوونی گڵێنەی ئاسان بۆ گواستنەوە (کەمۆڵە) لە چینە کۆنترەکاندا و هەبوونی لە چینە نوێترەکاندا (upper) سەرەڕای یەکانگیری کۆمەڵگەی چەرمۆ لە بنکەوە تاوەکو تەپڵی سەرەوە لەگەڵ بوونی نیشانکردنەکانی بەردەوامییەتی شارستانییەتی زگماکی خۆی، تا ئەوپەڕ کەمبکەینەوە.

کۆتەکەڵەکانی (sherds) چینی پێنج و چوار و سێ لە کردەی دووەمدا بە شێوەیەکی ئاشکرا کۆنن, بەلام نموونەی باشی پیشەی گڵێنەکەرن.

لە چەرمۆدا هەست بە سەرەتاکانی هەستکردن بەم پیشەیە نابینین.

بێگومان، پێدەچێ ئەو کۆتەڵانە زۆر بەرەو دواوە نەگەڕێنەوە.





لە کۆتایدا، هێژ دوو شەقڵی نەکێش هەن.

شەقڵێکیان ئەوەیە یەکەم نموونەی گڵێنە (pairing pottery)* لە ریزبەندییەکەی کوردستانی عێراقماندا لە چەرمۆدا بە بەردستێکارییەکی فراوانەوە لە رووی چەشنی پەرەسەنییەوە، دەبینین، بە پێچەوانەی شوێنە زاندراوەکانی پێشووی وەك حەسوونە و مەتارە و عەلیاغا و بانەهیلك، کە گڵێنەی خودان بەردەستێ دەستکردەبێ تایبەتمەندیەکانیان بە شێوەیەکی سەرەکی تیایدا دەدۆزرێتەوە.

هەرچۆنێك بێت، پیشەی بەردستێکارییەکی پێشکەوتوو لە رووی پێشکەوتنی ئامرازەکانەوە (typologically) گەیشتۆتە ناوچەی بنار (piedmont).

هاریس (بڕوانە ل. 1. n, k)، بە درێژایی لێواری دەشتی باشوور و باشووری رۆژئاوای کەرکوك ئامرازەکانی بەردەستێی سەر ڕووی دەرەوەی کۆکردنەوە، گرنگی دانەکانیشی لەو کاتەدا گڵێنەیان نەدەگرتەوە.

هاریس لە هەریەك لە تەپۆلکەی ئوروێل و تەپۆلکەی رازیانەدا، کە شەش مایل لە دەمی رووباری تۆق چای دوورن و بەسەر دەشتی بناردا دەڕوانن، بەردستێکانی وەك چەرمۆی دۆزینەوە.

سەرەڕای ئەوە، بەلایەنی کەمەوە بەردەستێکانی وەك چەرمۆ تاوەکو سەردەمی هەریەك لە گڵێنەکانی حەسوونە و سامەڕا بەردەوامبوونەوە گەیشتوونەتە دۆڵی نێوان شاخان (intermontane). لیندا بریدوود لە ئابی ١٩٤٨ لە مۆزەخانەی نیشتمانی دانیمارك لە کۆبنهاگن لە نێوان کۆکراوەکانی تەپۆلکەی شمشارەدا ئەو جۆرە بەردەستیانەی تێبینی کرد (بڕوانە ل.    ).

ئەو هۆکارانەی لێرەدا بەندیوارن بەرۆڵگێران لە دابەشبوونی جوگرافیایی و کرۆنۆلۆژیایی ڕێژەیی و پەیوەندییە شارستانییەکان، هێشتا نارونن.

ئەوەش گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ دۆزینەوەی چێبوونی دوو کۆمەڵگە تەواو بێت لە هەریەك لە تەل ئوروێل و تەل رازیانەدا چێ بۆ دۆزینەوەی هەبوونی یا نەبوونی شەقڵە تایبەتییەکانی چەرمۆی وەك پەیکەرۆکە و شتەکانی بەردی داتاشراو گڵێنە بێت، تیایاندا.

دووەم شەقڵی نەکێش (imponderable) پێوەندە بە ئەگەری رەنگدانەوەیەکی دیکەی دیاریکراوی هۆکارە هێشتا هەڵنەسەنگێنەکان (unassessable).

* (      ) pairing pottery:



لیندا بریدوود لە ساڵی ١٩٤٩ دا دوای ئەوەی کەلوپەلە بەردی وئیسقانی قورینەکانی هەریەك لە مەتارە و چەرمۆی لە شوێنی کارەکەدا پۆلێنکرد (R. J. and L. Braidwood, 1950) بە هۆی "هەستی" داینامێکی مەتریاڵەکانی چەرمۆ بە پێچەوانەی مەتریاڵەکانی ئاخێر و ئۆخری مەتارە، سەرنجی راکێشرا.

لیندا بریدوود لەم سەرنجدانە بابەتییە دانپیاندراوەوە بەردەوامبوو پێشنیار بکات، کە "هەروەك پێشەوەرانی چەرمۆ لە قۆناغێکی چڕی بەرهەمهێن و داهێنەرانەدا بووبن، لە کاتێکدا پێشەوەرانی مەتارە بەرهەمهێنی سادەبوونە- بەرێگەیەکی مردووتر، هەروەك گەیشتبنە تروپك دواجار تەختبووبن.

سەرەڕای ئەوە نازانین ئەم قۆناغانەی چربوونەوە گەر بە شێوەیەکی گشتی سەردەمەکانی خێرابوونی شارستانی گەورە و گۆران جیا تایبەت بکات.

رەنگە ئەمە نموونەیەکی کۆنتری  بلاوترینی کەلوپەلەکانی ئەم شێوانەن:

شێوەی قوچەکی کونکراوی سەراوبنی خودان لێواری رووبەبان (flared) و شێوەی گۆیی یا هێلکەیی خودان تەکنیکە جۆراو جۆرەکانی لێوە گڵێنە و دەفریە نزمی شێوە پندریسکی* نزم (جوجوئی (carinate) (P1. 21-16).

شێوە قوچەکییە کۆنکراوەکان بریتین لە باوترترین شێوە لە قوڵترین چینەکاندا، بەلام بە زۆری شێوەکانی دیکە کە هەمیشە بچوکتر و رووبەبانترن لە چینەکانی سەرەوەدا جێگەیان دەگرنەوە.

ئادەمز وای حسێب کردووە، کە تەنها پارچەکانی لە (١,٠٠٠ پارچە زیاترن) لە وەرزی ٥١/١٩٥٠ دۆزرانەوە، دەبێ بە لایەنی کەمەوە بە ٣٥٠ دەفری جیاوازەوە بەندیواربن، هەروەها واشی حسێب کردووە، کە وەبەرهێنانی بەرهەمە دەستکردەکان لە ماوەی کاری ژیانی مرۆڤدا (man- hour) گەلێك زۆر بووە.

بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا خەڵکی چەرمۆ دەفرە بەردینەکانیان بەرز نرخاندووە، چونکە زۆربەی پارچەکان کونە سمتۆك پێشان دەدەن، کە بۆ چاککردنەوەی درزەکان تێیانکراوە.

کەوچکە لە ئێسقان دروستکراوەکان بلاوترن (بڕوانە دواتر) هەروەها کەوچکی لە بەردی داتاشراو دروستکراویش هەبوون، ئامرازگەلێکی جۆراوجۆری لەپێناو مەبەستێکی سەیر دروستکراویش هەبوون. گۆی کونکراوی قەبارەی سەرە دەمبووسی بەردین.

* پندریسك (carinate): باڵندەیەکی چکۆلەیە.





ئەوەی فرانكفۆرت بۆ سەرهەڵدانی شارستانییەت وەك ".....دەرئەنجامی گۆڕانێكی كتوپڕ و بەهێز، تەنگژەیەك، كە تێیدا شێوەكەی لە بە كریستاڵبوون دەردەچێ- ناپەرەسەندووە بەڵام لە حاڵەتی توانستەكی تەواوێكە.....؟ دەبینێت، نەبێت.

لایەنە سەرەتاییەكانی كۆمەڵگەی چەرمۆ، لە كاتێكدا بە تەواوی سروشتین، رەنگبێ هەستێكی ئەو سەرەتاییە بە دەستەوە بدەن، كە لەڕاستی روونتر بێت.

گوماندەكەین، كە چەرمۆ لە رووی رووەكانی دیكەوە لە پێشدا "پێشەنگ" بووبێت، هەروەها گوماندەكەین چەرمۆ لایەنێكی زووینەی كۆمەڵگەی لادێی جووتیاری جێگیر (بەڵام لایەنێكی زۆر زۆر زووینە ناشێ وێنا بكرێ) بووبێت.

ئایا لە راستیدا قۆناغێك یا دوو قۆناغی "بەلادێبوون" بە كشتوكاڵێكی سادە و ئاژەڵ ماڵیكردنەوە لە هی چەرمۆ كۆنتر بەڵام بەدوای ئاستێكی زۆر بنچینەیی كشتوكاڵی سەرەتایی هاتبێت، كە پێمان وایە جۆری كۆمەڵگاكانی كەریم شەهر ئەوە پێشنیاز دەكەن هەبووە؟ لەسەر بنچینەی بەڵگە فەراهەكانی كوردستانی عێراق پێمان وایە، كە قۆناغێك یا قۆناغ گەلێكی وەك ئەمە هەبوونە.

پرسیار گەلێكی وەك ئەمە گرنگی دەدەن بە بەڵگەكانی فەلەستین.

بیرۆكەی شارستانی گەورەی هێڵی ئەم سەردەمە گشتیە رەنگە وەك یەكێك لە سەركەوتنە هەمیشە ڕوو لە زیادەكان لە خۆ گونجاندنی هەرێمی و تایبەتكردندا وێنە بكرێت، هەروەها بێگومان بە هۆی دەرخستنی شارستانی (foci) هەرێمی بە شێوەیەكی بەراوردكاری دەتوانین گەلێك فێرببین، هەروەك ئەوان ئەزموون گەلێكی جیاواز بووبن.

هەرچۆنێك بێت پێشبینی كردنی ئەوەی، كەهیچ شارستانییەكی مرۆڤ هەرگیز لە بۆشاییەكی دابڕاو (Vacaum)دا نەبووە شتێكی نالۆژیكییە، هەروەها وێنەی "ئەزموونە جیاوازەكانیش" پێویستە زیدەڕۆیی تێدا نەكرێ.

# کانی سوور، خوڕە نەمك، خەرابە قەرەچوار

مەتریاڵەکانی ئەم شوێنانە لە دەوروبەری گشتی چەرمۆدا (بڕوانە ل، ) تەنها لە دۆزراوەکانی رووی دەرەوەدا گوزارشت دەکرێن.

هەڵبژاردنەکانی کانی سوور، کەلە پارچە بازنەی مەڕمەڕ و دەفری بەردین پێکدەهاتن وا دەردەکەون بەشێوەیەکی جوانکیلە هاو وێنەکانی لە چەرمۆدا (تەواوبن).

هەمان شت لە بارەی خوڕە نەمکیشەوە راستە، کە تێیدا شوێنەوارەکانی بەرد تاشیکاری (ground stone industry) وەك چەرمۆی لە رووی پارچە دەفرەکان و تۆپەڵێکی بەردین (رەنگە) و پارچە دەسکە ئاونگێکیش، دۆزرانەوە.

ئامرازی تیخۆکەی (bladelets) بەردی ورد بە چەند بڕێك دەرکەوتن، تیغێکی بەرد ستیش لەگەڵ دەسکە داسێکدا هەبوو، هەروەها رەنگبێ شوێنەواری بەردەستێکان باشترین دیاریکەری قۆناغی چەرمۆ بێت جگە لەوەی لە راستیدا تەواو دەگشتێندرێن.

شوێنی گەورەتر و گەلێك کاریگەرتری خەرابە قەرە چوار، کە بەسەر درێژبوونەوەیەکی تۆق چایدا دەڕوانێتە ئەو شوێنەی هێشتا رووبارەکە تێیدا چوار وەرزییە، رەنگبێ دیاردی بە ئاسۆیەکی تا ڕادەیەك نێوەند لە نێوان ئاسۆکانی چەرمۆ و کەریم شەهر بدات.

لەم شوێنەدا چوار کەس لە ئێمە بە کەمێك لە سەعاتێك کەمتر سێ سەد و بیست بەردەستێی دروستکراو و حەوت پارچە بەردی داتاشراو و تەلەزمێکی ئۆبزیدیان کۆکردنەوە.

ژمارەی تیغ و کرۆکە تیغەکان زۆر بوو، هەروەها نزیکەی سێیەکێکی (٣/١) ئەم وەدەستهێنراوانە ئامرازی بەردی ورد (microlitnic) بوون.

کرۆکەکان (cores) و کرتێنەری دروستکراو لەسەر لایەکی رنەکەکاندا بە هۆی لێکخشاندنەوە (wear) نەك تیژکردنەوە (retoueh) هەروەها کەمی دەسکی تیغە داس ( sickle- blade sheen) و (بە شێوەیەکی سەرەکی) لە ئۆبزیدی دروستکرانیان پیشەکارییەکی نزیکتر لە هی کەریم شەهر نەك چەرمۆ پێشنیار دەکەن.

هەروەها بێورێکی پارچەکراو (chipped celt)ی خودان نووکێکی زەمبەلەکی مشت و ماڵکراو و پارچە مکارەیەکی گاشەی قلێش لێهەڵکەندراو (grooved pebble abrading- piece)ی لە بەردی (تەمتەم؟) (schist)* دروستکراو کەریم شەهر پێشنیار دەکەن، بەلاّم گاشایەکی "بێکەڵك" و بەتایبەتیش کەلوپەلێکی جوان داتاشراوی شێوە دەسکی ئاونگ هەروەك ژمارەیەکی کەمی کرۆکە تیغی گەورەی ساف چەرمۆ دەخەنەوە یاد.

هەروەها دوو پارچە دەستاڕ و بەردێکی هاڕین هی هەردوو شوێنەکە هەبوون.

## تەل مەلفەعات

هەلی رووی نێوەوەی سەنگەری تانکەکانی سەر لای خاورووی رۆژهەلاّتی تەپۆلکەکەمان بۆ لانی هەڵکەندنێکی ئەزموونی بە ئاراستەی تروپکی گردەکە قۆستەوە (هەڵکۆڵینی ئەزموونی دووەم). ئەم تەپۆلکەیە تەنها مەتریاڵی لە تەلانەکە (Talus) داشۆڕاو و هێندێك هێمای نیشتەجێبوونی بێ مێتۆدی دواتری خستە بەردەست.

دوو هەڵکۆڵینی ئەزموونی لە نزیك خودی تروپکی تەپۆلکەکەدا لێدران.

تۆکمەیی خۆڵەکە وا دیارە گۆڕهەڵکەنە (مشکە کوێرە)کانی هاندابێت، کونەکانیان گەلێك زۆربوون و تەنانەت دەگەیشتنە قولاّییەکانی دوو مەتریش زیاتر.

ژمارەیەکی کەمی کۆتەکەڵەی چەرخەی گلکار (wheel- made pottery)ی سەردەمانێکی دواتر لەسەر رووی دەرەوەدا هەبوون- کە سەیر نییە لەسەر تەپۆلکەیەکی بچووکەوە بنواڕێتە بوورێکی* گرنگ- هەروەها چەند کۆتەکەڵەیەکی بە چەرخەی گلکار دروستکراو لە قوڵییەکدا دەرکەوتن، بێگومان کونی مشکە کوێرەکان داتەپیون.

سەرەڕای هەموو ئەمانە، شتێکی سەیرە، کە مەلفەعات لەچاودا زۆر شڵەژاوە، کاتێك یەکێك شوێنەکەی —وەسف- بکات.

---

* تەمتەم؟ (schist)=schiste=shist=schistos: بریتییە لە جۆرە بەردێك ئاسان دەشکێ و هێڵە کریستاڵێکی بەردی گۆڕاوە و پێکهاتەیەکی شێوە گەلاّیی هەیە و بە ئاسانی بۆ تەریبی تەخت دابەشدەبێت لەوەدا لە بەردەستیێ (gneisses) جیاوازە سلیکاتی ئەلەمنیۆمی بنچینەیی تێدا نییە.

* بوور(ford): شوێنێکە لە رووباردا دەکرێ بە ئاسانی پێدا بپەڕێتەوە.



درێژبوونەوەی گشتی مەتریاڵەکانی رووی دەرەوە و کەلوپەلەکانی لە هەڵکۆڵینە ئەزموونییەکاندا دۆزینمانەوە روخسارێکی تەواو لە بارەی دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی تۆکمە بە دەستەوە دەدەن.

هەلکۆڵینی ئەزموونی یەکەم، تا رادەیەك دوور لە تروپکی تەپۆلکەکە لە لای تەلانی رووبارەکەدا نزیکەی بیست مەتری چوارگۆشەی دەرخست و لە لایەکیشدا گەیەندرایە قوڵێ ٢,١٥ مەتر لە ژێر رووی عەرزەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تێکرای قولاّییەکەی لە ١,٥مەتر زیاتر نەبوو خۆڵی پاکیش لەژێر رووی عەرزەوە نزیکەی ١,٩٠ مەتر بوو.

لە هەلکۆڵینی ئەزموونی سێیەمیشدا، کەمێك دوور لە تروپێکی تەپۆلکەکە بەلای باکووری رۆژئاوادا، روبەرێکی نزیکەی ٤٠ مەتری چوارگۆشە بۆ قولاّیی نزیکەی مەترێك هەڵدرایەوە، بەلاّم نەگەیشتە خۆڵی پاك. لە هەڵکۆڵینی ئەزموونی یەکەمدا، دوو قۆناغی ئەوەی رەنگبێ خانوویەکی چاڵی بچووك بووبێ، دۆزرانەوە. لە هەڵکۆڵینی ئەزموونی سێیەمدا، دوو قاتی زۆر روون و ئاشکرا لەگەڵ چڕبوونەوەی بەردەکاندا هەبوون، هەروەها لە خالێکە درێژە بڕگەکان (profile) دوو چینی رەشی لێکجیاکەرەوە و چینێکی گاشەیان لە نێوان هەردوو قاتەکەدا پێشاندا. روون و ئاشکرایە، کە شوێنی مەلفەعات لە پێناو چاککردن و گۆڕانکارییە کشتوکاڵییەکانی پێویستبووە بکرێن، بە تەواوی بۆ ماوەیەکی درێژ ئۆقرەی گرتووە.

چاڵە ئەسڵییەکەی لە هەڵکۆڵینی ئەزموونی یەکەمدا هەڵدرایەوە لە رووی پلانەوە تاڕادەیەك هێلکەییەکی نارێك بوو (لە دەوری ٣,٥٥x٥,٧٠ مەتر) چاڵە ئاگردانێك لە لای باشووردا دەرکەوت.

لەم شوێنەوە قاتی چاڵە کە نزیکەی ١,٥٤ مەتر بوو لە ژێر رووی عەرزەوە.

دواجار، قاتەکە لە قوڵی ١,٢٥ مەتر لەژێر رووی عەرزەکەوە بەرەو باکوور و رۆژهەلاّت بۆ نزیکەی ٣x٤ مەتر فراوان بوو.

بەشی خوارەوەتری چاڵە کۆنترەکە پڕ کرابوویەوە و بە تەواویش بە بەردی کرێت "قاتریژ" کرابوو. لایەکانی ئەم چالاّنە بە شێوەیەکی ماقوڵ لە ژێر رووی عەرزەوە بە شێوەیەکی ستوونی بۆ نزیکەی ٨٠سم بەرزکرابوونەوە.





ناكرێ هیچ درێژە پێدانێك لەسەر رووی ئەم چینەدا بەدیبكرێت، كە بنچینەی ناوچەی كۆنكرێتی سەمە بەردەكە* بووە.

چۆن ئاوا بەقوڵی چاڵەكان لەژێر رووی عەرزە ئەسڵییەكەیانەوە لێدراون و چۆن قاترێژ كراون. روون نەبوویەوە.

لە هەڵكۆڵینی ئەزموونی سێیەمدا شوێنەواری چالاكییەكانی رۆنانسازی هێشتا زۆر گۆنگبوون. رووبەرەكە پڕ لە بەردی پەرش و بلاو بوو، هێندێكیان كرێت و درزبردوون (رەنگبێ بە ئاگر وایان لێهاتبێ) هەندێكیشیان لوس بوون.

كەمێك ئاونگ و دەستاڕی كەڤەر (boulder)ی پارچە پارچە بە تەواوی دەركەوتن.

لەسەر قاتی یەكەمدا نزیكەی سێیەكی چێوە بازنەیەكی ئەوەی بە شێوەیەكی روون و ئاشكرا بازنەیەكی (نزیكەی ٤ مەتر) ئەو بەردە زبرە بچووكانەی لە سوچێكی هەڵكۆڵینە ئەزموونییەكەدا دەركەوتن بوو، لە قوڵایی كەمێك لە نیو مەتر زیاتردا دۆزرایەوە.

"دیوارە" بەردە بازنەییەكە لە ١٥سم ئەستوورترنەبوو، راستتر بڵێین زۆر بەرزیەكەی پێشنیاری بناغەیەك دەكات بۆ دیواری ژوورێكی بەرز.

لە نێوان هەردوو قاتی یەكەم و دووەمی زۆر روون و بەرچاودا دوو ناوچەی پچڕ پچڕی گاشەكان هەبوون، كە بە شێوەیەكی روون بە مەبەست دانراون.

بە شێوەیەكی كردەیی ناكرێ هیچ شتێك لە بارەی بەردی پەرش و بلاوەكانی رووی (**السطح**) قاتی دووەم بكرێت مەگەر كۆمەڵێكی گەورەی تەختە بەردی لە كەڵك كەوتوو بووبن، كە بە هۆی بوونی گاشە بەردی جۆراوجۆری پەرش و بلاو و كۆمەڵكردنە بێ مێتۆدەكانی بەردە گەورەكان لە هەمان رووداا ئاسۆیەكی نیشتەجێبوونی بەرچاوە. نزیكەی دوو دەرزەن پارچەی بە لایەنی كەمەوە لە قوڕی نیمچە سووركراوە دروستكراو بەڵام بە پارچە پارچەی دەركەوتن. هێندێك لەمانە پارچەیەك پەیكەرۆكەی یا شول (rod)یا تۆپەڵی بەرچاو و روونبوون.

* سەمە بەرد (lime stone): بەردە قسڵ.





هەروەها موروییەكی لولەكی قوڕینی سادە هەبوو. لەبەر ئەوەی ئەم كەلوپەلانە لە كۆنتێكستی كەریم شەهر (بڕوانە) و چەرمۆدا ناسراوبن، هۆكارێك نییە تاكو گریمان بكرێ ئەو كەل و پەلانە پەلمشكار (intrusive) بن لە مەلفەعاتدا.

پیشەكاری بەردی پارچە پارچەكراوی مەلفەعات بە زۆری بەردەستێ بوو، هی بەردی ئۆبزیدی لە شەش نموونەی دۆزراوە لە شوێنی خۆیاندا (in situ) (كە كرۆكە تیغۆكەیەكی هەرەمیشیان تێدایە) لەگەڵ پێنج نموونەی دیكە لەسەر رووی عەرزەكەدا قەتیس بوون.

كرۆكی تیغۆكەی (bladelet) هەرەمی و كرۆكی تەلەزمە فرە رووەكان لە بەردەستێ گەلێك زۆر بوون. تیغی یەك لا (Backed bladelets) لە قەبارەی ئامرازی بەردنی ورد تا ئامرازی سەرتیژ (pointed) و تیغی كەڵبوو و تیغی خودان كرتەی تیژكراوە و زنجیرەیەك تیغی سەر قۆقز (concave- ended bladelets) هەروەها نووكە رنەك (end scrapers) هەن.

تیغی قەبارە ئاسایش دەركەوتن، بەلاَم رنەكەكان (كە بەزۆری لەسەر تەلزمەكان بوون) یا ئامرازی نەخشكردن (burins) (كە زۆربەیان لە پارچەكانی كرۆكی تیغۆكە (bladelet) دروستكرابوون) زۆرنەبوون.

لەڕووی بەردە داتاشراوكانیشەوە (ground stone) مەلفەعات بڕێكی تەواوی ئاونگ و دەسكە ئاونگ و دەستاڕی كەڤەری هەمیشە پارچە پارچە و بەردەكانی هاڕین، هەروەها بێوری بەردینی داتاشراو و مشتومالكراوی خستە بەردەست.

كەلوپەلە بەردینە بچووكەكانیش لەمانە پێكدێن: پارچەیەكی جوگانێكی (rod) بەجوانی داتاشراو و مشتومالكراو گاشەیەكی لە كەڵك كەوتوو و پارچە دەفرێكی پەل (shallow) (لەڕووی دەرەوەوە) هەروەها دوو تۆپەڵ (ball).

شوێنەكە هێندێك سمتۆكی ئێسقان یا پارچە سمتۆكی خستە بەردەست.

هەروەها گواشۆڕ (pendant)ێكی لە شەیتانۆكەی دۆلكەیی (clamshell) دروستكراوی شێوە لاكێشەیی خودان سوچی خڕ، هەبوو" هەروەها هێندێك پارچە شەیتانۆكەی هێلكەیی دیكەش دەركەوتن.

ئەم كەلوپەلانە، بە پارچە قوڕە سورێك و پاشماوەی (ghost) حەسیرێكی تیا چەسپیوی بە تەواوی خێرا لەناو چوو (كتومت لەژێر قاتی یەكەم لە هەڵكۆڵینی ئەزموونی سێیەمدا) لیستی كەلوپەلەكانی مەلفەعات تەواو دەكەن.

ئێسقانی گیانەوەرانیش هێژ نەکۆڵراونەتەوە.

برۆمان و هاو بە هۆی لەیەکچوونی گشتی بەردەستێکاری مەلفەعات لە بەردەستێکارییەکانی کەریم شەهر و گردی چای پێیان وایە بەوان کاریتێکراوە.

بەڵام وا دەرناکەوێ گردی چای بەردتاشکاری (ground stone industry) هەبێت تاوەکو هاوڕێکی پیشەکارییەکانی مەلفەعات و کەریم شەهر بێت.

بۆ نموونە، بێورە بەردینەکان لە مەلفەعاتدا بە زۆری کۆنکراو (pecked) و داتاشراو یا هەڵکۆڵدراوو (ground) و مشتوماڵکراو بوون، بەڵام لە کەریم شەهردا پەل پەل کراو (chipped) تەنها نوکەکانیش مشتو ماڵکرابوون.

بازنە مەڕمەڕەکان وەك کەریم شەهر لە لێکۆڵینە ئەزموونییە قەتیسبووەکانی مەلفەعەتدا دەرنەکەوتن. ئەم جیاوازیانەش ڕەنگە ڕەنگدانەوەکانی فەراهەمیەتی ناوچەی بەردی تەواو یا ڕەنگدانەوەکانی شارستانی یا جیاوازبوونی کاتی بن، بەڵام وا دەردەکەوێ زۆر خێرا لەسەر جیاوازییەکانی ئاراستەی وێکچوونی بەردەستێکارییەکاندا بگشتێنرێت.

دکتۆر ڕالف سولیکی و دکتۆر ڕۆز ئێلێ سولیکی لەگەڵ هەردوو بریدوودەکە و هاودا بە دلفراوانترین شێوە ئەو مەتریالانەیان پشکنی، کەلە ئەشکەوتی شانەدەر و شوێنی والای زاوی چەمی شانەدەردا دۆزیبونیانەوە.

تەواو قایلین، کە کۆمەڵگای زاوی چەمی شانەدەر پڕاوپڕی نێو هێڵی گشتی مەلفەعات و کەریم شەهر دەبێت.

کۆمەڵگەی زاوی چەمی شانیدەر سەرەڕای لێدەستکەوتووە زۆرەکانی لە ڕووی بەردی هەڵکەندراوی قورسەوە (جوونی heavy ground stone) وادەردەکەوێ تا ڕادەیەك لە کۆمەڵگای مەلفەعات نزیکانەتر بێت نەك کۆمەڵگای کەریم شەهر، بەڵام دووبارە، پێدەچێ ئەم نزیکییە بە هۆی یەکێك لە هۆکارە لە پێشەوەدا تێبینی کراوەکانەوە بێت.



## کەریم شەهر

هەڵکۆڵینەکانی ساڵی ١٩٥١ لە ترۆپکە گردی والای شوێنی کەریم شەهردا پێنج سەد مەترێکی چوارگۆشەیان لەکردەیەکی گەورەدا (P1. 22A) و حەوت چاڵی دۆزینکاری نا سەرەکیان هەڵدایەوە.

چاڵە دۆزینکارییە ناسەرەکییەکان بە شێوەیەکی فراوان لەسەر ترۆپکی گردەکەدا داباشکران و لەچاودا بێ بەرهەمبوون.

کردە سەرەکییە کە لە لێواری داماڵینێکی کەندێکی درێژەوە بەرەو نێوەوە بۆ نزیکەی ٦٥٪ی ڕووبەری گشتی هەڵدراوە فراوانکردوو بۆ قوڵایی گەلێك هەڵکەندرا لە چەند سەنتیمەترێکەوە دەگەیشتنە نزیکەی چوار مەتر (لە ڕووبەرێکی قەتیس بوودا).

چاڵێکی بەرتەنگ لە ڕووی کەندەکە لە شوێنێکدا لێدرا لیتە بنچینەکانی بۆ زیاتر لە دە مەتر لەژێر ترۆپکی ڕووی دەرەوەدا بڕی، ئەوەش لە سەرەتادا لەبەر هۆکارە جیۆلۆجییەکان هەڵکەندرا.

چینێکی تەنك، کە بە شێوەیەکی گشتی کتومت لەژێر (humus)ی ئێستاکەدا بوو، گوزارشتی لە چڕترین نیشتەجێبوون دەکرد بە درێژایی کەندەکە لە لای ڕۆژهەڵاتی ترۆپکە گردەکەدا.

ئەو چینە لە نزیکی یا لە ڕووی عەرزی نزیك لێواری باکووری دابوو هەروەها هەمیشە لەژێر شوێنێکی دیکەدا نزیکەی ٢٠ سەنتیمەتر بوو.

بنچینە کاریگەرەکەی لە هیچ شوێنێکدا لە نزیکەی ٣٠-٤٠ سم لەژێر ڕووی عەرزدا زیاتر نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا چەند دەستکەوتێکی بچووکتر و پەلە بەردی دیکە و ژمارەیەك لە قوڵایی گەلێکی جیاوازدا لەخوارووی نزیکەی دوو مەتردا دەرکەوتن.

بە تەواوی پێدەچێ، کە کێڵان و هێندێك داماڵین سەنتیمەترەکانی سەرەوەی نیشتە ئەسڵییەکەیان لێڵ کردبێت, لەکاتێکدا داکەوتن و داماڵین بە درێژایی کەندەکە کە بێگومان برێکی نەزاندراوی شوێنە ئەسڵییەکەیان ڕاماڵیوە.

پاشماوەکانی نشینگەکە لەبەر بڵاویەکی ئەو بەردە بەستە (streem pebble) پەرش و بڵاوە بێسەروبەرە جۆراوجۆرانە پێکدێت، کە نەك هەر لە کێبەرکێی سروشت بەدەر بوونە و بە





شێوەیەکی ئاشکرا بۆ شوێنەکە گوێزرابوونەوە، بەڵکو تێکەڵ بە سێ هەزار پارچە دەسکرد و بڕێکی هەر شێدار* (friable) و تەڵەزمی زۆر خراپ پارێزراوی گیانەوەران بووبوون.

بەردەکان بێ پێچ و پەنا لە چەند شوێنێکدا بڵاوبوو بوونەوە و لە شوێنەکانی دیکەشدا بە شێوەیەکی نارێك بۆ نێو جۆرێکی نزیکانەی (_set pseud- pavement)دا چڕبوبوونەوە (بڕوانە p1. 22A).

جگە لە دابەشکردنی گاشە داندراوەکان و ژمارەیەك چاڵی بەردپۆشراوو ( Rock littered pits)، ئەوا پاشماوەی هیچ ڕۆندراوێکی دیکەی ڕەسمی شیاوی وێنا کردن نەبوون.

نیشانەکانی زیاتری ئاگر لە درێژبوونەیەکی روون و ئاشکرای بێ پلانی بەردەکاندا لەوێ لە بڕێکی کەمی خەڵوز و ژمارەیەکی زۆر بەردی بە ئاگر شکاو (fire- cracked)و بێ ڕەنگ و ئێسقاندا، روون و ئاشکرا بوون.

ڕەنگە ئەم شوێنە تەنها گوزارشت لە لایەنێکی پچڕپچڕ (intermittent) یا وەرزی ئەو ئاسۆیە بکات، کە دیاردیدانەکانی نشینگە بەر ئەگەرە بەردەوامترەکان دەردەخات (بڕوانە ل.    ).

هەڵکۆڵینی فراوان لە کەریم شەهردا لەچاو سوستەیەکی فرەی سندوقی ئامرازە ناوچەییەکانی خستەوە.

جگە لە پەڵەبەردی دروستنەکراوی زۆر و کۆمەڵێك پارچەی کەم بەکارهاتوو کرۆکەکان نەبێت، بەردەستێکاری پارچە پارچەکراو (chipped flint industry) بە شێوەیەکی سەرەکی زیاتر لە ٧٠%ی لە تیغی کەلبوو هەروەها لە تەڵزم دروستکرابوو، نزیکەی ٤٠%یشیان تایبەتمەندی تەواوی (backed bladelet)ی ئامرازی وردیان هەیە و پارچەکانیش بە شێوەیەکی جۆراوجۆر تاوەکو نوکەکان (points) یا سەرەکان (ends) لە گۆشەیەکدا تیژکراون، ٢-٣% دووتا سێ لە سەدی هەریەك لەم جۆرانە تیغی بە وردی کرتەکراو و تەڵزمەکانن، سەرە رنەکەکان بەزۆری بە هۆی بەکارهێنانەوە (use)دروستکراون، سەرە رنەکە مایکۆلیتەکانیش شوێنەواری بچووکی بەکارهێنانیان لەسەر تەڵەزمەکان و تیغەکاندا هەبوو، هەروەها لە لارنەکە تیژکراوەکان یا مشتومالْ نەکراوەکان (crude side crapers) پێکدەهاتن" نزیکەی لە ١% یا کەمتری هەریەك لە ئامرازی نەخشکێشانی کرێت (poor buring) (کە بەزۆری سادەن و گۆشەیە بچووکیان هەیە لەگەڵ جۆرەکانی دیکەدا) و فابریکەیتورەکان (fabricators)* و شێوە

* هەرشیندار (friable): چینێك بە ئاسانی بشکێ.

*fabricator : ئامرازێکی بەردینی چاخە بەردینەکانە بۆ شێوەکردنی ئامێرەکانی دیکە بەکاردەبرا.



بچووکترەکانی پێچ و مۆرە (drill)کۆکراونەوە و کەمێکیان تایبەتمەندی (bladelet)ی دوولای بەردی ورد (double backed microlithic) یا تێدابوو تا رادەیەکیش کرابوونە نووکی وەك دەزوو (needle- like point).

گروهی زیاتریش لەمانە پێکدەهاتن: هێندێك دەرزەن رنەکی مشتومالْنەکراوی خڕ یا پانکەڵەیی (discoid) و هەریەك لە رنەکە سەختە دیاریکراوە دەستکردەکان و ( pointed bladelets) و تیغ و تەڵەزمە خودان شوێنەواری دەسکە داسەکان، هەروەها ئامرازی وردی ئەندازەیی زۆر کەمی گوماناوی.

لە راستیدا دەستکردە ئۆبزیدییەکان نەبوون.

سەرەڕای ئەم ئامرازە بەردەستێ مشتومالْکراوە بچووکانە، چینی نیشتەجێبوون، ژمارەیەکی زۆری بەردەستێ پارچە شکاندن (کوتەك flint- knapping debris) و ژمارەیەکی کرۆك (cores)هەروە کوتەکە بەردینەکان (hammer stones)ی خستە بەردەست.

زیاتر لە ١,٣٠٠ گاشەی هەرەمی و کرۆکەکانی تری کارامەییەك و رێك و پێکییەك و بڕێك ئامراز دەردەخەن، کەلە ئەشکەوتەکاندا یا لە ڕاستیدا ئێستاشی لەگەڵ بێ لە گردە کۆنترەکاندا نەدۆزراونەتەوە. زۆرینەی ئامرازەکانی تیغ و کرۆکی تیخۆکە (bladelet)ەکانن، هەروەها رەنگە کەسێك پێشبینی بکات، کە پیشەکارییەکە بەگشتی ئەم تایبەتمەندییە ڕەنگدەداتەوە.

نزیکەی سێ دەرزەن بێوری پارچەکراو (chipped celts) (P1. 22B)، کە هەندێکیان پاشماوەی پینە (patcns)ی تەڵەزمە گاشە (pebble cortex) و هەندێکیشیان شوێنەوای شوێنی کەمێك داتاشراو یا هەڵکەندراو (ground) و مشتومالْکراویان هەیە، دەرکەوتن، هەروەك بەردەکانی هاڕین* (rubbing stone) مکارەی بەردی تەمتەم (schist) و گاشەی بەکارهێندراوە، هەروەها کەمێك ئاونگی کەڤر و دەستاڕ و پارچە دەسکە ئاونگیش دۆزرانەوە (p1. 23:1-7).

هەروەها ژمارەیەکی زۆرکەم گواشۆرە (pendant)ی داتاشراوی سادە و مشتومالْکراو و موورو (P1. 23:9-14) و هێندێك بازنە و پارچە ئەموستیلەی مەرمەڕی سادە (P1. 23: 15-16) و ئامرازی ئێسقانی سادە و هێندێك مووروی ئێسقان و مووروی بچووکی شەیتانۆکەی کۆنکراو و پارچە کانزاش (plaques) دەرکەوتن.

* بەردی هاڕین (rubbing stone): بەردی پشاوتن، وردکردنی دانەوێڵە لە نێوان دووشتدا.





گشت ئەم خشلانە، بە تایبەتیش بازنەو موستیلەکان، جگە لە گروهە زۆر جیاوازەکان، لە چەرمۆدا بەگشتی شیاوی بەراورد کردنن لەگەڵ هاووێنەکانیاندا.

سەرەڕای ئەوەی گلێنە بە تەواوی نەبوو، بەلاّم دوو پەیکەرۆکەی قوڕینی کەم سورکراوەی بچووك (بۆ نموونە P1.23:8)، دۆزرانەوە, کە وێکچوون گەلێکی روونیان هەیە لەگەل نموونە دیاریکراوە تایبەتییەکانی یەکێك لە گروهە تایبەتییەکانی نێوان ئەوانەی لە چەرمۆدا دۆزرانەوە.

یەکێك لە پەیکەرۆکەکانی کەریم لە نزیك نێوەڕاستی رووبەرێکی بازنەیی قوڕە سوور لە چاڵێکدا دۆزرایەوە.

تاوەکو توێژینەوەکەی رید لە بارەی گیانەوەران (fauna) تەواو بێت، تەنها ناساندنەوە ئەزموونییە دیتنکارییەکانی بارت (Barth) فەراهەمن[٦].

(٦) هۆکاری ناتەواوی توێژینەوەی ئێسقانی گیانەوەرانی کەریم شەهر ئەمانەی خوارەوەن. لەکاتی گەڕانەوەمان لە کەرکوکەوە لە ساڵی ١٩٤٨دا، لە هاندانی سەرنجی دلۆڤانانەی پرۆفیسۆر برێین پاتسن ( Brayan patterson) لە مۆزەخانەی مێژووی سروشتی شیکاگۆ (ئێستا لە مۆزەخانەی گیانەوەرناسی بەراوردکاری لە زانکۆی هارڤەرد دایە) سەرکەوتین، هەرچەندە پسپۆڕیەتی پاستن هوربەر هەستزانی بڕبڕەدارەکانە ( vertebrata paleontology).

کۆکراوەکان بۆ مۆزەخانەی مێژووی سروشتی شیکاگۆ گوێزرانەوە بۆ سەرنجدانی پاتسن هەرکاتێك کاتی هەبێت. لە رێگاماندا بەرەو کاری مەیدانی لە ١٩٥٠دا، پرۆفیسۆر ڕچارد پیتیۆنی داوای لێکردین ئێسقانەکان بۆ پرۆفیسۆر جێی. دەبلیوو. ئامشلەر لە ئینستیتیوتی (fur Tierzucht) لە زانکۆی ڤییەنادا بنێرێن، بەو پێیە، پاتسن بۆ قۆستنەوەی سەرنج و توانای گەورەی پرۆفیسۆر ئامشلەر هانیداین. وەك دەرئەنجامێك، کۆکراوەکانی ساڵی ١٩٤٨ لە شیکاگۆوە نێردرانە لای ئامشلەر، هەروەها کۆکراوەکانی ٥١/١٩٥٠یش (کە لە چەرمۆ و کەریم شەهردا دۆزرابوونەوە) راستەوخۆ لە عێڕاقەوە نێردرانە ڤییەنا.

کاتێك رید لە ئەیلولی ١٩٥٤دا بەشداری دەستەکەی کرد، سەردانی ڤییەنای کرد و بە گفتوگۆکان لەگەڵ ئامشلەر و پشکنینی کۆکراوەکان چەند رۆژێکی بەسەر برد، رید لەکاتی گەرانەوەی لەکاری مەیدانی لەساڵی ١٩٥٥دا گەشتێکی دیکەشی بۆ ڤییەناکرد. لەساڵی ١٩٥٦دا هەوڵی ناخۆشی مردنی ئامشلەر هات. لەڕێگەی سکرتێرە چالاکەکەیەوە (fraülein Helly klauza) ئامادەبووین بۆ ئەوەی ئێسقانەکان دووبارەبگێڕینەوە شیکاگۆ.

بەداخەوە، ئێسقانەکانی کەریم شەهر بەشێك نەبوون لە بارەکە (shipment)، لەبەر ئەوە ماددەکان دەبێ بمێننەوە تاوەکو جارێکی کە رید دەتوانێ سەردانی ڤییەنا بکات.

رید بەدڵنیایەوە هەستدەکات، کە ناسینەوەکانی بارت بەشێوەیەکی سەرەکی بەگشتی (en masse) راستن، بەلام گوزارشتەکەی لەبارەی پشکەکانی لە لایەن بریدوودەوە دراون دەخاتە ژێر پرسیارەوە (1952a).



لەم شێوانەی توانستەکی ماڵیکردنیان هەیە، مەڕو /یا/ بزن و بەراز و چوارپێن.

سەرەڕای ئەوە ئاسك و شور (gazelle) و گورگ و دەڵەك و رێوی و شێوەی سەگ (canine) هەروەها شیردەرێکی بچووکی نەناسراو و باڵندە و کیسەڵی زۆر هەبوون.

لە نێوان ئەو برە زۆرەی قەپێلکە شەیتانۆکەکان جۆری (Helix slaomonica)، کە لەلایەن بکوێرتەوە ناسێندرا باوە.

توێژینەوەی هەڵبیك لە بارەی بەڵگە گیاییەکانی کەریم شەهر هێشتا تەواو نییە.

دە سوستەی خەڵوز نێردراونەتە لای باگهون. حەوت لەم سوستانە داری (selkova؟) بوون، دارێکیان Ulmaceae بوو، کە زۆر پەیوەندی بە رەشەدار (elm)ەوە هەیە، دوانیان دارگەزبوون و یەکێکیشیان داربەقلی Prosopis وەك (mesquite) بوو.

تەنها سوستەکانی ئەو شوێنەوارانە (findspots)ی ((بەجێگای متمانە))مان دانابوون بۆ باگهون نێردران، بەلاّم هەر سوستەیەکی پارچە خەڵوزێکی شوێنێکی زۆر پەل(shallow)ی وەك کەریم شەهر تارادەیەك بەرگومانە.

جێگای سەرنجە، کە (selkova?) نە لە سوستەکانی چەرمۆ و نەلە سوستەکانی پەنگەوەرەشدا دەرنەکەوتن، هەروەها جێگای سەرنجە، کە زۆهری (zohary) (١٩٥٠) تێبینی دەکات ئەو دارە ئێستاکە بوونی لە عێراقدا دەگمەنە.

ئەوەی لە کەریم شەهردا شایانی تێبینی کردنە بوونی یا نەبوونی تایبەتمەندییە دیاریکراوەکانە، کە بۆ راڤەکردن تێل نیشانکردنانێکی زۆر سەرنج ڕاکێشان هەیە.

یەکەم، پێوەندی لە نێوان ئەم ئامرازانەدا هەیە:

بێورە بەردینەکان (chipped celts) و ژمارەیەکی سنوورداری دەستارەکان و دەسکە ئاونگ بەردەکانی هارین و هێندێك خشڵی داتاشراو و مشتومالّکراو و پەیکەرۆکە قوڕینە دەگمەنەکان هەروەها بەشێکی گرنگی گیانەوەرەکانی شیاوی ماڵیکردنن.

دووەمیان، یەکێك نەبوونی ئامرازی ئۆبزیدی و گلێنە و هەبوونی بەردەستێکاری پارچە پارچەکراو تێبینی دەکات، کە ((زۆرکۆن)) دەردەکەوێت، ئەم تێکەڵبوونەی شتەکۆنەکان بە لایەنی کەمەوە لەگەڵ هێندێکی نوێدا، باوەڕمان وایە، بە کەریم شەهر تیل نیشانی شوێنێك دەکات لە سەرەتای قۆناغی گواستنەوەدایە.





گروهی بەردە داتاشراو یا هەڵکەندراوە دەستکردەکان چ گەورەبن چ بچووك، چ بەسوودبن چ بێسوود، یەکەمجار روخسارێکی روون لە ناوچەکەمان کەریم شەهر- هەروەها لە مەلفەعات و زاوی چەمی شانیدەردا دروست دەکات.

لێرەدا وا دەردەکەوێ کۆنترین بەڵگەی پۆزەتیڤی تەکنەلۆژیایەکی نوێمان هەبێت سەبارەت بە ناوچەی رەخە گردەلانیەکان، کە ئێستاکە بە ئامادەکردنی ئامراز و دەفر بەردینەکان ناسراوە بە هۆی کوتان یا لێکخشاندن (grinding) و کونکردن (pecking) و مشتومالکردنەوە (polishing).

راستە، پێشتر تیل نیشانەکانی ئەم تەکنەلۆژیایە نوێیە لە هەریەك لە ئەشکەوتی پەلگەوەرە (ل. )و چینی (B) ئەشکەوتی شانەدەردا هەبوونە (solecki, 1955, pA10).

بەرهەمەکانی ئەم تەکنەلۆژیایە، بە تایبەتیش ئەوانەی گەورە و کرێت و زەبەلاحن، بە دڵنیاییەوە شوێنەوارناسان لە رۆژهەلاتی نزیکدا گرنگی پێویستیان پێنەداوان، هەرچەندە بێگومان ئەم دەستکردانە زۆریان لەبن باڵدایە پێمانی بلێن، بەلام بە ئەستەم دەتوانرێ بگوترێ تەکنیکی تەواو بۆ پۆلێنکردنیان و توێژینەوەیان گیراوەتە بەر. بە ئەگەر لە هەریەك لە کەریم شەهر و مەلفەعات و زاوی چەمی شاندەردا دەفر و ئامرازەکان بەلایەنی کەمەوە لەم بەشەی ناوچەی رەخنەگردەلانیەکاندا یا زۆر نزیك لە شوێنی ئەسڵی خۆیاندا (naissance) دەبینین، مەتریالی بەراوردکارمان نییە لەبەر ئەوە هێشتا لە هەڵسەنگاندنی سەرنجی خێرایان بەولاوە ناتوانین زیاتر بکەین.

رەوشەکە لەوەی پێوەندە بە پەیکەرۆکە قورینەکانەوە تارادەیەك هاوشێوەیە، بەلام مەتریالی گەلێك کەم هەن تاوەکو بنچینەیەك بۆ تێرامان دروستبکرێت.

بەردەستێکاری پارچە پارچەکراوی کەریم شەهر پتر پێدەچێ بەردەستێکارییەکی لاواز (attenuated) بووبێت نەك بەشێك بووبێت لە تەقلیدی چەرمۆ هەروەها رەنگە تەنها بەردەوامبوونی وەرزی چەند لایەنێکی گریمانی تەقلیدی دروستکردنی بەردی زەرزی بووبێت، کە لە نزیکی ئەشکەوتەکان و پەناگەکان و (پێدەچێ) تەنانەت لە شوێنە والاکانیشدا دۆزرابێتەوە (بروانە ل. ).

کەریم شەهر گۆڕانی تەکنیکی و پەرەسەندنی جۆری ئامرازەکان (Typology) لەگەڵ تایبەت کردنی زیاتر لە هەندێك روەوە پێشاندەدات بەلام لە هەندێکی دیکەدا خراپبوونی بەرە بەرە پێشاندەدات.

کەوابوو، تیغی یەك لای قەبارە ئاسایی و ئامرازی نەخش کێشان و رنەکی باشتر دروستکراو هەروەها شێوەکانی ئامرازی وردی ئەندازەیی جۆراوجۆر ئەوانەی لە شوێنەکانی زەرزیدا



دۆزرانەوە بە شێوەیەکی سەرەکی لە کەریم شەهردا بوونیان نییە، بەلام بلەیدلیتی وردی یەك لای جۆراوجۆر و پێچ و مۆرەکانی بلەیدلیتی دوولا یا دوونووکی وەك دەرزی بە شێوەکانی تایبەتکراو درێژەپێدانەوە پەرەیان پێدراوە، هەروەها ئامرازە نەخشکێشە دەگمەنەکان هەمیشە روون و ئاشکرانین هەروەها رنەکە گەلێك زۆر فرەکان بەگشتی بەخراپی دروستکراون، هەرچی جۆری دووەمانە زیاتر بە هۆی لێکخشاندنەوە (wear) دروستکراون نەك بە هۆی هەر تیژکردنەوەیەکی بەرچاو یا ئامادەکردنەوە.

ئامرازە دروستکەرەکان (Fabricators) و پێچ و مۆرە بچووکترەکان (smaller drill) و تەلەزمە بەکارهاتووە کەلبووەکان لە هەریەك لە کەریم شەهر و بەردەستێکاری پارچە پارچەکراوی زەرزیدا هەریەکەیان ماددەی گرنکن، هەروەها رەنگە یەکێك مکارەکانی هەردوو شوێنەکە (grooved stone abrading) بخاتە سەر ئەم ئامرازانە.

هەروەها شایانی تێبینی کردنە، کە ئەم جۆرە بەڵگەدارترین بەردەستکاری پارچە پارچەکراوە لە کەریم شەهردا، کە وێکچوونێکی فراوانی شێوەیی (morphological) و پەرەسەندنی چەشنی ئامرازەکان (Typology) هەڵدەگرێت لەگەڵ کۆکراوە سنوردارەکانی کۆمەڵگاکان، کە لە ئەنجامی هەڵکۆڵینە ئەزموونەیەکان لە هەریەك لە گردی چای و مەلفەعاتدا دۆزراونەتەوە، ئەم دوو کۆمەڵگەیەش کەوتوونەتە هەرێمی خوارووی ئەوپەڕی باکوور، هەروەها وێکچوون لەگەڵ ئەو مەتریالانەشدا هەڵدەگرێت، کە سولێکی بەم دواییانە لە شوێنی والای زاوی چەمی شانەدەردا دۆزینەوە (بروانە ل. ).

لە تێڕوانینی پرسی نێوەندیمانەوە (بۆ) تێگەیشتن لە دامەزراندنی کۆمەڵگەی لادێی جووتیاری جێگیر کەریم شەهر کتومت بەقەد چەرمۆ گرنگە.

لەراستیدا گەلێك گرنگ بێت کە بە زیندویی هێشتنەوەی پەرەسەندنی چەشنی ئامرازەکان و لەناوچوونیان بە هۆی ژمارەیەکی کەمی توخمە سەرنج راکێشە نوێیە سەرەتاییەکانەوە کۆدەکاتەوە، بەلام جێگای داخە، کە بنچینەکانی راڤەکردن لە چاودا قەتیسن.

بەهۆی مەتریالەکانی لایەنی گشتی ئەوانەی لە کەریم شەهرو مەلفەعات و زاوی چەمی شاندەردا دۆزراونەتەوە لەگەڵ ئاستەنگییەکانی تایبەتیکردنی بە تەنها لەسەر بنچینەکانی کەلوپەلی دەستکرد هەر چالاکییەك لە نێو سەردەمێکی کشتوکاڵکردنی سەرەتاییدا رووبەڕوو دەبینەوە.

# گردی چای

تروپکی گردەکە، کە بەتەواوی دەڕوانێتە زێ، بە هۆی پێنج چاڵی بچووك و راماڵینێکی (یا بەشبەشکردنێکی) بەرتەسکی کەندی بەرامبەر رووبارەکەوە، تاقیکرایەوە. ئەو رووبەرە گشتییەی هەڵدرایەوە نزیکەی ٤٥مەتری چوارگۆشەبوو، بۆ تێکڕایی قۆڵی نزیکەی مەترێك.

بە هۆی دەرکەوتنی چالاّنی پەلمشکار (intrusive) لە زۆرترینی چاڵەکاندا و هەبوونی گلێنەی بەچەرخەی گلدار دروستکراوی زۆرنوێ و پارچەدار جگەرە (پارچە سبیلە Tobacco pipe) لە هەموو کردارەکاندا، دوای پێنج ڕۆژ شوێنەکە وازی لێهێندرا.

شوێنی چاڵێك گەیاندرایە خۆڵی بێ پیت لە ١,٣٥ مەتردا، تا ئەو شوێنەی سوڵەتە درەنگ ساتەکانی لێبوون.

هیچ قاتێك یا شەقڵێکمان نەدۆزرایەوە، کە باوەڕمان وابوو رەنگە شوێنی ئەسڵی سازکاری (industry)* ئامرازی تیغ و ئامرازی بەردی ورد (Microlithic) دیارییکات.

ڕۆندراوانی چاڵە گەورەکان، وەك چاڵە خانووەکانی* بەرئەگەری مەلفەعات (بڕوانە ل.        ).

رەنگبێ لە شوێنەکەدا هەبووبن و رەگبێ نەشبووبن" بێگومان لە پاکماڵکردنەکانیشماندا (clearances) هیچ رەنگرێژیەك (autline) روون و بەرچاو نەبوو.

چاڵە پەلمشکارەکانی دواتریش لە یەك کاتدا لێنەدراون (put down) لەبەر ئەوە کۆمەڵێك بازنەی تێك هەڵکێش (interpenetrating)یان نیشاندا.

وا دەردەکەوێ سازکاری بەردەستێی گردی چای زۆر لە سازکاری بەردەستێی کەریم شەهر و مەلفەعات نزیك بێت[(٧)].

* (١) سازکاری (industry): پێدەچێ کتومت لەبەرامبەر (الصناعە)ی عەرەبیدا بێت، چونکە پیشەسازی زیاتر پیشەگەری دەگەڕێتەوە نەك دروستکردن.

* (٢) چاڵە خانوو (pit-house): سەرەتاترین شێوەی شوێنی مرۆڤە، کە چاڵێکی هەڵکەندووە و ئینجا سەرپۆشی کردووە و تێیدا ماوەتەوە(؟)، کە وەك خانوو لە شوێنە والاّکاندا دەکاریهێناوە.

(٧) وەك ئێستا هەردوو شوێنەکە دەناسین، شوێنەوارەکانی چالاکی رۆنانسازی و کەلوپەلی بەردە هەڵکەندراوەکان (یاداتاشراو) لە مەلفەعاتدا بەڕوونترین شێوە مەلفەعات لە کەریم شەهر جیا دەکەونەوە.





کرۆکی تیغۆکەی هەڕەمی بە بڕێك دەرکەوتن. بلەیدلیتی یەك لای بەردی ورد لە سەرێکەوە تیژن و لە سەرەکەی تریشەوە بەلاو نیوی (obliquely) کونکراون. هەندێك تیغۆکەی سادەش کەلن (Notched)، هەمووشیان پلەی گۆڕانی بەکارهێنان و یا تیژکردنەوە پیشاندەدەن.

وا پێدەچێ لەوکاتەدا سەرچاوەی سەرەکی ماددەکان گاشە بەردەستێی بچووك بووبن، تەنانەت تەڵەزمە ئاساییەکانیش بچووکن (هەروەها دوای ئەوەی لە کرۆکە کرتوونەتەوە "struck off" بەبێ ئامادەکردنی زیاتر بەکارهیندراون). تەنها دوو ئامرازی نەخشکێشان (burins) دەرکەوتن، دوانیان لە پارچە کرۆکی.    بلەیدلیتن. تەنها هەشت پارچە ئامرازی ئۆبزیدی لە تاقیکردنەوەکەوا و پێنج دانەشیان لە رووی دەرەوەدا هەبوون.

بە شێوەیەکی نامۆ، هەرچەندە پارچەکانی بەردی هاڕین و کردنە ئارد و بێورە بەردینەکان و گاشەیەکی بێ کەڵك (waisted pebble) و پارچەکانی دەسکە ئاونگی بەر ئەگەر لەسەر رووی دەرەوەدا دەرکەوتن، بەڵام بەڵگەی بەردی هەڵکۆڵدراو لە شوێنی خۆیاندا (جوونی) ( insitu ground stone) کەمبوون.

بێورە بەردینەکان (chipped celts) زیاتر کەریم شەهر بیردەخەنەوە نەك مەلفەعات.

بەهۆی شلەژاوی رەوشتی شوێنەکە، هیچ شتێکی جێگای متمانە ناکرێ لە ئێسقانی گیانەوەران چاوەڕوانبکرێت.

رەنگبێ شوێنەکە وا دەربکەوێ ئەو خەڵکەی تەقلیدییان لە ئامرازی تیغ و ئامادەکردنی بەردی ورد (microlithic)دا زۆر لە تەقلیدەکانی هەریەك لە کەریم شەهر و مەلفەعات نزیکبووە، کەم تێیدا (رەنگبێ چینێك) نیشتەجێبووبن.

لەبەر ئەوەی شوێنەکە لەسەر زنجیرەیەك بووە بەسەر رووباری زێی و بەسەر هێری* ( Rolling fields) پشت (زێ)-شدا روانیویەتی، ئاسانە بە شێوەیەکی کەم ریزبەندی نیشتەجێبوونی سەردەمەکانی دواتری شوێنەکە تێبگەین.

* هێری (Rollingfields): زەوینی بەکەند و لەند=هەردە.

## تورکاکا و کەوری خان

ئەم دوو شوێنە بچووکە والآیانە، کە بەهۆی کۆکراوەکانی سەر رووی دەرەوە رووندەبنەوە، لە ماوەی ڕووپێوییەکەماندا لە دەشتی چەمچەماڵ لە ساڵی ١٩٥١دا لێیا کۆڵدرایەوە.

هەروەك هەردوو شوێنەکە بە بوونەگەی فشەڵ* (loosed sod) دادەپۆشرێن هەروەها تەنها لە هەلێکدا یا دوو هەل کۆڵدراونەتەوە، بواری تەواوی کەل و پەلە دەستکردەکانی ئەم شوێنەش بە تایبەتی ئامرازە وردەکان (microliths) رەنگبێ هێژ لە بەردەستدا نەبێت.

هەرچۆنێك بێت، نەبوونی روون و ئاشکرایی ئامرازی ئۆبزێدی و گلێنەکان و ئەو ئامرازانەی ئێستاکە لە هەردوو شوێنەکە زانداون ئەوە رووندەکەنەوە، کە ناکرێ سازکاری بەردەستێی چی کەریم شەهر یا چەرمۆدا یەکسان بکرێت.

دوو شوێنەکە شێوەیەك یا دوو شێوەی تایبەتی و هیندێك کەلو پەلی بنچینەیی ناتایبەتکراوی هاوبەشیان لەگەڵ چەرمۆ و کەریم شەهردا هەیە، بەڵام هەروەها ئامرازی دیاریکراوی دیکەشیان هەیە، کە زۆرترین تایبەتمەندی زەرزی-یان هەیە و تاڕادەیەکیش تەنانەت تایبەتمەندی برادۆستی کۆنتریان هەیە (بڕوانە ل.      ).

لە تورکاکادا کۆکردنەوەی زیاتر ١,٦٠٠ کەل و پەلی دەستکرد، جگە لە پارچە بەردی دروستکراو، ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە: بلەیدلیتی یەك لای زۆر دەگمەن، کە رەنگبێ لە هەلکۆڵینی بە ئاگایانەدا ژمارەیان زیاتر ببێت، ژمارەیەك سەروکە (end)ی بەوردی دروستکراو، ئامرازی وەك نینۆکی پەنجە، هەروەها رنەکی قاونی (discoid) لە رێکخستنی سەربەرەوژێری پۆلینکردنی ژمارەی کەلوپەلەکان بەگوێرەی جۆراوجۆری تایبەتمەندانەیان لە تاکە پۆلێکدا یا وەپاڵدراوی تایبەتیان (in that descending order of frequency)دا، هاوشان لەگەڵ هێندێك رنەکی دروستکراو بەهۆی لێکخشاندنەوە (wea) لەسەر تیغەکان, تەڵەزمەکان (flakes), هەروەها کرۆکەکان, رنەکە (steep scrapers) دەگمەنن بەڵام بەباشی دروتکراون و سمتۆکەکانیش بەسادەیی و سێگۆشەیی بەتایبەتیش شێوەی جۆراوجۆری فرەڕوو، ژمارەیەکی زۆری ئامرازی بەردی ورد (microlithic) و تیغی کەلبووی قەبارە ئاسایی و تەڵەزمەکان هەروەها ژمارەیەکی دیکەی تیغەکان، کە بە لێکخشاندنی کەم لێکجیادەکرێنەوە، هەروەها

* بونگەی فشەڵ (loosed sod): بریتییە لە چینی سەرەوەی خۆڵ.



ئەو کرۆکانەی، کە بەشێوەیەکی دەگمەن لە راستیدا بێوەشن (amorphous) بەلام ئەوانەی گەلێك زیاترن گاشە بەردی هەرەمی زبر و نارێك وپێکن، کە تەنها تەریبی لاوەکی وردی جێبڕینی بلەیدلیتیان هەیە.

هەروەها گاشەیەکی مشتومالکراو و پتەوکراویش دۆزرایەوە.

زۆرترینی ئەم جۆرانە و بەتایبەتیش چۆنیەتی و دروستکردنی بەئاگایانەی کارکردن لە رنەك و سمتۆکی دیاریکراودا، بریتین لە سازکاری زەرزی.

ئێستاشی لەگەڵدابێت، ئەم چۆنیەتیەو شێوەی تایبەتی رنەك و سمتۆکەکانیش لە بەردە پارچە پارچەکراوەکانی کەریم شەهر و مەلفەعات و گردی چایدا نادیارن. پارچە بەکارهێنراو و کەلبووەکانی هەریەك لە دوو تەقلیدەکە باون.

لەلایەکی تریشەوە، تورکاکا لەڕووی تیغی یەك لای قەبارەئاسایی و ئامرازی بەردی وردی ئەندازەیی (Geometric microlithic) وەك ئەوانەی لە زەرزیدا دۆزراونەتەوە، نەدارە.

هەرچۆنێك بێت، تیغۆکەی یەك لای بەردی وردی تورکاکا یا ئەوەتا پێشنیاری کەریم شەهر دەکەن یا پێشنیاری قۆناغێکی تەقلیدی (شارستانی) زەرزی دەکەن.

رنەکە جۆراوجۆرەکانی بەهۆی لێکخشاندنەوە (wear) دروستکراون وادەردەکەون شوێنی ئەسڵیان زیاتر لە کۆنتێکستی کەریم شەهردا بێت نەك کۆنتێکستێکی زەرزی.

بەملکەچبوون بۆ لێکۆڵینەوەی گەلێ: دوور و درێژتر، ئەوا کۆمەڵگەی تورکاکا یا پێشنیاری قۆناغێك دەکات دەکەوێتە نێوان زەرزی و ئەوانەی کەریم شەهر و مەلفەعات و گردی چای یا بەشێوەیەکی دیکە رەنگبێ تەنها شوێنێکی والآی سادەکراوی نوسخەیەکی وەرزی لایەنێکی تەقلیدی زەرزی پێشنیار بکات، هەروەك لە ئەشکەوتەکانی زەرزی و شانەدەر و پەلکەوەڕەو ئەشکەوتە کەمتر گرنگەکان و ئەو پەنگانەی پێشتر وەسفیان کرا، دۆزرانەوە.

لەم کاتەدا تاکە بنچینەکانی بەراوردکردن بنچینەی شێوەیی (morphological) و پەرەسەندنی جۆری کەل و پەلەکانن (Typology) ئەم بنچینانەش رەنگە تەواو ناقایلکەربن تاوەکو دەزاندرێ تورکاکا لە چەند شتێکدا خۆی نزیك دەکاتەوە بۆ ئەوەی بتوانرێ سندووقی ئامرازەکانی بە درێژی و لەڕووی بڕەوە لەگەڵ سندووقی ئامرازەکانی دیکەدا بەراورد بکرێت.





له كەوری خاندا بە دان پێدانانی هەموولایەك دەسكەوتێكی كەمی كەمتر لە ٥٠٠ پارچە بەردەستێی دروستكراو  یاخود بەكارهاتوو دۆزرانەوە.

دەسكەوتەكان ئەمانەیان تێدا بوو: رنەكی دەگمەنی سەرووكەورد (neat end) و برێكی زۆری سمتۆكی نایابی روون و بەرچاو، كە لە رووی شێوازی پەرەسەندنی چەشنی ئامرازەكانەوە (Typologically) تێكەڵ بە زنجیرەیەك (steep scapers) دەبن، هەروەها سمتۆكی فرە رووی دروستكراو لە رێگەی راستكردن و بادانەوە (straight and twisted) هەبوون.

ژمارەیەكی باشی هەریەك لە سەرە رنەكی قەبارە ئاسایی و بەهۆی بەكارهێنانەوە دروستكرابوون، هاوشان لەگەڵ ژمارەیەكی كەم قاونی (discoid) خراپی نارێك و پێك و رنەكی بچوك (یا شێوە نینۆك thumbnail) هەبوون.

كرۆكی گاشە هەرەمییەكان كەمیان جێبڕینی بلەیدلێتیان هەبوو لە چاویشدا لەگەڵ ئامرازی كرێت و نارێك و پێك تێكەڵاو بووبوون.

هەروەها هەندێك تیغۆكەی بەردی وردی دروستنەكراویش دەركەوتن.

كرۆكی ئامرازە وردەكان (microlithic) و تیغۆكەكان هەبوونی ژمارەیەكی زۆری گونجاو لە تیغۆكەی بەردی وردی پێشكەوتوو لە شوێنەكەیدا نەدۆزراونەتەوە.

هەروەها هێشتا قاونی بەوردی تیژكراوە و رنەكی شێوە نینۆكی پەنجە (یا بچوك) و تیغە یەكلایەكان، هەروەها ئامرازی وردی ئەندازەیش نادیارن.

ئەم سازكاریە بە سەرە رنەكی سافی بچووك و (steep scrapers) و سمتۆكی فرەڕوو هەروەها هێندێك تیغۆكەی بەردی ورد و كرۆكی تیغۆكەكانەوە پێشنیاری پشكێكی سندووقی ئامرازەكانی زەرزی دەكات.

سەرەڕای ئەوە كەموكورتییەكی سەر لەبەری چۆنیەتی لە كارامەیی پیشەكاردا هەیە، بەتایبەتیش ئەمە لە سەرە رنەكە زۆرباوەكان و ئامرازە شێوە نینۆكەكان و رنەكی قاونیدا دەردەكەوێت، كە بەرزۆری بەهۆی بەكارهێنانەوە دروستكراون، ئەوەش رەنگبێ هێڵی كەریم شەهر پێشنیار بكات.



لەلایەكی ترەوە، جەختكردنەوەی بەهێز لەسەر سمتۆكە فرەڕووەكان سازكاری زوینەتری برادۆستی دێنێتەوەیاد (بڕوانە ل.      ).

هۆكارێكی دیكەی سەرنج ڕاكێش ئەوەیە، كە بەپێچەوانەی خۆڵی زەردی پرتەقاڵی باوی ناوچەكە، توێكڵێكی دانەوێڵەی خۆڵەمێشی بە هێندێك دەستكردەكانەوە دەنوسێت. ئەم هۆكارە لەگەل دەركەوتنی كەمێك ئامرازی دیكەی پانكراوە (rolled)دا، پێشنیاری ئەوە دەكەن، كە رەنگبێ سەرچاوەیەكی نزیكی ئەم سازكارییە لەژێر هەلومەرجەكانی هاوشێوەی نیشتەجێبوونی بنكی رووبارەكە لە شوێنە زۆر كۆنترەكەی بەردە بەلكا، لە شوێنە ئەسڵەكەیدا (insitu) هەبووبێت (بڕوانە ل.      ).

سەرەڕای بێگومانی لە ناتەواوی كۆكراوەكانی رووی دەرەوە، زەحمەتە بە شێوەیەكی قایل كەرانە بڕیاربدرێت توركاكا و كەوری خان كتومت بۆ كوێ دەگەڕێنەوە.

هەردوو كۆمەڵگەكە تا ڕادەیەك لەڕووی پەرەسەندنی چەشنی كەل و پەلەكانەوە (Typology) هەریەك پێوەندی لەگەڵ ئەوەی تریاندا هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا كۆمەڵگەی كەوریخان وا دەردەكەوێ بەگشتی سەرەتایتر و هەژارتربێت هەروەها هێژ ئامرازی بەردی وردی تایبەتی نییە.

سمتۆكەكان بەتایبەتیش جۆرە جیاوازەكانی بادرا و راستكراوی فرەڕوو لە هەردوو شوێنەكەدا هەن، رنەكە سەختەكان و سەرە رنەكە باش دروستكراوەكان هەروەها سەرە رنەكە فرەكانی بەهۆی بەكارهێنانیشەوە دروستكراون لە هەردوو شوێنەكەدا دەردەكەوتن، تەڵەزمە كەڵبەوەكان و تەلەزمە كەم بەكارهاتووەكان هەروەها تیغەكانیش فرەن، هەروەها كرۆكی گاشە هەرەمییەكان لە هەردوو شوێنەكەدا باون.

هەر كۆمەڵگەیەك وا دەردەكەوێ لەووی تیغە یەكلا قەبارە ئاساییەكانەوە ئامرازی بەردی ورد (microlithis)ەوە نەداربێت.

تەنها لەرووی هەبوونی قاونی دیاریكراو و رنەكەكانی شێوەی نینۆكی پەنجە و بلەیدلیتی یەك لای دەگمەن لە توركاكادا وا دەردەكەون هێشتا تەنها دوو شوێنكە یەك لە یەكتری جیابكەنەوە.

هەرچۆنێك بێت، گەر گریمانبكەین، كە بەشێوەیەكی بنچینەیی هەردوو شوێنەكە وەك یەكن، (ئەوا) ئایا دەكرێ دەقاودەق وایان تێبڕوانرێت كە گوزارشت سادەكراوی بەر ئەگەری تەقلیدی زەرزی لە ئەشكەوتەكاندا دەكەن؟ ایا هەردوو شوێنەكە جۆراوجۆری تایبەتییەكی چەند





جۆراوجۆرێکن تاوەکو وەك ئەوەی لەسەر یەك رووتەخت سەریان بکرێت تا رادەیەکیش هاوچەرخی ئەشکەوت و شوێنە والاکان دەربخەن؟ یاخود ئایا هەردوو شوێنەکە قۆناغێکی جیاواز لە ریزبەندیەکی پەرەسەندنی نێوان زەرزی و کەریم شەهردا دادەنێین؟ هێژ تاکە پێناوی مێژوانمان بریتییە لە بەراوردکردنی تەکنۆ تیپۆلۆژی و شێوەیی (morphologjcal)، لەسەر ئەو بنچینەیەش کێشی بەڵگەکە وادەردەکەوێ پشتگیری خستنە ریزی دووشوێنەکە بکات لەگەڵ هێڵی گشتێندراوی زەرزیدا.

بەر لەوەی بگەینە وێنەیەکی جێگای متمانە رەوشتەکە لەم سەردەمەی پێش مێژوودا زانیاری زیاتر لەبارەی سازکاری بەردین لە ئەشکەوتەکاندا و شوێنە سەربارەکییە والاکاندا پێویست دەبێت.

هەروەها هەمیشە یەکێك لەپێناو فرەیی بەڵگەکانی گیانەوەران و جیۆلۆجی و زانیارییە راشکاوەکانی چین ناسی هەروەها رەنگە لە سوستەکانی تیشکی کاربۆن چواردەش، هیوای هەبێت.

مەتریاڵەکەمان لە مەلفەعاتەوە بەرەودوا (واتە پێش مەلفەعات) بەتایبەتیش ئەو مەتریالانەی لە تورکاکا و کەوری خاندا دۆزراونەتەوە، رەنگە تیل نیشانی رێگەیەکی ژیان بکەن (لە ماوەیەکی هێژ نادیاردا)، کە تێیدا هەریەك لە ئەشکەوتەکان و شوێنە والاکان بۆ ماوەیەکی لەچاو دوور و درێژی نیشتەجێبوون بەکارهێندراون.

بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا، ئەم نشینگە نۆرەبرانە (بەدوای یەکدا هاتوو) رەنگبێ لە چوارچێوەی وەرزێکدا بووبن، هەروەها رەنگە سندووقی ئامرازەکانیش بۆ چالاکییەکانی کەش و هەوایەکی خۆش وەك هەمان ئەوانەی بۆ چالاکییەکانی کەش و هەوایەکی ناخۆش بەکاردەبرێن، بووبن.

ئەو بیروباوەڕە باوەی، کە مرۆڤەکانی چاخی بەردی کۆن "هەمیشە لە ئەشکەوتەکاندا ژیاون و لە راستیشدا نیشتەجێبوونی ئەشکەوت بوونە" بەشێوەیەکی بەدەر لەگومان لە هەرێمی کلاسیکی پێش مێژووی رۆژئاوای ئەوروپاوە سەرهەڵدەدات، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرترینی مێژووناسانی پیشەکاری پێش مێژوو دوای سەرەتای ساڵی ١٩٣٠ تێگەیشتن، کە مرۆڤی ئاخیر و ئۆخری چەرخی پلایستۆسین لە رووبەرە فراوانەکانی ناوەڕاست و رۆژهەلاتی ئەوروپا لە شوێنە والاکاندا نیشتەجێ بووە، هەروەها لەوەش تێگەیشتن بۆچی چایلد (١٩٥٠) بە شێوەیەکی پاساودەر گوتارێك بەنێو و نیشانی "رۆندراوەکانی مرۆڤی ئەشکەوت"ەوە نێو دەنێت.





گریمانی تەقلیدی گۆڕانێکی کتوپڕ لە باشووری رۆژئاوای ئاسیادا لە نیشتەجێبوونی ئەشکەوتەوە بۆ بەکارهێنانی شوێنە والاکان بیروباوەڕە باوەکە دەهێڵێتەوە، گواستنەوەش لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە {یا لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە (change- over) گریماندەکرێ کەمتر یا زۆرتر هاوزەمان لەگەڵ گواستنەوە بۆ خۆراك بەرهەمهێنان.

مێژووناسانی {تایبەت بە} مێژوو گرنگی بە شوێنەوارناسی سەردەمەکانی ئاخیر و ئۆخری چەرخی پلایستۆسین لە ئەشکەوتەکاندا، یا لەپێناو سەردەمە زووترکانی پلایستۆسیندا دەدەن، کە بۆ گەڕان بەدوای شوێنەکانیان بەکاریدەهێنن، لەماوەی کورتەوارەکان (Transient sites) لەنێو کۆنتێکستە جیۆلۆجیە فراوانەکانی شەقڵە سروشتییەکان لە شوێنەوالاکاندا.

شوێنەوارناسانی پسپۆڕ لە ئاخیر و ئۆخرترین (دوای پلایستۆسین) کایەکانی پێش یا کۆنترین کایەکانی پێش مێژووی سەردەم تەنها لە شوێنە والا بەردەوامەکان تێدەگەن.

لەم خاڵەی ریزبەندی ئێستاکەماندا وا دەردەکەوێ بەلایەنی کەمەوە لە کوردستانی عێراقدا شوێنەوارەکانی شیاوی لایەنەکانی بە یەکدی گۆڕینەوەی هەمان تەقلیدی سازکاری گشتی لە هەریەك لە ئەشکەوت و شوێنە والاکاندا ببینین.

هێژ بەڵگەکان لە هەریەك لە ئەشکەوت و شوێنە والاکاندا زۆر ناتەواو و زۆر نایەکلایی کەرەوەن، تاوەکو رێگەمان بدەن کوردستانی عێراق لە ریزبەندییەکی روون و قایلکەردا رێکبخەین.

هەرچۆنێك بێت، بە پێویستی نازانین لەهیچ رێکخستنێکی کرۆنۆلۆژی شیاودا هەموو ئەو مەتریالانەی لە نشینگەی ئەشکەوتەکاندا دۆزراونەتەوە بە کۆنتریان دابنێین لە هەموو ئەو مەتریالانەی لە شوێنە والاکاندا دۆزراونەتەوە.

پرسی سەرەکیمان سەرنجدانمان لەسەر گۆشە نیگایەکی نێوان پەرگەکان (middle ground)* دا دەسەپێنێ، کە دەکەوێتە نیوان فۆسی تەقلیدی سەرنجی تەقلیدە کۆنترەکانی زانایانە لە پێش مێژوودا لە بەرامبەر شوێنەوارناسی مێژووییدا" بەشێوەیەکی تەقلیدی پێچەوانەی ئەوەیە، کە پەیوەندە بە نیشتەجێبوانی ئەشکەوت لە بەرامبەر دانیشتوانی گوند یا دانیشتوانی شارۆچکەکاندا.

* گۆشەنیگای نێوان پەڕگەکان (middle ground):بریتییە لە تیڕوانینێك لەنێوان قایلبون و چەسپاندندا، یا تیڕوانینیێ: لە نێوان بیرۆکەیەکی ئەکادیمی گرووپێکی ناتەقلیدیدا (avant- garde).

بەڵام ئارەزوو بە ئاراستەی ژیانێکی بەردەوامتر لە شوێنە والاکاندا رەنگە لە ساتە گەلێك درەنگەکانی پلایستۆسیندا (دەزانین لە هەندێك ناوچەدا ئەوە کراوە) دەستپێکردبێت، یا زۆرتر پێدەچێ جۆرێك لە ژیانی شوێنە والاکان هەمیشە هەبووبێت.

دەکرێ وا لە ئارەزووی روون و بەرچاو رابیبنرێت کاتێك دەستپێکردووە، کە شارستانییەکان بە سەربەستی هاتووچۆیان کردووە و بە شێوەیەکی سەرەکی پشتیان بە سەرچاوەکانی رۆژی سروشتی بەستووە، هەروەها کاتێك دەستی پێکردووە، کە ئەو شارستانیانە هۆ و پێناوەکانی دەستکردی تایبەتییان لە پێناو بەرهەمهێنانی سەرچاوەکانی رۆزیدا پەرەپێداوە.

پێشکەوتنی ئەم ئارەزووەش ئەو گۆڕانکاری و بەرپرسیارەتییانەیان سەپاندووە، کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ لە نموونەی (شێوەی) نشینگەکان و کەتەلۆکی کەل و پەلە دەستکردەکاندا رەنگی داوەتەوە، گومانیشی تێدانییە تاوەکو سەردەمەکانی چەرمۆ نشینگەیەکی جێگیری تەواوی ساڵ* (Year- round) لە شوێنێکدا هەبووە.

بەڵام ئایا لە چ خاڵێکی تۆماری شوێنەواریدا یەکەم جار ئارەزووەکە بە ئاراستەی نشینگەی جێگیر دەبینین، کەلە کورتەواری ژیانی خۆراك کۆکەرەوەکان لە شوێنە والاکاندا جیاواز بووە؟ بەڵگەکانمان بە زەحمەت رێگامان دەدەن ئەو خاڵە دیاری بکەین. شتێکی گرنگ ئێستاکە ئەوەیە، کە بە شێوەیەکی راشکاوانەتر نەك شاراوە رووبەڕووی پرسەکە دەبێتەوە لەژێر سادەگەرییەکی ئاسایی جیاواز لە دانیشتوانی ئەشکەوت لە بەرامبەر دانیشتوانی گوند دا.

لەچاك بەختیدا، بە شێوەیەکی راشکاوانە بۆ رووبەڕووبونەوەی پرسەکە (issue) لەلایەکی دیکەی ناوچەی رەخنەگردەلانییەکاندا بەڵگەکان دەست بە دەرکەوتن دەکەن، کە دەرکەوتنی شوێنە والاکانی (شێوەی) نەتووفی لە ئەریحا و مەلاحە، هەروەها نەحل عۆرێنیشدا فەراهەمبوون.

* نشینگەی تەواوی ساڵ (year- round): بەو جۆرە نشینگەیە دەگوترێ چوار وەرزی ساڵ لە شوێنێکدا بمێنێتەوە و وەرزانە جێگۆڕکێ نەکات.



## ئەشکەوتی پەلگەوەڕە

ئاسۆی سازکاری دواترمان بە شێوەیەکی تەواو و بەربلاو لە ئەشکەوت و پەناگەکانی ئەم هەرێمەدا دۆزرایەوە و بە شێوەیەکی روون و ئاشکراش بریتییە لە دوا دەرکەوتنی تەواوانەی چەرخی بەردین لەبارەی هەر گرنگییەك لە ئەشکەوت و پەناگەکاندا. ئاخۆ ئەو ئاسۆیە بە تەواوی لەپێش ئەو ئاسۆ شوێنەوارییەوەیە، کە چەند ناوچەیەکی والای پێشتر نێویان بنرا گوزارشتیان لێوەیکرد، ئەوا بریتییە لە پرسێك، کە کتومت تیل نیشانمان کردووە و رەنگە بگەڕێینەوە سەریشی.

ئەو ئاسۆیە بریتییە لە تەقلیدی دروستکردنی- بەردینی جیاواز، رەنگە کتومتیش بە "تەقلیدی زەرزی"نێوبرێت، دوای ئەوەی کە شوێنی ئەشکەوتەکە قۆناغێکی کۆنتر و نوێتری لەسەر یەکتری ئامرازی بەردینی وردی تایبەتی ئەم سازکارییە هەمیشە بچووکی بەردەستێی بۆ یەکەم جار تێدا هەڵکۆڵدرا (Garrod, 1930, PP. 1-23; 1957, PP. 44-46)

ئەم ئاسۆیە لە سەرتاسەری زەرزیدا بە تیغی یەك لاو بلەیدلیتی جۆراوجۆر، و (Single-shouldered points)ی زۆر دەگمەن، و گەلێك تیغی کەلبوو، و سمتۆکی وردی جۆراوجۆر، و سەرە رنەك و رنەکی خڕ، و هەریەك لە قەبارەی ئامرازی ئاسایی و ورد (microlithic)، هەروەها بەزیاد بوونی ئامرازی وردی ئەندازەیی بە تایبەتیش سێگۆشە و کەوانەییەکان لە قۆناغی دواتر (نوێتر)دا، تایبەت دەکرێت.

هاو (Howe) لە ئەشکەوتی پەلگەوەڕدا، کە لە تەلانەکانی باشووری بەرانان داغەوە بەسەر دۆڵی بازیاندا دەڕوانێت، کۆمەڵە مەتریالێکی دەرهێنا (هەڵکۆڵی) سوستەیەکی نایابی ئەوەی رەنگە تایبەت بێت بە ئاخیر و ئۆخری قۆناغی زەرزییان تێدابوو، ئەم مەتریالانەش بەشێوەیەکی بەتین بە ئامرازی وردی ئەندازەیی (geometric microliths) جیادەکرانەوە، (Bradwood, 1951c, PP. 13-14; 1952a, PP. 23-24, 26-27).

بە شێوەیەکی کردەیی لە ماوەی دوو هەڵمەتی ساڵی ١٩٥١ و ١٩٥٥دا تەواوی نیشتەی ناو ژوورە بچوکەکە رامالدرا، بەڵام نیشتەی سەکۆی دەروازەکە و پشتەوە دەستی لێنەدرا.

ڕووبەرێکی نزیکەی سی مەتر چوارگۆشە بە قووڵیەك لە چەند سەنتیمترێکی کەمەوە لە دیوارەکەدا بۆ نزیکەی دوو مەتر لە شوێنێکی نزیك ئاستانەکە (threshold)دا تاوەکو چینە بەردی ژێر زەوی (رەوەز) (bedrock) هەڵکەندرا.

کارەکە دوو کۆمەڵی گەورەی مەتریالی شوێنەواری دەرخست، کە تاڕادەیەك لەنێو دوو ئاسۆی نشینەیی بەسەر یەکدا کەوتووی جیاوازدا کەلەکە بووبوون.





ئەم دوو کۆمەلە مەتریالانە بەهۆی شڵەژانی ژیانی ئەشکەوتەکە و جووڵانی دەستکردەکان (artifacts) بەنێو نیشتەیەکی تا ڕادەیەك شلوشۆق و نیشتەی بەردیدا بە شێوەیەکی زۆر تێکەڵبوون.

بەشی سەرەوەتر و دواتری هەردوو ئاسۆ گەورەکە بە شێوەیەکی سەرەکی ئوور و نەینەوا پێنجی (V) دەگرتەوە و مەتریاڵەکانی دواتریش پارچەکانی دەفرێکی شوشەکراوی* چەرخی ئیسلامیان لەنێو خۆ دەگرت.

وا دەردەکەوت ئەوانە لە قووڵییەکی (40-0) سەنتیمەتردا چڕبینەوە، بەڵام لەژێر ئەمەدا لە شوێنە گونجاوەکاندا دۆزرانەوە.

گۆڕی زۆر شڵەژاو و ئێسقانی پەرشوبڵاو بووی مرۆڤی پارچە پارچە لە نێوان ١٥سم بۆ نزیکەی ٦٠سم دۆزرانەوە.

ئەم گۆڕ و ئێسقانانە رەنگە یا ئەوەتا لەگەڵ قەبارەی گلێنەکانی کۆنتری ئاسۆی سەرەوەتردا هاوچەرخبن یا پتر پێدەچێ هی کاتێکی نوێتربن.

جگە لە چاڵە خۆڵەمێشە تاڕادەیەك قووڵترەکان، کە لەچەند بارێکدا بەنێو گۆڕەکاندا لێدراون، ئەوا دەکرێ وا دابنرێ ئەم چینە ئەوپەڕی ئەستووریەکەی (٦٠سم)ە.

لە دەوروبەری چینی سەرەوەتردا ژمارەیەکی کەم ئامرازی دەستکردی بەردینی جیاواز هەبوون، کە ئەو مەتریاڵانە پێشنیار دەکەن پێشتر لە هەریەك لە کەریم شەهر و چەرمۆ و شوێنەکانی دیکەدا لە بواری (هێڵی) خۆیاندا تێبینی کراون.

ئەمانە ژمارەیەکی کەمی ئەم ئامرازانە بوون: پێچ و مۆرەی جووت لا (double- backed)ی بلەیدلیتی بەردی ورد، و ئامرازی دەستکردی دیاریکراوی ئۆبزیدی، و پارچە بازنەی مەڕمەڕی مشتومالکراو و داتاشراو و کوتەکە بەرد (hammer stone)، و ئاونگی کەڤەری پارچە پارچە، هەروەها بیۆری بەردی مشتومالکراو و پارچەکراوی پارچەیی.

چینی خوارەوەتر و کۆنتری ئاسۆی گەورە لە قووڵییەکی ٦٠-١٣٠سم دا بوو.

هەروەها ژمارەیەکی زۆری مەتریاڵەکانی زەرزی خستە بەردەست، کە بەدەر لە پەلەبەردەکان (debris) زیاتر لە ٤,٠٠٠ ئامرازی دەستکرد دەبوو.

هەروەك لە خودی زەرزی و شوێنەزاندراوەکانی تری ئەم ئاسۆیەدا، سازکاری بەردەستێ بە شێوەیەکی گشتی لە پەلگەوەڕەدا بەهۆی ئەم ئامرازانەی خوارەوە جیا دەکرایەوە: ژمارەیەکی

* شوشەکراو (glazed): لووسکردنی رووی دەرەوەی دەفروچتی ترە بە چینێکی تەنك (film) شوشە یا وەك مشتومالدەکرێ.



زۆری تیغە یەك لا و بلەیدلیتەکانی بەردی ورد (p1. 24, toprow)، و سەرە ڕنەکی جۆراوجۆر و خڕ و ڕنەکی دیکە (P1. 24,3d row) چ گەورەبن چ بچووك، هەروەها ژمارەیەکی کەمتری ڕنەکە یەك لا کرێتەکان، و سمتۆکی فرەڕوو، و سادە و سێگۆشە، و پێچ و مۆرەی جۆراو جۆر دروستکەرەکان (fabricators)، هەروەها سمتۆکە بچووکەکان (microburins) و پۆلینێکی شێوەکانی ئامرازی وردی ئەندازەیی، کە سێگۆشەکان و لەبزینەکان و کەوانەی دەگمەن، هەروەها لاکێشە دەگمەنەکانیش. لەسەر هەندێك لە لەبزینەکان بەشێوەیەکی نیشانەدار سووچەکان؟ (converging ends) روچاڵن.

ژمارەیکی زۆری تیغە کەلبووەکان و تیغەکانی بە شێوەی دیکە بەکارهاتوو هەروەها تەڵەزمیش دۆزرانەوە.

کرۆکە گاشەکان بە چەشنێکی ِوون و ئاشکرا جۆرە جیاوازەکانی تیغی فرەڕوو و تەڵەزمی جێبڕین لەسەر (scarred) (P1. 24 bottom row) هەروەها ژمارەیکی گۆنا تەواوە بێشێوەکان (amorphous) دەگرنەوە.

هەروەها ئامرازی ئێسقانی سادەی تیژکراو و مورو و گواشۆرەکانی قەپێلکە شەیتانۆکە و مکارەیەکی ددان و ئێسقان، یا بەردیش دەرکەوتن.

بێورێکی گەورەی مشتومالکراو و پارچە پارچە بوو (کە پێشتر باسکرا) لە قوولی ٨٠-١٠٠سم-دا دۆزرایەوە، پارچە دەستاڕێکیش لەژێر ١٠٠مەتردا دۆزرایەوە، هەروەها شوێنەواری پەرش و بڵاو، بەڵام دیاریکراوی پەلە بەردی ئۆبزیدی و ئامرازە جیاوازەکان یا ئەوەتا کۆمەڵە شڵەژانێك پێشنیار دەکەن یاخود قۆناغێکی زۆر درەنگ ساتی زەرزی پێشنیار دەکەن.

بەڵام سواڵەتە جاربەجار سادە بچووکەکان یا رەنگکراوە بە چەرخەی گڵکار دروستکراوەکان، کە بەشێوەیەکی دیار و بەرچاو لە چینی سەرەوەترەوە خزاون- شڵەژاوی لە سەرتاسەری ئەم ئاسۆیەدا پێشنیار دەکەن.

هەرچۆنێك بێت، ئامرازە ئۆبزیدەکان ئەمانە دەگرنەوە:

تیغێکی یەکلای کورت و ئەستوور (stubby backed blade)، و ڕنەکێکی نینۆکی پەنجە و ئامرازە ورد ئەندازەییەکان و ئامرازە وردەکان، هەروەها تیغە کەلبوەکان.

ئەم جۆرانە لە چاودا ئاڵۆزییەکی ئەو شێوە بەردەستێیانە ڕەنگدەدەنەوە، کە لە هەمان قووڵییەکاندا هەن، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی نوسخەکانی ئۆبزیدیلە سەروتری یا هەر کتومت لەسەر قەبارەی سەرەکی مەتریاڵەکانی زەرزی دۆزرانەوە.





ئێسقانی گیانەوەران بەچەند برێك باش پارێزرابوون.

بە گوێرەی کورتە لێکۆڵینەوەی رید ئێسقانەکان ئەم جۆرانەی خوارەوە دەگرنەوە:

١- جۆرێکی ئەسپ شێوە (equid) (ڕەنگە Equus hemionus، کەرەکێوی بێت، کە باوترینی سمدارەکانە (ungulates)).

٢- شۆر (Gazella subgutterosa).

٣- بزنە کێوی (capra hircus aegagrus).

٤- پێدەچێ مەڕەکێوی (ovis orientalis).

٥- جۆرێکی گەورەی خێزانی کاوێژکەرەکان (مانگای large bovid) (پێدەچێ Bos primigenius بێت، بەڵکو ڕەنگە Bisonبێت)[٨].

٦- ئاسکی سوور (cervus elaphus).

٧- ئاسکی ڕوو (capreolus capreolus).

٨- بەراز (sus scrofa attila).

٩- گورگ (canis lupus).

١٠- ڕێوی (vulpes vulpes).

١١- پشیلەیەکی قەبارە مامناوەندی، زۆر پێدەچێ ورشەك* (lynx) بێت.

١٢- ژیشك (Hedgehog) نەناسراوە بەڵام زۆر پێدەچێ (Erinaceus europaeus) بێت.

١٣- ژمارەیەکی زۆر کرێتێنەرە بچووکە نەناسراوەکان.

١٤- ژمارەیەکی زۆری باڵندە بچووکە نەناسراوەکان.

١٥- کیسەڵ (Tetudo graeca).

١٦- Toad پێدەچێ (Bufo viridis) بێت.

١٧- ماسیەکی نەناسراو.

---

(٨) نیوئەوەندەی گەورەیی مانگایەکی هەرفۆردە و زۆریش لە بایسۆنێکی نێرینەی ئەمریکی گەورەترە، ئەم مانگا شێوەی چەرمۆ (بڕوانە ل. ) وادیارە زۆر لە مانگا شێوە کۆنترەکەی پەلگەوەڕە بچووکتربێت.

* ورشەك (lynx): وشەك، وەرشاق، جۆرە پشیلەیەکی کلك کورتی کێوییە، کەوڵی نەرم و زۆر بەنرخە.



بکوێرت ئەم گیانەوەرانەی ناسییەوە: قرژاڵی ڕووباری (potamon potamios)، کلامی ڕووباری (unio tigrides)، هەروەها هێلکە شەیتانۆکەی وشکانی (Helix salomonica).

رید (Reed) بە نامۆی دەزانی، کە ئەگەرچی ئێسقانی چوارپێو و مەڕ یا بزن لە پەلگەوەڕەدا گەلێك زۆربوون، بەڵام پاشماوەیەکی کرۆکی شاخی گیانەوەران نەدۆزرایەوە.

ڕەنگە ئەمەش یا بەهۆی ڕێکەوتێکەوە بێت یا بەهۆی چەند بەکارهێنانێکی ئێسقانەکانەوە بێت لەلایەن مرۆڤەوە.

هەڵبێك هێژ سوستە ڕووەکییەکانی لە پەلگەوەڕە دۆزراونەتەوە نەتوێژیوەتەوە، بەڵام باگهون چواردە سوستەی خەڵوزی ناسیوەتەوە.

یازدەیان داری بەڕوو بوون، و یەکێکیان دارگەزبوو (کە دارێکە گەورەیە)، و یەکێکیان ئەسپێندار (poplar)بوو (زۆر پێدەچێ (populus euphratica) بێت) هەروەها یەکێکیان جۆرە کاژێك (conifer) بوو (پێدەچێ Juniperus بێت).

وادیارە ئەم سوستانە پێشنیاری کەش و هەوایەکی کەم شێدار (sub humid) و نیمچە وشك (semiarid) بکەن، کە پێدەچێ زۆر لە کەش و هەوای ئێستاکە جیاواز نەبێت.

چینی نیشتەجێبوونی زەرزی لە پەلگەوەڕەدا یەکەیەکی تەنهایە و سوستەی زۆریشی خستە بەردەست.

بەچاوپۆشین لەو پارچە جۆراوجۆرانەی جێگەی مشتومڕن، بێگومان ئەم ئاسۆیە بەهۆی ئەو شێوە ئەندازەییە جۆراو جۆرانەی لە سەرتاسەری درێژبوونەوەی ئاسۆکەدا بڵاو دەبنەوە، درەنگ وەختە (latte).

باری کرۆنۆلۆژی ئەم ئاسۆیە بەندیوارە بە کۆمەڵگەکانی ئاخیر و ئۆخری (تەقلیدی) زەرزی و ئامرازی وردی ئەندازەییان هەیە، هێشتا بە تەواوی پرسێکی گفتوگۆ لەسەر کردنی پەرەسەندنی چەشنی ئامرازەکان (Typological) و شێوەی (morphological)یە.

زیادبوونی شێوە ئەندازەییەکان، کەهێندێکیان شێوەی زێدەڕۆیان هەیە، و هەبوونی کۆمەڵە تیغێکی تارادەیەك سەرەتایی زیاتر بە لێکخشاندن (wear) جیا دەکرێنەوە نەك تیژکردنەوە، هەروەها بە شێوەیەکی ڕوون و بەرچاو زیادبوونی کرۆکی تیغە هەڕەمییەکان لەسەر کرۆکە بێ شێوەکان (amorphous) ڕەنگە ئاماژە بە قۆناغێکی درەنگتر لە قۆناغی شوێنەکانی تەقلیدی زەرزی بکەن، کە ئەم تایبەتمەندییەیان تێدا تێبینی نەکراوە. بەلایەنی کەمەوە ئەم ئامرازانە ئاماژە بە جیاوازییەك دەکەن، هەروەها ئەو ئامرازانە لە ئاراستەی ئەو چەشنەن، کە لە چەرمۆ و کەریم شەهردا دۆزراونەتەوە.





## ئەشکەوت باراك و ئەشکەوت حاجیە و
## ئەشکەوت بابخەل هەروەها ئاسۆی زەرزی

جگە لە پەڵگەوەرە، بە شێوەیەکی سەرەکی شوێنەواری ناقایلکەرانەی ئاسۆی گشتێندراوی زەرزیان دۆزییەوە. ئەم شوێنەوارانە لە هەڵکۆڵینە ئەزموونییەکانی هەریەك لە پەناگەکانی باراك و حاجیە بە درێژایی زنجیرەی بەرەن داغ لە نێوان ئاکرێ و زێی گەورەدا (Braid wood et al: 1954, pp 124-26, 130-31) هەروەها لە بابخەلیشدا، کە نزیکی رواندوزە، زیادیانکرد (ibid. pp. 127-28).

لەهەر شوێنێکدا دوو چاڵی ئەزموونی زیاتر، رووبەری گشتی نێوان ٢٠-٣٠ مەتری چوارگۆشەیان هەڵدایەوە و گەیەندرانە خۆلی پاك یا چینەبەردی ژێر زەوی لە قووڵی گەلێکدا هەمیشە لە چەند سەنتیمەترێکی کەمەوە دەگەیشتنە نزیکەی ١,٥٠ مەتر.

لە ئەشکەوتی باراکدا پشکەکانی کەڵەکەیەکی زەرزی، کە بە ئەستەم ١٠٠ ئامرازی لەنیو خۆ دەگرت، وا دەردەکەوت تارادەیەك لە دەرەوەی لە شوێنی ئەسڵی خۆیدا بێت، بەڵام جگە لە پاشماوە بە یەکەوە نووساوەکانی دیواری چینی باڵا، تەواوی نیشتە کۆنەکان بە رێگەیەك لە نیوەڕا ڕامالدران.

بە دڵنیاییەوە لە حاجییەدا بەردەمی ژوورەکە لە رووی هەر نشینەیەکی کۆنەوە نەداربوو، هەروەها کەمتر لە ٢٠٠ مەتریاڵی دروستکراوی زەرزی، جگە لە پارچە بەردەکان تەنها لەسەر کەلەکی تەلانەکەدا دۆزرانەوە، کە تێیدا دەرکەوت بەزۆری ئەو مەتریاڵانە شڵەژاون و لەگەڵ گلێنەی دواتردا تیکەڵاوبوونەوە.

لە بابخەلدا، کە پەناگەیەکی تارادەیەك واڵایە لە بەرامبەر بنکی کەندێکدا (بڕوانە ل.        ) شوێنەوارە نایەکلایکەرەوەکانی زەرزی گشتێندراو، کە بەگشتی نزیکەی ٢٥٠ پارچەی دروستکراو دەبون، دەکەونە چینێکی تەنك و تویژاڵێکی تارادەیەك شڵەژاوی مەتریاڵەکان لە نزیك یا لەنێو ئەو ڕووە عەرزەی لەسەر نیشتەیەکی موستێریانە (بڕوانە دواتر).

هۆکاری شیاوی هەلومەرجی شڵەژاوی و ڕامالینەکەش لەم سێ شوێنەدا لەلاپەڕە ٣٠دا تێبینی دەکرێت.

سەرباری ئەم سێ سوستانە کە من لە شوێنەکانی شڵەژاودا دۆزراونەتەوە، ئەوا شایانی تێبینی کردنە، کە هەریەك لەم سێ شوێنە بە شێوەیەکی سەرەکی (for the most part) نەك هەروەك



لەڕووی ئامرازی بەردی وردی ئەندازەییەوە نەدارن بەڵکو هەروەها لەڕووی تیغی یەك لای ئاسایی و بڕی پارچە کەلبوەکانیشەوە نەدارن.

ئەوانیش بە شێوەیەکی سادە و ساکار بەمانە جیادەکرێنەوە:

نەخشکێشی جودا جودا و رنەکەکان و ئامرازی تیغۆکەی بەردی ورد هەروەها کرۆکی ئاساییەکان.

کەوابوو، ئەو شوێنانە لەسەر بنەما مۆرفۆلۆژییەکان بەتەواوی رەنگە قۆناغێکی جیاوازی زەرزی گوزارشت بکەن لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ئەگەر گەراییە (possibility) پێویستی بە چەسپاندنی سوستنە وەرگرتنی باشتر و پێوەندییە ستراتیگرافییە تەواندەکان دەبێت.

سەرەڕای ئەوە ئەم سێ سوستە تاسەرەکییەی قۆناغێکی گشتێندراوی بەر ئەگەری زەرزی لە ئەشکەوت و پەناگەکاندا تارادەیەکی جێی سەرنج لەو کۆکراوانە دەچن، کە لە شوێنە واڵاکانی تورکاکا و کەوری خاندا دۆزراونەتەوە (بڕوانە پێشتر).

بەهۆی سوستە وەرگرتنی فراوانی سولیکی لەبارەی قۆناغی زەرزی لە چینی B ئەشکەوتی شانەدەردا (Solecki, 1955 and 1957) کەتەلۆگی دەرکەوتنەکان سەبارەت بەم سازکاریە تەواوە.

لەژێر قۆناغی زەرزی چینی B شانەدەردا، کە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا لە کاتێکی دیاریکراودا لەو جیابۆتەوە (بڕوانە ل. ١٥٤) سازکاری برادۆستی چینی c هەیە (ibid). ئەم سازکارییەی ئامرازی تیغی چاخی بەردی کۆنی سەرو* هێژ تەنها لەم شوێنەدا دۆزراوەتەوە.

* چاخی بەردی کۆنی سەرو (upper palaeolithic): بریتییە لە دوابشی چاخی بەردی کۆن.





# ئەشکەوتی بابخەل و ئەشکەوتی سپیلك
# هەروەها ئاسۆی زەرزی

لەڕووی تەکنیکییەوە لە هەریەکێك لە ئەشکەوتەکانی بابخەل و سپیلکدا نیشتەگەلێکی پێشکەوتووتری موستێریان تۆمارکرد ( Braidwood et al, 1954, pp. 127-28: Braidwood, 1956 b).

دوای ئەوەی ئەم ئاسۆی سازکارییە پێشتر لە هەندێك ئەشکەوت و پەناگەی دیکە لە عێراق و ئێرانی دراوسێدا ناسرا، ئەوا هەڵکۆڵینە ئەزموونییەکانمان تەنها چەسپێنەربوون دۆزینەکارییەکانمان لە قەبارەدا بچوکبوون.

لە بابخەڵدا, دوو چاڵی ئەزموونی رووبەری گشتی نزیکەی ٢٠ مەتری چوارگۆشەیان هەڵدایەوە و گەیەندرانە قووڵی گەلێك لە چەند سەنتیمەترێکی کەمەوە دەگەیشتنە ئەو پەڕی ١,٤٠مەترێك.

ئاسۆی موستێری زۆرینەی نیشتە هەڵکۆڵدراوەکەی تا چینی ژێرەوەی زەرزی دابوو، کە پێشتر تێبینی کرا.

لە سپیلکیشدا، هەڵکۆڵینی خێرایی ئەزموونی لە رووبەری ٢,٥٠ مەتری چوارگۆشەدا نەدەگەیشتنە چینی بەردی ژێر زەوی، ولیَ لەژێر نیشتەنوێکاندا لە قولاَیی ٢ تا ٣ مەتر کەل و پەلی (occupation) موتێری دەرخست، کە لەژێر ئەویشدا کاتمان نەبوو (شت) بدۆزینەوە.

لە بابخەڵدا، ئەو شوێنەی کە پشکی شڵەژاوی ئەم ئاسۆیە ١٥٠ ئامرازێکی دستکردی خستە بەردەست، جگە لە پەلە بەردەکان (debris)، سازکارییەکە بەنووکی سێگۆشەی لەسەر تەڵەزم و تیغە تەڵەزمەکان جیا دەکرایەوە، کە لەڕووی قەبارەوە لە قەبارەی مام ناوەندییەوە دەگەیشتنە قەبارەی زۆر بچووك (p1. 25 Toprow).

هێندێك لە نووکەکان درێژ کرابوونەوە و باریککرابوونەوە بۆ شێوەکانی (proportions) وەك پێچ و مۆرە (bril).





ژمارەیەکی زۆری لا ڕنەکەکان (p1. 25, middle row) و ژمارەیەکی کەمی نەخشکێشەکان هەروەها تەڵەزمی جۆراوجۆری بەکارهاتووش دەرکەوتن.

تیژکردنەوە تەخت و تەنها خۆ تێکوتە شێوە مامناوەندییەکان وربوون و بەزۆریش بچووکبوون.

کرۆکە مامناوەندییەکان تا بچووکەکان (p1. 25, bottom row) بەشێوەیەکی سەرەکی قاونی (discoid) بوون, جگە لەوەی چەند دانەیەکی کەمی تاڕادەیەك گۆییان تێدابوو.

ڕەنگە بەردە بەستە هەڵبژێراوەکان سەرچاوەی سەرەکی ئەم ئامرازە دەستکردانە بووبن.

بە بڕیاردان لە کرۆکە بچووك و تەنها جاربەجار دیاریکراوەکان (diagnostic)، بڕی مەتریاڵە دەرهێنراوەکان لە سپیلکدا، هەمان ئاسۆی موستێری لەوێدا دەگمەنن و خراپیش بە ئاووهەوا کاریان تێکراوە، بەڵام لە سپیلکدا گەلێك فرە و باش پارێزراوبوون، هەروەها هیوای زانیاری دروستەنی (data) هەیە کاتێك توێژینەوەکان تەواو بن.

هەرچەندە لە نموونەی شوێنەکانی وەك هەزار مێرد (Garrod, 1930) و ئەشکەوتی شانەدەر و چینی (Solecki, 1955 and 1957)دا، نەخشکیش و تیغە تەڵەزم لەم سوستانەدا دەرکەوتن، وەڵی لەم ساتەدا بەڵگەیەکی قایلکەر نییە، کە تەقلیدی ئامرازی تیغ نەبادا (ascuch) تاوەکو ئەم سەردەمە لە کوردستانی عێراقدا خۆی دەرەخسێنێت.

## جەمسەری تەلەگراف ٢٢/٢٦ و سەراندور

لەم رووبەرەی گردە بنارییەکاندا، ئەگەر گەرایی ئاسۆیەکی موستێری لەچاو سادەی گشتێندراو هەیە، کە هێشتا لەڕووی کرۆنۆلۆژی و ستراتیگرافییەوە نەچەسپاوە. بەڵگە تەکنۆ-تیپۆلۆژییەکان (پەرەسەندنی چەشنی هونەری ئامرازەکان) بەزۆری پێشنیاری ئەوە دەکەن، کە کەم پێدەچێ ئەم ئاسۆیە لەڕووی تەکنیکییەوە لەو ئاسۆ پێشکەوتووترەی موستێری کۆنتربێت، کە لە ئەشکەوتەکانی هەرێمەکەدا دۆزراپەوە هەروەها کەم پێدەچێ لەدوای سازکاری چەشنی بەردە بەلکاشەوە هەبێت، کە لە بەشەکانی دواتردا گفتوگۆ لەسەرکراوە.

وەك یەك پێدەچێ، کەئەم جۆراوجۆرەییە چڕ و پڕەیشوێنە والاکانی موستێری لەگەڵ ئەشکەوتەکانی موستێری باس لێوەکراوی هەرێمەکەدا هاودەمبوون یا بەشێوەیەکی دیکە لەگەڵ مەتریاڵە کۆنترەکانی بەردەبەلکادا هاودەمبووبن.

گاروود بە چەشنێکی ئەسڵی دەرکەوتنی دوو ئامرازی پانبووەوەی موستێری تێبینی کردوە پێوەندییان بەزوورگەکانی نزیك کەرکووکەوە هەیە (Garrod, 1928, pp. 270-72: 1930, p. 13).

لەساڵی ١٩٥٠و ١٩٥٤دا دوو نمونەی تێکەڵاوبووی کۆکراوەکانی سەر رووی عەرزی بەردەستێمان دۆزییەوە، کە کەچە شێوەی موستێری ئامێرە دەستکردەکانیان تێدابوو.

هیچ یەکێك لەدوو شوێنەکە بۆ دابڕینی ئاسۆیەکی کۆنتری موستێری ئیجاب نییە، چونکە هەریەك لە دوو شوێنەکە لەڕووی پەرەسەندنی چەشنی ئامرازەکانەوە تێکەلاوی ئامرازەکانی دواتر و چەند مەتریاڵێکی لەچاو نوێ و کەم بە ئاووهەوا کارلێکراو هەن، بەڵام وادیارە هەریەك لەدوو شوێنەکە بەهۆی بەندیواری دیاریکراوی کەچە (coarse) شێوەکانی موستێری لەگەڵ گاشە پەرت و بڵاوەکان بەرەو بەستە رووبارەکانەوە شایانی تێبینی کردبن.

یەکەم، لە جەمسەری تەلەگراف ٢٢/٢٦دا پێکهاتەیەکی جۆراوجۆری تێکەڵ لەڕووی پەرەسەندنی چەشنی ئامرازەکانەوە لەسەر رووی عەرزێکی بەردەستێ و گاشە لەسەر بڵاوەبوو (flin ± and gravel- littered) کۆکرایەوە.

لەوێدا رێگەی سەرەکی کەرکووك- سلێمانی لە گردە زورگاوییەکانەوە دەردەکەوێت و رێگەی شیوێکی لایەکی تەنگەبەرەوە بەرەو دۆڵە فراوانە سەرەکییەکە دەچێتە خوارەوە.



لەپاڵ تەڵەزمە بەکارهاتووە دیارنەکراوەکان و کەچە کرۆکی هەرەمی و تیغە دەگمەنەکان و دەستکردێکی نووکی تیغە بچووکەکان و تیغە سەختەکان لە کرۆکی هەڕەمیدا، ژمارەیەك کەچە کرۆکی قاونی بە ئاووهەوا کارتێکراو و دروستکردگەلێکی تەڵەزمی گەورەشمان دۆزیەوە، کە لاڕنەکێکیشیان تێدابوو.

ئەم کەلوپەلانە چەشنێکی کۆنتری رەنگە موستێری بێت زەبەن بە دەستی (workmansgip) یان پێشنیار کرد.

هەرچەندە ئەم شێوە بەیەکەوە پێدەچێ بە ئەسڵ لە چەشنێکی سازکاری بەردە بەلکابن، بەڵام هیچ ئامرازێکی گاشە یان دەستە بێور لێرە (تەلەگراف)دا نەدۆزرانەوە.

دووەم, لە سەراندوردا کرۆکی قاونی تەڵەزمی فراوانی چەشنی موستێریمان دۆزیەوە.

ئەم کەرەستانە لە نێوان گاشە بڵاوەکانی سەر ئەو دوو کلکەیەی، کە نزیکەی ٢٠-٣٠ مەتر لەسەر ئاستی بنکی رووی بەستۆرەدا بەردەبنەوە، باش پەرتو بڵاوبووبوون.

هاوشان لەگەڵ مەتریاڵەکانی دواتر لەڕووی پەرەسەندنی چەشنی ئامرازەکانی وەك کرۆکی وردی هەڕەمی ونوك و رنەکی خڕی دەگمەن و سەخت هەریەك لە نموونەگەلێکی پانیوەتر و لەچاو نوێدا دەرکەوتن، وەلێ رادەی بە کەش و هەوا کارلێکران و پانکردنەوە و تایبەتمەندی ناسافی روخساری چەند تەڵەزمێکی گەورە و کرۆکەکان پێشنیاری ئەگەر گەرایی ئەوە دەکەن، کە بەرهەمەکانی سازکارییەکی کۆنی موستێری کەوتونەتە دەوروبەری شوێنێکی نزیك (ئینجا) بەنێو نیشتەکانی تەلانی گاشەکانی سەر ئەم کلێنەنزمانەدا پەرش و بڵاو بوونەتەوە.





# بەردە بەلکا و چەمی بازاڕ و ئەسکی کەڵەك

لەساڵی ١٩٥١ لە بەردە بەلکادا چوار چاڵی ئەزموونی چەند مەترێك بەرین رووبەری گشتی نزیکەی ٢٠ مەتری چوارگۆشەی لە پالێك یان لە شوێنێکدا هەڵدایەوە و ئامراز گەلیکی تایبەتی خۆراك کۆکردنەوە، ئامرازی سازکاری چاخی بەردی کۆنی ناوەڕاست یان لە شوێنی خۆیاندا لە ئاخیر و ئۆخری دیاریکراوی بەردە بەستەکانی پلایستۆسینەدا دەرخست (wright and How, 1951: wright, 1952).

کەرەستە دەستکردەکانی بەدەستهێندراو لەمانە پێکدێن:

دەستە بێور و ئامرازی گاشە و ئامرازە تەڵەزمەکان (p1,26). ئەم کۆکردنەوە تایەتییە ئەوەندەی ئێمە دەیزانین، سەبارەت بەم بەشەی جیهان نوێیە.

نزیکترین مەتریاڵی جێی بەراوردکردن لە پونجابدایە لە باکووری رۆژئاوای هیندستان (De Terra and paterson, 1939, pp. 301-12: movius, 1944, pp,24-49) هەروەها لە تونسە (Gobert, 1950)، وەلێ پرسگەلێکی تایبەتی هەن بەندیوارن بەهەریەك لەم دەرکەوتنانەوە (بڕوانە ل.       ).

لە پێشدا ئاسایبوو تەقلیدی کرۆکی جووت ڕوو یا ئەبەڤیلی ئەشولی و تەقلیدی ئامرازی گاشە هەریەك بەپێی ئامرازە تەڵەزمە بەکارهاتووە هاوشانەکانی خۆی وەك دابڕان و بەردەوامبوونی نەریتەکانی ئامادەکردنی ئامرازەکانی بەردی پارچەکراو، چارەبکرێت.

بەڵگەیەکی بەتینی هێندێك دابڕان هەیە لە ناوچە گەلێکی دیاریکراو لە سەردەمە زووینەکانی پلایستۆسینەدا، بەلاّم بەڵگەی زۆریش هەن، کەرەنگە هەردوو تەقلیدەکە لەنێو یەك سازکاری دەربکەون.

کۆکراوەکانی بەردە بەلکە هەردوو تەقلیدەکە بە تێکەڵکراوی لەنێو یەك سازکاری چەرخی بەردی کۆنی نێوەڕاست تێی بڕوانرێت.

ئەو سازکارییە تاڕادەیەك کەمتر لە ٥٪ی دەستە بێورەکانی کارزانانە دروستکراو پێکدەهێنێت.

ئەمانە چ لەسەر گاشە بەردەستێی گەورە و بچووکەکان چ لەسەر تەڵەزمەکان ئاولاینی هێلکەیی جۆراوجۆر و رۆخی راست و توێژاڵ هەڵگری جووتڕووی تەخت (flat bifacial flaking)ی زەبەنبەدەستانەی چەشنی گشتی ئەشولی سەروو، پێشاندەدەن. لەڕاستیدا،





ژمارەیەکی دیاریکراوی دەستە بێورە زۆر بچووکەکان و ژمارەیەکی دیکەی ئەو جۆرانەی لەسەر رووە بەرامبەرە یەکبەدوای یەکەکاندا توێژاڵهەڵگر (flaking)یان هەیە پێشنیاری لایەنێکی رەنگە وەرگیراوبێت- ئاخیر و ئۆخری تەقلیدەکە دەکەن.

هەرچۆنێك بێت، پێوەندی بەتینانەی لەگەڵ ئامرازە جووت رووەکاندا پێشکێکی گرنگی ئامرازی گاشە سادەکانە (کە لە دەوری ١٠٪ سەرجەمی کۆی گشتیدان).

بەشێوەیەکی کردەیی تەواوی ئامرازەکانی لە بەردەبەستی سەمە بەردی گەورە (دروستکراون)، کە لە هەمووبارێکدا نزیکە تەنها لەیەك ڕووەوە تەڵەزمیان لێکدرابێتەوە (flaked)، ئینجا چ بە درێژایی نیوەی چێوەکە چ بە دەوری هیندێکی چێوەکە چ زۆرینەی چێوەی گاشەکەیان بڕیوە (truncated)، کە پۆلێکی ئەو ئامرازانەیان دروستکردووە هەمیشە بە چەپەچاخ (choppers) ناسراون.

هێندێك جۆر زێتر تیژکراون (لە نووکەوە)، بەلاّم هێشتا تەنها هەر لە روویەکەوە تەڵەزمیان لێکراوەتەوە (توێژاڵیان لێهەڵکراوە)، لەڕووی شێوەوە گواستنەوە بۆ دەستە بێورەکان دەردەخەن.

لەسەر ژمارەیەکی کەمی ئامرازە گاشەکانی لە دوو ڕووەوە توێژاڵیان لێهەڵکراوە تەنکبڕەکە (flaking) هێشتا لەسەر رووی دووەمدا کەم پەرەی پێدەدرێ، کە رەنگە ئەو ئامرازانە لە پۆلی چەپەچاخەکاندا هێڵدابنەوە و ئامرازی ئەنجنەکەری راستەقینە(true chopping- tools) دانەنرێن.

دوو کەچە گۆبەردی (stone spheroids) قەبارەی پرتەقاڵ، وای وای، لە نیشتەی مەتریاڵە بەئاو رامالکراوەکاندا (slope- wash)* دۆزرانەوە، وەلێ تاڕادەیەك بە دڵنیاییەوە ئەو دوو گۆیانە لە هەمان ئەو چینە گاشەیە داتاشراون، کە پاشماوەی (rest) مەتریاڵەکانی خستە بەردەست.

سەرەڕای دەستە بێور و ئامرازە گاشەکان بەشی زۆرینەی سازکارییە (زیاتر لە ٧٠٪ی کۆی ژمارەی ئامرازەکان، جگە لە پەلەبەرد و پارچە کەم بەکارهاتووەکان) لە جۆرەکانی تەڵەزمی بەردەستێی زبر و نارێکی بچووك و مامناوەندی و پارچەکان، پێکدێت.

ئەو تەڵەزمانەی خودان شێوە (platform)ی سەرنجڕاکێشی شیاوی جیاکردنەوەن زۆربەیان (٧٥٪) شێوەی سادەیان هەیە، ئینجا هیچ گۆشەی ئاسایی (٤٥٪) چ گۆشەی بەرین (٣٠٪)

* sheet erosion slope- wash: داڕوتانێکە، کە زیاتر مەتریاڵەکانی سەر زەوی رامالێ لەوەی نەواڵ (ravine) و زانك (gully) دروستبکات.

بن، هەروەها تەنها نزیکەی ٢٥٪ ڕۆکەدارن* پارچە دروستکراوەکان یا بەکەمی یا بەزۆری لە ئامانجی جیاوازدا بەکارهێندراون و تەنها ڕەنگە لە چەند بارێکدا بە ئەنقەست تیژ کرابنەوە.

زەحمەتە لەنێو پۆلگەلێکی روون و بەرچاودا پۆلێن بکرێن، وا دیارە ئامرازە تەڵەزمەکانیش شێوەی جۆراو جۆری ڕنەکە سادە و تەکنیك خراپەکان بن.

هەروەها ئەوانە پێوەندییەکی بەتینیان لەگەڵ دەستەبێور و ئامرازە گاشەکاندا هەیە.

ئەوان لە کرۆکی گەورە و مامناوەندی یا بچووك دروستکراون نزیکەی ١٠٪ سەرجەمی سندووقی ئامرازەکان پێکدەهێنن، کە لێرەدا بە سازکارییەك دادەنرێن.

ئەوانەی لە گاشە یا نیوەگاشە دروستکراون، زۆرترینی ئەم کرۆکانە (دەوری ٦٠٪) جێ بڕینی تەڵەزمیان هەیە بە زۆریش لە یەك لاوە، زۆر بە دەگمەنیش (دەوری ٣٠٪) لەڕووی تیرەوە بە کرۆکە قاوبییە ڕاستەقینەکان دادەنرێن، هەروەها ئەوانەی دەشمێننەوە شکڵی فەڕووی بیو شێوەن (amorphous).

ئەو ئەگەرە بەهێزەی، کە هێندێك سەردەم بە سازکاری جیاواز جیا دەکرێنەوە لێرەدا لە قەراغی ڕووبارێکدا تێکەڵ و پێکەڵ بوونە و (ئەو گریمانەش) دوورە (لە پراکتیس) دەرکەوتنە تێکەڵ و لەیەك نزیك کۆبووەکانی (close- packed) تەواوی ئامرازی دەستکرد و ئێسقانەکان لەم بەردە بەستانەدا پێشنیاری هاودەمیەتی (contemporaneity) و کەمێك شڵەژان دەکەن، چونکە لەڕووی تیۆرییەوە (theoretically)کاریگەری ڕووبار (بەست) زیاتر شت پەرش و بڵاودەکاتەوە نەك لێکیان کۆبکاتەوە.

تەنها چەند بارێکی بەلیتور بوونی فرەی (multiple patination)* ناسەرەکی و گەلێك دەگمەن هەن، ئەوانیش هەمووی لەسەر ئامرازە تەڵەزمەکانە.

* ڕووکە (FACETED): یا بریتییە لە ڕووە بچووکەکانی وەك هی کریستاڵ، یا بریتییە لە ڕووە بچووکەکانی ئەو گاشانەی بەهۆکاری سروشتی وردبوونەتەوە.

* (١)بە لیتووربوونی فرە (multiple patination): بریتییە لە چەندانە بونەوەی چینەکانی بلۆغ لەسەر بەردی ناو ڕووبار و پەستانی، کە بەکوردی (لێور)ی پێدەگوترێ.



هەریەك لە دەستە بێور و ئامرازە تەڵەزمەکان هەمان باری (order) توێکڵ* هەڵدان (freshness) و بەلیتۆربوون دەردەخەن.

بەهۆی سەرنجدانی ورد لەشوێنی جۆرە تایبەتییەکان لە شوێنی ئەسڵی خۆیاندا (insitu)، زۆرترین ڕووخساری لوسبووی* زۆربەی ئامرازی گاشەی سەمەبەردەکان بە شێوەیەکی ئەنجامگیر پێشانیان دا، کە بەهۆی لەچاو لاوازی و زیاتر شایانی شیبونەوە و پێکاتەی سەمە بەردەکانەوە (limestone) وایان لێهاتووە.

ڕووە هەڵگەڕاوەکانی (واتە ڕووی لای سەرەوەی بەردەکان upturned) دووچاری ئاوی سەرزەوی و کاریگەرییەکانی دیکە بوونەتەوە، وا دیاربوو داشۆڕابن و تلخیان گرتبێت ( leached and worn) لە کاتێکدا ڕووەکانی ژێرەوە (down turned) لەچاودا پارێزراون و توێکڵیان گرتووە و بە نوێیی ماونەتەوە.

کەوابوو هەرسێ پۆلەکە- دەستە بێورە بەردەستێکان و ئامرازە گاشە سەمە بەردەکان و تەڵەزمە دەستکردە بەردەستێ نارێکە بچووکەکانیش لەم شوێنەدا بە هاودەم دادەنرێن.

پاشماوەی گیانەوەران، کە بەتەواوی لەگەڵ ئامرازەکاندا تێکەڵاوبوونە، بوونی ئەم گیانەوەرانە دەردەخەن: فیل و کەرکەدەن و گاجووت و مەڕ یا بزن، هەروەها یەکێك لە خێزانی ئەسپ ( an equid)، کە پێدەچوو کەرەکێوی بووبێت (نامەی ١٦ تەمووزی ١٩٥٢ لە دکتۆر (ئێنی. سی. فریسەرەوە لە مۆزەخانەی بەریتانی مێژووی سروشتییەوە بۆ بریدوود) هەروەها هێلکە شەیتانۆکەیەك (کە لەلایەن بەڕێز ویلنکس لە هەمان مۆزەخانەدا بە (Helix salomonica) ناسێندرایەوە).

دۆزینەوەی پەرش و بڵاوەکان پێشنیاری ئەوە دەکەن، کە ئەم ئاسۆیە فراوانە.

هەمان جۆرەکانی تاڕادەیەك بە ئاودا چوو (down stream)ی دەستە بێورەکان و کرۆکەکان و ئامرازە تەڵەزمەکان، وەلێ هێژ ئامرازی گاشایان تێدا نەبوو، لە پاشماوەی کەمبازێکی

* (٢) توێکڵ هەڵدان (Fresh ness): بریتیە لە توێکڵ لێبوونەوەی بەردەکانی ناو ڕووبار دوای وشك بونەوەی ئاو لە شوێنەکانیاندا.

* (٣)لوسبوو (water worn): بریتییە لە لووسبوونی بەردی ڕووبار بە ئاو، کە بەکوردی (قەڵۆ)ی پێدەگوترێ.





(hummock) هەمان پێکهاتەی گاشەی گشتی، کە بەکەش و هەوا کاریان لێکرابوو، لە چەمی بازاڕدا دۆزرانەوە.

دوو دەستە بێوری وەك یەك لەڕووی عەرزی پەرش و بلاّوی هەمان سیستەمی گاشە، کە لەژێر لیتەدا بە ئاووهەوا نزیکی چەرمۆیە و دەکەوێتە هەمان دۆڵەوە و کتومتیش لە رۆژهەلاّتی ئەم دوو شوێنەوەیە.

لە رووبەرێکی دیکەی ئاو لەبەر رۆیشتندا (drainge) لەوپەڕی باکووری ئەسکی کەلەك لەسەر قەراغی راستی زێی گەورەدا، دەستە بێورێکی چەشنی ئەشولی و دابڕاو کەمێك دوور لە نیشتە گەورە و پیتەکانی گاشە، دۆزرایەوە.

کەوابوو ئەم ئاسۆیە تایبەتییەی چەرخی بەردی کۆنی نێوەڕاست هەروەك بە شێوەیەکی سەرەکی لە بەردە بەلکادا گوزارشتی لێوەکرا، ئێستاشی لەگەڵ دابێ لەم بەشەی رۆژهەلاّتی نزیکدا تاك و تەرایە.

ئەم ئاسۆیە یەکەم دەرکەوتنی هەڵکۆڵدراوی ئامرازە گاشەکان لە رۆژئاوای ئاسیادا و یەکەم جۆراوجۆر گەلێکی نوێ و کۆکراوەی تەقلیدەکانی ئامرازی گاشە و کرۆکی جووت ڕوو هەروەها تەڵەزمەکان فەراهەمدەکات.

هەروەها رەنگە لە کۆتایدا دەربکەوێت، کە لە باشووری رۆژئاوای ئاسیادا بەربلاّوتربێت.





# توێژینەوەی سیرامیکی تایبەت و هونەرەکانی کاربۆن چواردە

## فردریك ئار. ماتسۆن

## سیرامیکی دەردەستکەوتووی وەرزی ١٩٥٤/٥٥ قەلاّی چەرمۆ

سەبارەت بە پێوەندییەکانی مرۆڤ بە قوڕ و کا و زبڵ (ڕیغ+پشقل) و رەشەباو گەرمی و سەرماو کەر و مەڕ، هەساری کۆتەکەڵەی چەرمۆ دڵخۆشترکەرین جۆری تاقیگەی مەیدانی بوو, هەروەها کۆتەکە ڵە کۆنەکان لەم هەسارەدا بۆ بەتەواوی راڤەکردنی گەواهی لاوازیان لەبارەی مرۆڤی ناوچەیی زیاتر لە هەشت هەزار ساڵ بەر لە ئێستا, بەرەنگاری یەکێك دەکەن.

گلێنە دۆزراوەکان لە چەرمۆدا چەند پرسێکی سەیر دەخەنەوە.

ئەو گلێنانە لەناوچە چڕەکانی دوو مەتری هەرە سەروی پارچەکانی جێگەی ژیاندا دەرکەوتن, هەروەها باشترین جۆری گلێنەکان کۆنترینیان, خراپترین گلێنەکانیش بە شێوەیەکی گشتی درەنگ سات ترینیانن.

ئەو پلەی بە ئاو و هەوا کارتێکرانەی لە گلەکەدا تێبینی کرا لەباری گلێنەکاندا رەنگدەداتەوە, بۆ نموونە رەنگی رووی دەرەوە تاڕادەیەك بە تەواوی لە گلێنەکانی دواتردا دیارنەماوە.

هەوەها وێکچوون لە نێوان جۆری گلێنە دۆزراوەکانی چەرمۆ و ئەوانەی لە چینە بنچینەییەکانی حەسونە و مەتارەدا دۆزراونەتەوە, هەیە، وەلێ سازکاری سیرامیکی ناوچەیی تایبەتمەندی چۆنیەتییەکانی خۆی هەبووە.

لە ماوەی وەرزی ١٩٥٤/٥٥-دا لە سەرووی ٢,٥٠مەتری نیشتەکاندا نزیکەی ١٧پێی کیوبیکی کۆتەکەڵەکان هەڵکۆڵدران.

زۆرترین بەشی ئەم کۆتەکەلاّنە لە گروهی چوارگۆشەدان (بڕوانە شێوە.٦) جێی-ئێڵ ٥-٩ و جێی-ئێڵ ١٠-١٤ (نزیکەی ٥ پێی کیوبیکی لە هەریەکێکیاندا) و رووبە لەپاڵ یەکەکانی نێوان شێوەکە و کردەکانی یەکەم و دووەمی وەرزەکانی پێشوتردا دۆزرانەوە، کە بەشێوەیەکی چونیەك گلێنەی زۆریان خستە بەردەست.

گروهی چوارگۆشەی y-5 ١٥-١٩, لەسەر تەلانی رۆژهەلاّتی گردەکەدا کە روبەرێکی سێیەمی بەرهەمدەر بوو، نزیکەی ٢ پێی کیوبیکی کۆتەکەڵەکانی خستە بەردەست. گەورەترین





چڕبونەوەی لێوارەکان و دەسکەکان و بنکەکان، هەروەها جەستەی جوجوی کۆتەکەڵەکان لەم سێ ڕووبەرەدا لەڕووی قووڵییەوە جیاوازن.

لەجێی –ئێل ٥-٩دا کۆتەکەڵە دیاریکراوەکان لە چینەکانی ٣-٤ (١٠٠-٢٠٠سم) گەلێك زۆربوون, لەجێی- ئێل ١٠-١٤ ئەو کۆتەکەلاٌنە لە چینەکانی ٢-٤ (٧٥-٢٠٠سم)دا دەرکەوتن, لە کاتێکدا لە V-Y ١٥-١٩دا چڕیەکە لەڕووی عەرزەکەوە بەنێو چینی دووەمدا لە قووڵاییدا تیل نیشانکردن گەلێکی سەرنج ڕاکێشی هەیە لە ڕاڤەکردنی شیاوی جۆری نشینگەکەدا دوور و درێژترین نیشتەجێبوون لەسەر بەرزترین بەشی شوێنەکەدا یا بەهۆی کەڵەکە بوونی خۆڵەکەیەوە بووە، یا بەهۆی داڕووتانی خێراتری تەلانەکەوە بووە.

تەواوی پارچە گلێنەکانی هەموورۆژێك دەبرانە هەساری کۆتەکەڵەکان بەگوێرەی ( square and level) کۆدەکرانەوە.

ئەو پارچانە کەم کەم پاکدەکرانەوە و بە گوێرەی پێکهاتە و پلەی سوورکردنەوە پۆلێندەکران و دەژمێردران، ئینجا بۆ مەبەستی نوژەنکردنەوەی دەفرە تایبەتییەکان هەر کاتێك بگونجایە گروھ گروھدەکران.

تەواوی لێوارەکان و بنکەکان و پارچەی جەستە سەرنج ڕاکێشەکان و دانە (unit) بۆ چاکردنەوە شیاوەکان و شێوە تایبەتیەکان، هەروەها ئەو کۆتەکەلاٌنەی درێژەپێدانەکانی هونەری سازکارییەکانیان پێشاندەدا بردرانەوە بۆ کامبەکە، کە لەوێدا ئەوان پاکتر دەکرانەوە و بە وردی تاقیدەکرانەوە و لەپێناو تیرەی لێوار و بنکەکەدا و هتد، پێوانەیان وەردەگیرا، ئینجا بەوێنەی لایەکی نەخشیان دەکێشرا.

سوستەی دلاٌوای چەند شێوە و درێژەپێدانەکانیجوانکاری لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارەوە بۆ تەواوکاری کۆکراوەکانی لە وەرزە دیتنکارییەکانی پێشووی چەرمۆدا دۆزرابوونەوە هەڵبژێردران بۆ ئەوەی لە مۆزەخانەی عێراقی لە بەغدادا دابنرێن.

لە هەڵکۆڵینەکاندا دەکرێ پەیوەندییەکی نزیککراوی گۆڕانکارییەکان لە جۆری گلێنە و چۆنیەتییاندا لەگەڵ چینەکاندا ببینرێت، وەلێ تاوەکو لێکۆڵینەوە دوورو درێژەکانی لەبارەی هەریەك لە کۆتەکەڵە و پێوەندی چینەکانەوە لە چەند چوارگۆشەیەکدا دەکرێن، تەنها دەتوانرێ (trends)ەکان پێشنیار بکرێن.

ئەم کورتە جەدوەلەی خوارەوە ئاماژە بەمانە دەکات جێی- ئێل ٥-٩و جێی ئێل ١٠-١٤، کە کۆتەکەڵەیان تێدا زۆربوون.





| چینەکان | تریندەکان (Trednds)* |
|---|---|
| ڕووی عەرز لە میانەی (٠-٧٥سم) | کەچە گلێنە کار تێکراوە ئەستورەکان باوبوون. ئەو گلێنانە زۆر هەرشیندارە بوون وهەمیشە لەڕووی عەرزەکە وەك پارچەی بچووك دەردەهێنران. |
| (٧٥-١٠٠سم) | کۆتەکەڵەی گەورەتر و کەم هەرشیندارتر لەڕووی قەبارەوە ٥X٥-١٠X١٠سم زۆر باوبوون. ئەم گلێنانە لەڕووی پەرەسەندنی چەشنەوە ١٢X١٠ملم ئەستوور بوون. زۆربەی پارچەکانیش پارچەی کوار (storage jars) شێوە تەنکترەتایبەتیەکانیش دەرکەوتن. |
| (١٠٠-١٥٠سم) | پارچە گەورەترە خودان ڕووە کەمتر بەکەش و هەوا کارتێکراوەکان گەلێك زۆربوون. زۆرینەی کۆتەکەڵەکانیش سەمە نیشتەیەکیان هەبووە کە ڕوخسارێکی ڕووەی دەرەوەی بریقاوی پێ بەخشیون. دەفرە جوجوییوکان و کۆپەکان و قولڤە دەسکی. (nose lugs) تێکەڵەکان (mug)* باوبوون. ئەم چینە لەڕووی سیرامیکەوە سەرنج ڕاکێشترین چینە لە شوێنەکەدا. |
| (١٥٠-٢٠٠سم) | گەلێك بنکەی کۆتەکەڵەکان دۆزرانەوە. ئەو بنکانە ڕەنگە ئاماژە بە چینێك بدەن, کە تێیدا کوارەکان لە گڵەکەدا یا لەچینی عەرزیدا نێژراون، کەلەسەریدا ئەو کوارانە دانراون. |
| (٢٠٠-٢٥٠سم) | پەرش و بلاٌوبونەوەیەکی کەمی کۆتەکەڵەکان دەرکەوت. ڕەنگە لەم چینەی (ئاستەی) لە ڕووبەرەکانی ساڵی ١٩٥٥دا هەڵکۆڵدران بەکارهێنانێکی بەفرەی گلێنەکان نەبووبێ. |

* (trednds): واتە ئەو ئاڕاستیەی بە چ لایەکدا دەکەن.

* تیکڵە (mug): بەیتیە لە گلێنەی وەك مەسینە.

تایبەتمەندی چەشنەکانی گلێنەی ئەم چینانەی سەرەوە رەنگە بە گوێرەی لەیەك پۆل داندراوی کەل و پەلەکانی (frequency of occurrence) نزیککراوە بەم شێوەیەی خوارەوە ریکبخرێن:

١- کوارەکان (Storage jars) لە تیرەدا نزیکەی ٦٠سم بەرز دەبنەوە.

ئەوانە گۆپین و بنکی تەختیان هەیە.

شتێکی روون و ئاشکرایە, کە هەورگەرەکان (potters)* دیوارەکانی (ئەم کوارانەیان) بەدەروی پارچەیەکی تەختی بنچینەیی‌دا هەڵناوە.

نەداری شاکاشیەکانی شیاوی چاکردنەوەن وەك ئەوانەی لە چینە بنچینەییەکانی حەسوونە و مەتارەدا دۆزرانەوە بێگو دەبێ لەبیردا بهێڵدرێتەوە، کاتێك هەوڵی تێگەیشتن لە بەکارهێنانەکانی گلێنەی چەرمۆ دەدەین.

هەر شیندارییەتی (friability) یا توورتییەتی (fragility)* گلێنە ئەستوورە خودان کۆمەڵەی پێکهاتە کونۆچکەدارە وردەکان (porous fine- textured body) و کارلێکرانیان بە کاریگەری شەختە (frost) و تێخزانی سەمەکان، بە پێچەوانەی ئەو کوارە تۆکمەترانەی لە گڵی دەشتی میسۆپۆتامیا دروستکراون, هۆکارێکی گرنگە.

وادیارە لە چەرمۆدا کوارە قورینەکان کەمتر بنچینەیی بوون لە چەند گوندێکی زۆرینەی کشتوکاڵی فراوانانە پێشکەوتوتردا، چونکە پێدەچێ بارانبارینی زۆر هەڵگرتنی دانەوێڵەی لە عەرزدا بە شێوەیەکی یەکبە دوایی‌یەکی زۆر زەحمەت کردبێت.

٢- کووپە جووجوویییە قووڵەکان لەرووی تیرەوە لە ٨سم-ەوە دەگەنە ٢٠سم. هەروەها لە ئەستوورایی دیوارەکاندا جیاوازی هاورێکیان.

لێواری کۆتەکەڵەکانی ئەم کووپانە زۆرترینی شێوە تایبەتییەکان بوون لە چەرمۆدا، کە یەکسەر دەفرە پەلە جوجوییەکانیان لەدوادێن (No.3).

هەریەك لەم شێوانە لە چینە بنچینەییەکانی حەسوونە و مەتارەدا دەرکەوتن، بەڵام بەقەد ئەوانەی چەرمۆ زۆرنەبوون.

* (١) هەورگەر (potter): کەسێکە دەفری سواڵەت دروستدەکات.

* (٢) توورتیەتی (frigility): زوو شکست.



ئەمانە بۆ هەورگەر شێوەگەلێکی سروشتین تاوەکو پەرەیان پێبدات کاتێك باندێکی قورپیان زیادکردووە بۆ دروستکردنی لێوارێکی ستوونی.

پێویستیش بەوە ناکا بەدوای شێوە سەرەتاییە بەردینەکاندا بگەرێین.

٣- دەفرە جووجوویییە پەلەکان لە تیرەدا ٢٠-٤٠سم دەبوون و تایبەتمەندی چینی سێیەمبوون هەروەها لە چینی دوەمیشدا دەرکەوتن، هێندێك کۆتەکەڵەش شوێنەواری لاوازی روتەختکردنی قورە سووریان لەسەر ماوە.

بارستەکانی قورە سوور لە شوێنەکەدا نابلاوونەبوون، بەڵام گەواهییەکانی بەکارهێنانی بۆ جوانکردنی گلێنەکانی زۆر کەمبوون.

دەفرەکان باش دروستکراون و رووەکانیش باش لووسکراون.

بەڵگەی ئەوەش هەیە، کە ناوچەی لێوارەکە وەك توێژاڵێکی جیاواز لە جووجوویکردنەکەدا زیادکراوە.

٤- تیکڵە دیوار راستەکان لە تیرەدا ١٠-٢٠سم- و لێواری کەمێك رووبەبان (flaring)یان هەیە و قولڤە دەسکێك (nose lug)* یا زیاتری بە لێوارەوە نوساویش لە چەرمۆدا تاك و تەران.

دەسکە ستوونییە تەنکە درێژەکانیش کونێك یا جاربەجار دووکونیان هەیە، کە بەشێوەیەکی ئاسۆیی کونکراون، هەروەها لەیەکەم تێڕوانینی خێرادا رووگەلێکی زۆر سادەی خودان دەسکە گەورەکان (large eyes)* پێشنیار دەکەن هەروەك زاراوەی قولڤە دەسك (nose lug) ئاماژەیان پێدەکات. زیاتر لە پەنجا دەسکە قولڤی تەواو پارچە پارچە دۆزرانەوە. رەنگە سەرنجرا کێشبێ بزاندرێ بۆچی ئەو قولڤە دەسکانە بەشێوەیەکی ئاسۆیی کونی پێچ و مۆرەیان تێکراوە.

رەنگە بۆ هەڵواسین بووبن، وەلێ رەنگە کتومت بۆ "ئارەزوو خۆشی" بووبن هەروەك دۆچەکانی پەنسیلڤانیا وادەڵێن.

ئەوان پێشنیاری جۆری سەرەتایی دار یا بەرد ناکەن.

١. کەمتر لە ٩٠ کۆتەکەڵەی بچووك شوێنەوارەکانی قورەسوور (ochre)یان لەسەر رووێك یا هەردوو روویاندا پێشاندا کاتێك ئەو کۆتەکەڵانە بەوردی تاقیکرانەوە.

* (١) قولڤە دەست (nose lug) دەسکێکی وەك قولاپە لە لێوار دەدرێ.

* (٢) دەسك (eye): لەشێوەی چاودایە یا خرە، قولبەشی پێ دەگوترێ.





زاراوەی سوری ناجێگیر (red fugitive) رەنگە لە زۆربەی بارەکاندا گونجاوبێت.

سروشتی هەرشینداری ناسکی قوڕە سورکراوەکە و نەداری روون و بەرچاوی مشتومالکردن لەزۆربەی بارەکاندا، بەیەکەوە لەگەڵ ئەنجامەکانی داڕووتاندنی ئاوی سەر زەوی و کاریگەری شوختە (زوقم frost)و نیشتنی سەمەکان (lime) بریتین لەو فاکتەرانەی، کە رەنگە رامالینی زۆرینەی رووە سوورەکانی خێراتر کردبێت.

چەند بارستەیەکی قوڕی سوور لە هەلکۆلینەکاندا دۆزرانەوە ئەوە پیشاندەدەن، کە بەکارهێنانی رەنگی سوور لەسەر گلێنەکاندا (هەروەها رەنگە بۆ جوانکردنی جەستەکانی مرۆڤ و جل و بەرگ و پێست یا دار بەکارهێندرابێت) زۆر بلاوتربووە لەوەی رەنگە توێژینەوەی بێ سیستەمی لەبارەی کۆتەکەلەکانەوە ئاماژەی پێبدات.

لەنێو ئەم گروهەی کۆتەلەکاندا نزیکەی دەیەکیان شوێنەوارەکانی جوانکردنی سادەی هێلەکان و هێلە لارەکان (diagonal) و ئەو توخمانەی پلاندانان پیشاندەدەن، کە لە گلێنەکانی حەسوونەدا باون.

بەرێز فوئاد سەفەر کاتێك سەردانی چەرمۆی کرد چەند کۆتەکەلەیەکی رەنگکراوی کەمی تاقیکردەوە و وەك گلێنە زۆر کۆنە رەنگکراوەکانی حەسوونەپۆلینی کردن.

مشتومالکردن بەزۆریش لە هێلەکاندا (streaks) لەسەر نزیکەی سێیەکی کۆتەکەلەکانی ئەم گروهەدا دەردەکەوێت، بەلام پێدەچێ، کە کاریگەری کەش و هەوا شوێنەوارەکانی تەکنیکی کۆتایی (واتە لووسکردن) لە زۆربەی ئەو پارچانە لابردبێت، کەڕووی زبریان هەیە.

تاقیکردنەوەکانی قوڕی ناوچەی چەرمۆ ئەوەی نیشاندا، کە دەتوانرێ مشتومال بکرێت.

دەفرێکی بچووکمان لە کامپدا لە قوڕی ناوچەی چەرمۆ دروستکرد و رووی پارچە وشکبوونەوەکەش بەخێرایی بەهۆی لێسەیەکی* بچوکەوە (small smooth polished stone)، کە لە هەلکۆلینەکاندا دۆزیبومانەوە مشتومالکرا.رەونەقێکی باشی لەسەر دەرکەوت.

لەبەر ئەوە رەنگە وادەربکەوێ، کە مشتومالکردن وەك هونەرێك بەشێوەیەکی زۆر فراوانتر هەورگەرەکانی چەرمۆ بەکاریان هێنابێت، کە لەگەڵ مەبەستیاندا گونجاوە.

* لێسە (smooth polished stone): مالەی بەردین بۆ لووسکردن و سواغ.



ئەمەش هۆکارێکی سەرنجڕاکێشە رەنگە لە دوا راپۆرتدا لەبارەی گلێنەکانی چەرمۆ بە تەواوانەتر هەلگێر و وەرگێری پێبکرێت.

توێژینەوەی وردبینی برگە بەردەکان (thin sections)* دەربارەی کۆتەکەلە رەنگکراو و مشتومالکراوەکان ئێستاکە لەرێگەدایە و پێدەچێ ئەوە پیشانبدا، کە ئەوانە پارچەی هاوردەن، بەلام بەگوێرەی روخساری دەرەوە ئەوانە وا دەردەکەون بەرهەمی ناوچەیی بن.

بەشی هەرەزۆری کۆتەکەلەکانی لەسێ چینەکانی یەکەمدا دۆزرانەوە شوێنەواری قوڕە سووریان پیشانەدەدا، چینی دووەمیش کەمێك لەوانەی دیکەی زیاتر تێدا بوو تەنها شەش دانە لە چینی چوارەمدا و یەك دانەشی لەچینی پێنجەمدا دەرکەوتن.

ئەم دابەشبوونە ئاماژە بەوە دەدات، کە بەکارهێنانی قوڕەسوور لەسەر گلێنەکان لەچەرمۆدا تەنها لەیەك چیندا خۆی نەدیوەتەوە (سنوردار نەبووە).

٦- دوو شێوەی سەرەتای سەری گیانەوەران، کە چاوی پنی پنی (punctuate eyes)یان هەیە وادەردەکەوتن سووچی بنچینەیی دەفرە بچوکەکان بن هەروەها پێدەچێ هاوشێوەی کەل و پەلێکی لە مەتارەدا دۆزراوە بن، هەرچەندە لەو کەل وپەلەی مەتارە باشتر دروستکراوە (Braid wood et al, 1952, p1. 1x6) شێوەیەکی سەیریش لە حەسوونەدا دۆزرایەوە، کە پێشنیاری بیابی* (Ocarina) یا دەخیلەیەکی پارەی (penny bank) هەمان جۆر دەکات (Lioyd and safar, 1954, P1. x1, lower right- hand corner).

لەپێناو پێوەندی تایبەتمەندییە سروشتییەکانی گلی ناوچەیی لەگەڵ ئەو گلێنانەی لە گوندە کۆنەکاندا دروستکراون گلێنە و گلی چەرمۆ زۆر بەدرێژیی دەتوێژرێنەوە.

دەتوانرێ هەندێك تایبەتمەندییە جوانکارییەکان بەو تایبەتمەندییەی جوانکارییانەوە بەندیواربکرێن، کە لە چینە بنچینەییەکانی حەسوونە و مەتارە و گردی عەلیاغادا بەکارهێندراون، وەلێ گلێنەکانی چەرمۆ بەزۆری یەکەیەکی سیرامیکی جیاواز دروستدەکەن، کە ئەگەر یەکێك بیەوێ ئەوە گریمانبکات ئەو گلێنە تەنك رەنگکراو و قلش لەسەر

* (١)برگە بەرد (thin section): برگە بەردێکە 0.02-0.03)ملیمەتر ئەستوورە بۆ توێژینەوە لەنێو پلێتە شووشە روونەکان پاشتی تردا جێگیر دەکرێ.

* (٢)بیابی (ocarina): ئامێرێکی میوزیکی سادەیە.

هەڵکەندراوانە بەڵگەی پێشکەوتنی سیرامیکن، ئەوا سیرامیکەکە لەو گلێنەیە کەمتر پێشکەوتوو بووە، کە کتومت لە هەردوو شوێنی یەکەمدا ئاماژەی پێدرا.

ڕەنگە ئەم گریمانە بەر پاساو نەکرێت، گەر تایبەتمەندی گلە بەردەستەکان بە هەوڕگەرەوە بەندیوارین.

پێدەچێ جیاوازیەکان تەنها زیاتر پێداویستییە شارستانیە ناوچەییەکان ڕەنگبدەنەوە نەك ڕێکخستنی کرۆنۆلۆژی شوێنەکان.

هەرچۆنێك بێت، ئەگەر شوێنەکان هاودەمبن، ئەوا نامۆیە، کە ژمارەیەکی کەمی کۆتەکەڵە باش ڕەنگکراوەکان یا قڵش لێ هەڵکەندراوەکان لە چەرمۆدا نەدۆزرانەوە، چونکە لە گردی شمشارە لە ناوچە گردەڵانەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی چەرمۆدا دەردەکەون (Ingholt, 1957).

هەرچەندە بەردەستێکانی جۆری چەرمۆ لە دەشتەکەداکۆکرانەوە، بەڵام پێدەچێ هەرچۆنێك بێت پێوەندییە شارستانییەکان لەگەڵ نشینگەکانی سەرڕووی دەشتەکەدا سنوورداربن.

شێوەی پارچە سیرامیکە باشتر دروستکراوەکانی چەرمۆ پێوەندیان بەوانەی گلێنەکانی سامەرا و حەسوونەوە نییە، بەڵام باشترین هاوتەرییەکانیان لە سوستە گلێنە جوانەکانی مەتارەدا دەدۆزنەوە.

بەکارهێنانی تاوناتاوی مشتومالکردن و شێوە جووجوویییەکان ڕەنگە پێشنیاری ئەوە بکات، کە یەکێك لە چەرمۆدا قۆناغێکی زووینە و ناوچەیی تەقلیدی سیرامیکی حەلەف ببینیێ.

## گردی عەلیاغا

لە هەڵکۆڵینە ئەزمونەییەکاندا دەردەکەوێت، کە دانیشتوانی شوێنەکە تەنها گلێنەی بەسوودی ئەستووریان دروستکردووە. دیواری زۆرینەی دەفەرکان ١٥ملم یا ئەستورتربوون و لە پارچە قوڕی ٣- ٥سم پان دروستکرابوون.

هێندێك ڕووەکان بەو جێ پەنجانە چمکراون* (ridged)، کە کاتێك هەوڕگەر دیوارە نەرم شلەکانی دروستکردووە بەجێ ماون، بەڵام زۆرینەی ڕووەکان لووسن.

* (١)چمکردن (ridging): بریتییە لە بەسەری پەنجە قیتکردنەوەی ڕوویەکی نەرمی وەك قوڕ، کە وەك هێڵێکی زەقی لێدێ.



قورەکە برێکی کەمیزلە کا (chaff) لەنێوە خۆدەگرێت، دفەرەکان بۆ ماوەی لە سەعاتێك زیاتر نا بۆ نزیکەی ٦٠٠°- ٧٠٠° سێنتیگراد خراونەتە بەر ئاگر، بۆیە زۆربەی کۆتەکەڵەکان کرۆکێکی ناوەوەی ڕەشیان هەیە و ئەزمونەانی سوورکردنەوەکەش (ئاگربەردانەسەر) ئەم بوارەی کات و پلەی گەرمییەکەی چەسپاندوە.

گلی ناوچەیی لەسەر سەکۆی زێی گەورەدا فەراهەمبوو هەروەها سوستەکانی ئەو گلەش بۆ لێکۆڵینەوە کۆکرانەوە.

دوای ئەوەی لە شوێنەکەدا کۆتەکەڵەکان شۆردران و پۆلین کران، تەنها ٩٠٠ لێوار و لاکین* (base) و پارچە جەستەی جووجوویی و پارچە نائاسایییەکان لە هەساری کۆتەکەلەکانەوە برانەوە کامپ بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوەی زیاتر.

دواتر لە نیوەی ئەم کۆکراوانەی فڕێدراون، ئەوەی مایەوەش بەیەکسانی لەنێوان بەرێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار و پەیمانگای ڕۆژهەڵاتیدا دابەشکرا.

گلێنەکان وادەردەکەون پیوەندیان بە سادەترین لایەنەکانی سازکاری سیرامیکی حەسوونەوە هەبێت.

پێنج کۆتەکەڵەی خودان پارچەی شێوە برۆ چاو لەوانە دەچن، کە لە مەتارەدا دۆزرانەوە و کۆتەکەلەیەکیش ڕەنگە گوزاررشت لە گیانەوەرێك بکات تاکە پارچەی خەملێندراو بوون لە هەڵکۆڵینەکاندا دۆزرانەوە.

مەتریاڵە وەك یەکەکانی لە حەسوونەدا دۆزرانەوە زۆر ئاڵۆزن و ڕەنگکراون هەروەها هێڵکاری جوانکردنی دەم و چاو (ڕوو)یان هەیە.

ئەو دەسکە قوچەکیە بچووکانەی لەسەر نۆ کۆتەکەڵەی لە عەلیاغادا دۆزرانەوە، دەردەکەون هاوشێوەی ئەوانەن، کەلە مەتارەدا دۆزرانەوە هەروەها هاوشێوەی ئەوانەشن، کەلەسەر شاکاشییە گەورەکانی لەچینە کۆنەکانی حەسوونەدا دۆزرانەوە.

هەروەها ژمارەیەکی کەمی دەسکەکانیش (knob) لە چەرمۆدا دەرکەوتن.

دەسکە ئاسۆییەکانی کتومت خراونەتە سەر خوارووی لێوارەکە لەسەر یازدە کۆتەکەڵەی لە عەلیاغادا دۆزرانەوە، دەردەکەون.

* (٢)لاکین (base): بنکی سواڵەتی شکاو.





تاکە مادەکانی دیکەی سەرنج ڕاکێشی تایبەتی دوو پێچکەی ڕەقن پێدەچێ هی هەبەشیك* (brazier)بن، هەروەها مادە سەرنجڕاکێشەکان ئەمانەش دەگرنەوە: ژمارەیەکی کەمی کۆتەکەڵە تەنکەکان، کە هێندێکیان شوێنەواری ڕووپۆشکردنی (surfacing) قوڕە سووریان هەیە، نۆ سەرکەتەشێ لە کۆتەکەڵەکان دروستکراون، دوو پارچەی بچووك، کە پێدەچێ گلێنەی ڕەنگکراوی حەسوونەبن، کووپێکی بنك تەختی سەرەتایی، کە لەڕووی تیرەوە نزیکەی حەوت سم، هەروەها چەند پارچە تیسوینێکی خودان جێ قامیش (reed impression).

کەوابوو وادەردەکەوێ ڕۆڵی سیرامیکەکان لەگردی عەلیاغادا بەسوودبووە.

سەیرە، کەهیچ کۆتەکەڵەیەکی قڵیش لەسەر هەڵکەندراو یا پارچەکانی ((تەوەقی تویکڵ سپیکردن)) نەدۆزرانەوە، هەروەها سەیرکە، کە تەنها کەمترین پێشنیاری گلێنە ڕەنگکراوەکان دەرکەوت.

پێدەچێ شوێنەکە گوزارشت لە چادرگەیەکی* (encampment) کاتی حەسوونە یا گوندێکی نەداربکات، کە تێیدا دەفرە گلێنەکان تەنها پێویستیان بە هاڵۆ* (cooking pot) و دەفری* شیاو بۆ هەڵگرتنی دەغڵ و دان و ئاو هەبووە.

## گردی ئەل – خان

ئەو گلێنانەی لەماوەی هەڵکۆڵینی ئەزموونی (sondage)دا بەدەستهێنران لەمانە پێکهاتبوون: گلێنە ڕەنگکراوەکانی حەسوونە و گلێنە ڕەنگکراو و قڵش لەسەر هەڵکەندراوەکان و تەوەقی تویکڵ سپیکردنی چەند جۆرێکی جیاواز و گلێنەی سادەی جوان، هەروەها کەچە گلێنە سادەکان.

نیوەی نزیکەی ٩٠٠ی ئەو کۆتەکەڵانەی، کە بۆ تاقیکردنەوە برانەوە کامپ جوانکراوبوون و بەشی هەرەزۆری ئەمانەش هەڵگیران.

* هەبەشێك (brazier): بریتییە لە مقاڵەی قوڕین، مەقەڵی، مەنقەڵ.

* (١) چادرگە (encampment): ئەم واژەیە ڕەنگە سەبارەت بە چاخەکانی پێش مێژوو وەڕاست نەگەڕێت، وەلێ لە ئینگلیزییەکەدا وانوسرابوو.

* (٢) هاڵۆ (cooking pot): بریتییە لە دەفری گلێن بۆ چێشت تێدا لێنان.

* (٣)دەفر (container):



لە لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکەی گلێنە سادەکان، تارادەیەك تەواوی جەستەی کۆتەکەڵەکان و هێندێك پارچەی دیکە، کە بەیەکەوە چواریەك – پێنج یەکی گلێنە سادەکانیان پێکدەهێنا، بۆ ئەوەی قەبارەی مەتریاڵەکان کەمبێتەوە فرێدران.

هێڵکارییە ڕەنگکراو و قڵش لەسەر هەڵکەندراوەکان و شێوەی دەفرکانیش شیکردنەوە و لەگەڵ ئەو مەتریاڵە هاوشێوانەشدا بەراوردکران، کە مەتارە و حەسوونە و باغوزدا دۆزرابوونەوە.

کۆکردنەوەکانی کۆتەکەڵەکە و گڵی لەماوەی وەرزی ١٩٥٤/٥٥- دا ئەنجامدران، هەروەها ڕاپۆرتە بڵاوکراوەکانیش لەم لێکۆینەوەیەدا بەکاردەهێندرێت.

بەشی هەرە زۆری کۆتەکەڵە کۆکراوەکان لە هەڵکۆڵینە ئەزموونییەکانەوە لەچەند مۆزەخانەیەکدا تویژرانەوە، کە تیایاندا دانراون.

پرس گەلێك هەن پێوەندن بە دروستکردن و جوانکردن و بەکارهێنانی گلێنەکانی حەسوونە لەخۆ دەرخستنەکانیاندا لەچەند شوێنێکدا، کە هەم کۆکردنەوەی کۆتەکەلەکان و هەم ڕاپۆرتی شوێنەکان هاریکاری ڕوونکرنەوە دەکەن.

بۆ نموونە، پێوەندی هێڵکارییە ڕەنگکراو و قڵش لەسەر هەڵکەندراوەکان و شێوەکان و پلەی گڕلێدانی چەند شێوازیکی سیرامیك و میتۆدەکانی دروستکردن و تەواوکردنی (لووسکردن؟) دەفرەکان و هەبوونی گلێنە بازرگانییەکان، هەروەها ئەرکی ئەم چەند چەشنەی گلێنەکان لەنێو چاندی ئەم قۆناغەی تەکنیك و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی مرۆڤدا لەبارەی تاقیکردنەوەی زێتردا سوودمەندن.





# بڕگەی بەردی گڵێنەکان

## (pottery thin sections)

پارچەکانی 0.03ملم ئەستوور دەکرێ بۆ مەبەستی توێژینەوەی وردبینی پێکهاتە کانزاییەکانیان بە هەمان ئەو ڕێگەیە لە کۆتەکەڵەکاندا ئامادەبکرێن، کە بڕگە بەردەکانی پێ لەبەردەکان و کانزاکاندا دروستدەکرێن.

دەتوانرێ لە بڕگەیەکی بەرددا (thin section) تیشك بەناو زۆربەی کانزاکاندا تێدەپەڕێ کاتێك ئەو بڕگە بەردە لەسەر دەپکی (stage) وردبیندا دابنرێت، کە ناسینەوەی سروشت و شێوەی گەردیلەی کانزا تایبەتییەکان و ئەو پارچە بەردانە دەشیاوێنێ، کە لە قاڵبە قوڕینەکانی گڵێنەدا هەن.

کەوابوو، بەردزانێکی ڕاهاتووی سیرامیك دەتوانێ تایبەتمەندی لەنێو خۆگر (inclusion)ی کانزایی لە قوڕەکەدا بتوێژێتەوە و وەسفیبکات، هەروەها دەتوانێ هێندێك شت دەربارەی ئەسڵی جوگرافی یا جیۆلۆجی شیاوی قوڕەکە فیرببێت.

هێندێك لەو پرسەتایبەتیانەی شیکاری (analyst) شوێنەواری لەبیریدا هەن ئەمانەن:

١- ئایا بۆ وەبەرهێنانی گڵێنەکان لەیەك شوێن و لە هەمان کاتدا یا لەسەردەمەکانی جیاوازدا جۆرە قوڕێك یا زیاتر بەکارهاتووە؟ ناسینێکی قوڕە ناوچەییە فەراهەمەکان و تێگەیشتنێکی جیۆلۆجی ناوچەکە لە توێژینەوەکە هاریکاری دەکات. گڵێنەکانی ئاموق یا دەشتی ئەنتیۆخ لە باشووری تورکیای ناوەندیدا لە نەورێکدا* (MOUNTAIN- RINGED PLAIN) دەرکەوتن، کە لە چەند قوڕێکی جیاواز دروستکرابوون و وابەستەی گڵێنە و سەردەمی دروستکردنەکە بوون.

٢- ئایا دەکرێ لەسەر بنەمای جیاوازییە کانزاییەکانی لە بڕگە بەردەکاندا دۆزراوبنەوە، هەروەها لەسەر بنەمای جیاوازییەکان لەڕوخساری فیزیکی کۆتەکەڵەکاندا (وەك: شێوە و جوانکردن و پێکهاتە و هتد)، چەند گڵێنەیەك وەك هاوردە بۆ شوێنەکە تێبیانبڕوانێت، ئەگەرچی

* (١)نەور (mountain- ringed plain): دەشتێکە چوار دەوری بەشاخ گیرابێت.





شێوە بنچینەییەکان و جوانکردنیش پێدەچن تارادەیەك چەشنی ئەسڵی بن لە دەوروبەرە ناوچەییەکاندا، بەڵام جاربەجار ناسینەوەی گڵێنە دەرەکیەکان بەم ڕێگەیە گونجاوە.

٣- ئایا خۆڵەکە پێش ئەوەی بەکاربهێندرێت پاککراوەتەوە بۆ ئەوەی کەمتر لماوی بێت؟

٤- ئایا ڕووی دەفەرەکان دروستکراون و مشتومالکراون و سواقدراون* (SLIPPED)، هتد؟ باری لەیەك نزیکی گەردیلەکان یا گروهەکان لە دەوری ناوکدا (orientaion) واتە: باری لەیەك نزیکی گەردە کانزاییە درێژبووەکان و پلێتۆکەکانی نزیك ڕووی دەرەوەو دەرکەوتنی مایکرۆسکۆپی دووروودرێژی ڕووی دەرەوە ڕەنگە لە لێکۆڵینەوەیەکی ئاوەهادا وەك کلیلێك بەکاربهێنرێن.

جاربەجاریش دەتوانرێ پلەی ئاگر بەردانە سەری گڵێنەکان لە گۆڕانکاریەکانی کانزای ناو بڕگە بەردەکاندا بڕیاری لەسەر بدرێت، هەروەها دەتوانرێ ئەو سەمانەس (limes) تێبینی بکرێت، کە لە ماوەی ناشتنی مانەوەی گڵێنەکە لەناو خۆڵەکەدا چوونەتە نێوی.

توێژینەوەیەکی وردبینی فراوان لەبارەی کۆتەکەڵەکانی لە چەرمۆ و شوێنەکانی پێوەند بە چەرمۆوە دۆزراونەتەوە لەڕێگەدایە، هەروەها تەنانەت لە قۆناغە سەرەتاییەکانیشدا زانیاری سەرنجراکێش لە سەروبەردان.

بۆ نمونە قوڕی هەر شینداری گڵێنەکانی چەرمۆ بە شێوەیەکی هەلاوێرە کەچە گەردیلە کانزاییەکانی تێدانیە، بەڵام لەم مادانەی تێدایە: پارچە سافەکانی کوارتز و کاربۆناتی بلۆری کالسیۆم (calcite) و بایۆتات* و مەسکۆنڤایت* و بەردەستێ و بەردی کوارتزی دەنکۆڵەیی (quartzite) و سلیکاتی ئەلەمنێوم (feld spar) و قوڕە سوور و ریشاڵە ڕووەکییەکان .

وەسفی دوور و درێژی ئەم پێکهاتە کانزاییە تایبەتمەندیەکانی قوڕی چەرم پێناسدەکات.

* (٢) سواق (slip): کە لە عەرەبیدا(گلاو) بەکاردێت، لە هێندێك لەلادێ کوردەوارییەکاندا کتومت پێی دەگوترێ (ماستاو) هەروەها واژەی (هێڵەساو) بۆ لووس و سافکردنی سواڵەت بەکاردێ.

* (٢) (biotite): بەگشتی شێوەیەکی شووشەی ڕەش یا سەوزێکی تاریبە K2(Mg,Fe,Al), (Si,Al)8 O20 (OH)4 توخمێکی سەرەکی بەردی بلووری و بوونی سلیکاتی ئاسن و مەگنسیۆم و پۆتاسیۆم و ئەلەمنیۆم پێکدەهێنێت (قورسایشی ٥-٢,٣).

* (٣) (muscovite): کانزایەکە بە شێوەیەکی سەرەکی لە شووشەی ئاسایی یا نیمچە شوشەی پۆتاسیۆم پێکدێت، کە هەمیشە بێ ڕەنگ یا قاوەییەکی پەڕیوە هێما کیمیاوییەکەی: Kal3Si3O10 (OH)2.

برگە بەردەکان (thin sections) ئەوە پێشاندەدەن، کە ئەو گلێنانەی لە حەسوونە دۆزراوەنەتەوە کەچە وردیلەیکانزای دەرەکی (واتە چۆنە ناوەوەی کانزای وردی دەرەکی بۆ نێو بارستە کانزاییەکی دیکە-inclusion– ) و چەشنێکی کانزاییەکانیان تێدایە، کۆتەکەڵەکانی ئارپەچییە لە برگەدا جیاوازن، بارستەی زۆر پاکی قوڕییان تێدایە، کۆتەکەڵەکانی بانەهێلك لە قوڕێك دروستکراون ئەسڵێکی جیاوازی جیولۆجییان هەیە، باری لەیەك نزیکی گەردەکانیش ( orien tation) ئەوە پێشان دەدات، کەڕووی دەرەوەی دەفرەکان بە وردی دروستکراون.

ئەم لێکۆڵینەوە درێژ خایەنە (Time- consuming) شیکردنەوەی کۆتەکەڵەکانی ئاسۆ گەلێك زووینەکانی سیرامیك لە (کوردستان)ی عێراق، هەروەها تاقیکردنەوەی وردبینی ئەو قوڕە خاوانەش لەنێو خۆ دەگرێت، کە لە زۆربەی ئەو شوێنانەی سەردانیان کراوە کۆکراونەتەوە.



## توێژینەوەکانی خۆڵ و قوڕ

کاری هەورگەرەکان ناتوانرێ بە تەواوی بەرز بنرخێنرێت مەگەر یەکێك لەگەڵ ئەو پرسانە راهاتبێت، کە ئەوان لە کۆکردنەوە و پاکردنەوە و دروستکردن و ئاگر بەردانە سەر ئەو قوڕەی بەکاریان هێناوە، رووبەڕووی بوونەتەوە.

دەتوانین گەلێك شت لە لێکۆڵینەوەی وردبینی فێرببین، وەلێ تاقیکردنەوەی راستەقینەی قوڕی فەراهەم لە شوێنەکاندا پێویستییەکی سەرەکییە.

بۆ نموونە، لەڕێگەی تاقیکردنەوەی راستەقینەوە ئەوە دەرکەوتووە، کە دەتوانرێ قوڕی چەرمۆ بۆ وەبەرهێنانی، گلێنە باش مشتومالکراو بەکاربهێنرێت، وەلێ هێژ ئەم تەکنیکە لە چەرمۆدا تەواو ناوگرنگە.

تیل نیشانە چاندییەکان روون و بەرچاون.

ئەو قوڕەی کاتێك دەفرەکان وشکدەبنەوە بەئاسانی بکشێ و درزببات پرس گەلێك دەخاتەوە، هێندێ قوڕی دیکەش لیچ (steaky)ن یان زۆر ناسکن (mealy)، بەزۆریش پێم وایە دەتوانرێ بەبێ تێکردنی کا یا زلە پوش (chaff) زۆر بەباشی دروستبکرێن، کە لە گلێنە زۆرینەکاندا باوە.

زنجیرەیەك تاقیکردنەوەی ئاگر بەردانە سەر هەریەك لە قوڕەکان کۆڵدرایەوە و پێدەچێ بواری گونجاوی ئەو رەنگانە پێشانبدات، کە ڕەنگە بەرێژەی جودا جودای ئاگر بەردانە سەر بۆ گەلێك زێترکردنی پلەکانی گەرمی بالاّ، پەرەیان پێبدرێت.

هەروەها سووتەمەنی بەکارهاتووش پرسەکانی پێوەند بە پەرەسەندنی رەنگەکان دەخاتەوە کە بە زۆری بە هۆی ئاگری دوکە لاّوییەوە، ڕووەکانی دەرەوە خۆڵەمێشی و قاوەییەکی تاری و رەش دەبن.

ئەم پرسانەش لە شوێنێکی تردا بە درێژی تاوتوێ کراون (matson, 1955:shepherd, 1956).

پرسی پێوەند بە لایەکی تەکنیکیش لەسروشتی ئەو خۆڵە تایبەتییانەدایە، کەڕەنگە لە هەڵکۆڵینی ئاگردان و ژوورە پڕ کاولبووەکان و چینە خۆڵەمێشە ڕەشەکانی جاربەجار زۆر فراوانن و رووبەرە سوور هەڵگەڕاوانەکان و هتد —دا– رووبەروویان ببنەوە.

بناسی شێوەکانی زەوی (geomor phologist) گونجاوترین کەسە نیشتەکانی خۆڵ بتوێژێتەوە، وەلێ توێژینەوەیەکی دیتنکاری لەلایەن تەکنیککارییەکی سیرامیکەوە بە وردبینێکی سادە و بێژنگ (sieve) و ئاو و ترش (acid) دەتوانێ هاریکاری وەلاَمی هێندێك لە پرسیارەکان بکات.

زنجیرەیەك توێژینەوەی ئاوەهای خۆڵی چەرمۆ لە شوێنێکی کار (field) دا کران و سوستەکانیش بۆ لێکۆڵینەوەی تەواوتر برانە نیشتمان (واتە ئەمریکا).

کۆتەکەڵە و پارچە کرێچەکانی* دیکەش بەزۆری شوێنی چاڵبووی* بەردەوامی تۆ و زلەکا و هتد-یان تێدایە.

ئەو شوێنانەش بۆ رووەکناسەکان زۆر بەسوودن، لەبەر ئەوە هەڵبێك ژمارەیەکی زۆری ئم پارچانەی توێژینەوە. ئەو شوێنانە (impression) هەر چۆنێك بێت سودێکی دیکەشیان لەوەدا هەیە دەتوانن کلیلی هەبوونی گیانەوەرە ماڵیکراوەکان بە دەستەوە بدەن (matson, 1956, p. 355).

زۆربەی ئەو زلە کایانەی لە سوالەتەکاندا بینرانەوە زۆر روونە، کە کەم پێبچێ ئەو زلە کایانە لە جۆخینەوە* (threshing floor) هێندرابن، وەلێ ئەو زلەکایە زۆر بچووکانەی لەجاڕوو* (dung beetle)دا بەجێ ماون ڕەنگە قەبارەی راستەقینەیان بێت. ریخ و پشقل* (Dung) رەنگە لەگەڵ ئەو قوڕە خاوەی زۆر ناسك بووە تێکەڵکرابن.

سوستەی زلەکام لە پاشماوەی جاڕووەکە و سەرچاوە راستەوخۆییەکاندا کۆکردەوە.

کاریگەری پرۆسەی هەرسی (digestive) کاوێژکەرەکان (ruminants) هەروەها پێدەچێ کاریگەری گیانەوەرەکانی دیکە لەسەر قەبارەی زلەکایەکانی (پوش) لە پشقل و ریخەکاندا دۆزرایەوە هۆکارێکی شیاوبێت بۆ ڕوونکردنەوەی شوێنی قوولبویی کایە زۆر وردەکان لە گلێنەکەدا.

* (١) کرێچ (fired- clay): قوڕی سوورەوەکراو.

* (٢) شوێنی چاڵبوو( impression): ئەو جێ زلە پووش و کایانەیە، کە لەناو سواڵەت و خشتە قوڕەکاندا هەیە، بەلاَم کتومت لەکوردیدا هاومانای ئەم واژەیەمان نەدۆزییەوە.

* (١) جۆخین (threshing floor): جێگەی خەرمان، جێگەی لەبادان و تەتەڵە کردن و لێك جیاکردنەوەی کاو و دان.

* (٢)جاڕوو (dung beetle):کێزی، قسڵ و زبڵ، یا قسڵ و پەینی سوتاوە دەکرێتە قوڕ و حەوز و سواڵەت و شتی دیکەی پێ سواخ دەدرێ تا ئاو نەدەڵێنێ.

* (٣) ڕیخ و پشقڵ=زبڵ.





# مێژواندنی تیشکی کاربۆن چوارده

## RADIOCARBON DATING

یەکێك لە ئامانجەکانی پرۆژەی چەرمۆ- عێراق لە وەرزی ١٩٥٤/٥٥دا کۆکردنەوەی خەڵوز و مەتریاڵە بە خەلوزبووەکانی دیکەبوو لە چینە زۆر دیار و بەرچاوەکان لە ئاگردان و رۆندراوە سوتاوەکاندا، ئەوەندەی بەقەد شوێنە هەڵکۆڵدراوەکان گونجاوە لەڕۆژهەلاَتی نزیکدا (بڕوانە ).

جێگەی چانسە، دەتوانرێ ئەم سوستانە بۆ دیاریکردنی تەمەنی ئەو چینە بەکاردەهێنرێن، کە تێیدا دانراون، گەر ئەو سوستانە بە مەتریاڵە ئەندامییە مۆدێرنەکان زۆر پیسنە بن و گەر تەواو گەورەبن.

دەستەلاَتە بەرپرسەکانی هێندێك ولاَتی سەرداغان کردن زۆر بە مەردانە بواری دووبارە هەڵدانەوەی چاڵەکان و بەشەکانی دیکەی هەڵکۆڵینیان پێ بەخشین.

بە تایبەتیش دکتۆر ناجی ئەل ئەسیل لە عێراقدا کارەکەی بەرێگا گەلێکی زۆر ئاسانکرد و زۆریش سوپاس گوزاری ئەوین.

پەنجاو دوو سوستەی بەدەستهێنراو بە وردی لە شاکاشی شوسەی روون و جوهالی پۆلیسیلین* کۆکرانەوە دوای ئەوەی ئەوەندەی گونجاوبوو لە پیسکەرە ئەندامییە مۆدێرنەکانی ئەو مادانەی لە چینە گلەکانی رووی زەویدا هەن دابڕێندران، وەك: قەوزە و قرێژە بەرد (lichens) و رەگە بچووکەکان و باڵە قالۆچە (beetle wing) و کونە کرمە لوولەکییەکان (worn casts) و گەنیو (mold) و دووپشکە بچووکەکان (young scorpions) و دووکەڵی تووتن و هتد.

بەهۆی کاریگەری زۆری کاربۆنی مودێرنی سوستەکان لەسەر دیاریکردنە بەدەستهاتووەکان لە شیکردنەوەکاندا، ئەو تاقیگانەی کردەی درێژخایەنی فراوانیان تێدا دەکرێ ئەزموونااندوویانە بۆ ئەوەی رێگا گەلێکی باشتر بدۆزنەوە بە مەبەستی لادانی ئەمە و سەرچاوەکانی بەر ئەگەری هەڵەی گوتارە نوێکەی بارکەر (١٩٥٨) بەباشترین شێوە باری ئێستای ئەم لێکۆڵینەوانە پوختە دەکات.لەبەر ئەوەی بەشی هەرە زۆری سوستەکان شێوە باری ئێستای ناکرێ بە خێرایی کۆپیبکرێن، (and some never)، بە باشترم زانی بەشی هەرە زۆری سوستەکان شینەکرێنەوە

* جوهاڵی پۆلیسیلین=چەڵتە (جانتا)ی پۆلیسیلین.

پۆلیسیلین (polyethylene): پۆلیمەرێکی ئیسیلینە بەتایبەتی دانەی گروهێکی کێش کەمی تێرمۆ پلاستیکی بلوورییە (CH2-CH2، کەبۆ کیسەی خواردن و جوهالی جل و بەرگ و کێبڵی کارەبا بەکاردێ، هەروەها بەرگرییەکی باشی مژینی شێی نزم و کیمیاوی و تایبەتمەندییەکانی دابڕینی هەیە.

تاوەکو باشتر لە پرسەکانی پیسبوون تێدەگەین و کۆنترۆڵ دەکرێن.هەرچەندە ئەمە کارێکی میللی نیە بهێڵدرێتەوە کاتێك مێژووی چینە کۆنەکانی زۆربەی ناوچەکانی رۆژهەڵاتی نزیك زۆر زۆر پێویستبێ، ئەوا تەنها ئەو سوستانەی زۆر گەورەن بە کەڵکی زیاتر لە شیکردنەوەیەکی کاری سەربارەکی تاقیگەکان دێن، کە تیایاندا شیکەرەوەکان بە جوامێریەکەی گەورەوە مێژواندنیان لە ئەستۆ دەگرن. هەر سوستەیەکی تیشکی کاربۆن پێش ئەوەی بنێردرێتە تاقیگە بە وردی بۆ توێژینەوەی وردبینی تاقیدەکرێتەوە، چونکە وەسفێکی تەواوی هەر سوستەیەك پێویستییەکی سەرەکییە، گەر دیاریکردنی تیشکی کاربۆنی بە دەستهاتوو بە شێوەیەکی بەرپرسیارانە راڤە بکرێت.

زانیاری چینەکە (stratum) و هەلومەرجەکانی خۆڵ دەتوانرێ بەهۆی توێژینەوەیەکی وردبینی هەر سوستەیەکەوە زیاد بکرێت.

بۆ نموونە، سوستەکانی چەرمۆ ئەم مەتریالانەیان تێدایە:پنیەکی زۆری خەڵوز و گەردەکانی سەمە بەرد و پارچە قەپێلکە شەیتانۆکەکان بارستەی کلسی کا و رەگە بچووکەکان و توێکڵە درەخت (bark) و خۆڵەمێش و گوێ کرێچی سوور و خۆڵەمێشی، هەروەها قوڕی خاو.گوتارە نوێیەکان (Braid wood, 1958 a-b) ئەو زانیاریانەی لەم دەمەدا فەراهەمن پوختە دەکەن، کەلە سێ سوستەی چەرمۆ و دانەیەکی هەریەك لە حەسوونە و مەتارە و مرسین و بیبلۆسیش، پێکدێن. هەرچەندە رەنگە چەند پرس گەلێکی پێوەند بە لادانی تەواوی هەموو پیسکەرەکانەوە هەبن، وەلێ یەکێك دەتوانێ بەلایەنی کەمەوە ئەوە گریمان بکات، کە دیاریکردنە بەدەستهاتووەکان سەبارەت بە سوستەکان دانە گەلێکی هەرە کەمن.ئێستا پێم باشە ژمارەیەکی دیاریکردنە کۆنترەکانی چەرمۆ (لە دەوری ٦٧٥٠±٢٥٠ ساڵ ب. ز- ٥) گریمانکردنی ژمارەکانی دواتریش (لە دەوری ٤٧٥٠±٣٠٠ ساڵ ب. ز-دایە)، کە مەتریاڵە مۆدێرنترە ئەندامییەکانی بەرگری لادانی کیمیاویان کردووە، رەنگ دەداتەوە.لەو شوێنانەی، کە پێدەچێ بە شێوەیەکی وێنا کردنانە قیر هەبێت (بەتایبەتیش) لەرۆندراوە سووتاوەکانی تارادەیەك مێژوو درەنگ سانتردا، ئەوا گریمانکردنێکی لەم بابەتە سەبارەت بە قیر لە کاربۆنی زۆر کۆندا پێدەچێ مەترسیداربێت.ئەو خشتەیەی لە لاپەڕەی دواتردا هەیە سوستەکان بەگوێرەی لێتێگەیشتنی ئاسۆی شارستانیان هەروەك بەهۆی شوێنە ستراتیگرافییەکانی لێیانەوە بەدەستهێنراون دەردەکەون، رێکدەخات.دکتۆر مێر ڕۆبن لەڕووپێوی جیۆلۆجی ئەمریکیدا دیاریکردنەکانی تیشکی کاربۆن چواردەی ئەنجامدان.سوستەکانی تیشکی کاربۆن چواردەی لە ماوەی وەرزی ١٩٥٤/٥٥دا بەدەستهێنراون.



| ئاسۆی شارستانی | شوێن | |
|---|---|---|
| | عێراق | لوبنان و سوریا و تورکیا |
| سەردەمە مێژوویەکان | نەمروود<br>نیپۆر (ئەکەدی)<br>نوزی<br>وەرکا (ئووری سێیەم) | تەل چەگەر بازاڕ<br><br>تەل براك |
| قۆناغی نیمچە مێژووی ج | ئور<br>خەفاجە پەرستگای یەکەمی سین<br>وەرکا (نەردیوانی زەقورەی ئانۆ) | تەل ئەل جودی قۆناغی ج |
| سەردەمی ئوورك | تەپە گەورە K<br>گرێی رەش | |
| سەردەمی عوبەید | تەل عەقیر (هێلکە شەیتانۆکە)<br>تەپە گەورە ١٧<br>تەپە گەورە ١٨<br>تەپە گەورە ١٩<br>وەرکا ١٧ | |
| سەردەمی حەلەف | تەل ئار پەچییە ٦<br>تەل ئار پەچییە٨<br>تەل ئار پەچییە١٠<br>گردی بانەهێلك<br>تەل حەسوونە ٩ | تەل ئەل حەلەف |
| سەردەمی حەسوونە | تەل حەسوونە ٥<br>(w-٦٦٠، ٧٤٠± ٢٠٠پ،p)*<br>تەل حەسوونە ١ p (پیسپوو)<br>گردی عەلیاغا<br>تەل مەتارە<br>(w- ٦٢٣، ٧٥٧٠± ٢٥٠ پ.p) باغز | بیبلۆس p<br>(w- ٦٢٧، ٦٥٥٠+_ ٢٠٠پ. P)<br>مرسینی بنچینەیی<br>(w- ٦١٧، ٧٩٥٠+_ ٢٥٠پ.p) |
| قۆناغەکانی پێش گلێنە | مەلفەعات<br>چەرمۆ<br>(w- ٦٠٧، ٩٠٤٠± ٢٥٠پ. P)<br>(w ٦٥٧، ١١,٢٤٠±٣٠٠پ.p)<br>(w-٦٦٥، ١١,٢٠٠± ٢٥٠پ.p)<br>پاڵە گەورە (زەرزی) | قەسر عەقیل<br>یەبرود (ئاشۆلی- یەبرود)<br>قەسر عەقیل (لیڤالویس_ موستێری). |

* (١)w=width=فراوانی.

* (٢):b.p =before present=پ.p = پێش ئێستا.





-٧-

# کەش و هەوا و مرۆڤی پێش مێژوو لە ڕۆژهەڵاتی هەرێمی دەریای ناوەڕاستدا هەربەت ئی. ڕایت، جێ ئار.

**پوختەیەك**

لەڕۆژهەڵات (LEVANT)دا توێژینەوە جێۆلۆجییەکان لە پێناو دیاریکردنی تەمەنی جیۆلۆجی نیشتە شوێنەوارییەکانی پێش مێژوو لە ئەستۆ گیراون.

ئەم کارەش یا ئەوەتا بە پێوەندی زنجیرەیەکی کەش و هەوای ناوچەیی کۆن، کە لەسەر بنەمای جیۆلۆجی ڕۆندرابێت دەکرێت، یا بە سەرنجەکانی هوری بەرهەستیزانی (paleontology) یا بە دیاریکردنی پێوەندی نیشتەیەك بە تۆمارەکانی گۆڕانکاری چینەکانی دەریای پلایستۆسین، ئەنجامدەدرێت.

زۆرینەی ئەشکەوتە باش توێژراوەکانی ئاخیر و ئۆخری چەرخی پلایستۆسین، لە نموونە گەلێکی وەك شاخی کرمل یەبرود و ئەوانەی دۆڵی خەرەیتون، کەمیان لەبارادیە ئاماژە پێدانێکی متمانەپێکراوی کەش و هەوای کۆن پێشکەش بکەن و ناشتوانرێ بە چەشنێکی ڕاستەوخۆ بە شەقڵە دەریاییەکانەوە بەندیوار بکرێن.

ئەشکەوت و شوێنە والاکانی پێوەند بە سەکۆ دەریاییەکانی دوا سەردەمی (interglacial)ی چینی (ئاستی) بالای دەریا بەدرێژایی کەناری لوبنان باشترین خاڵی دەستپێکردنی شوێنەواری فەراهەمدەکەن.

تۆماری قۆناغی ئاستە نزمەکانی دەریا لە ماوەی دوا سەهۆڵبەندان (glaciation)دا، کە بەرز بونەوەی ئاستی دەریای دوای چاخی سەهۆڵبەندان (post glacial) داپۆشیون، ڕەنگبێ تەنها لەژێر رووی زەویدا بکۆڵدرێنەوە. توێژینەوەکەی (pfannenstiel) دەربارەی دەشتی ژێر ئاوکەوتووی کەناری، دەکەوێتە چوارچێوەی ئەم پۆلەوە، وەلێ توێژینەوەکەی (ئەو) لەبارەی پێوەندی نیشتەکان لەگەڵ قۆناغەکانی سەهۆڵبەندانی ئەوروپادا گوماندویانە. تەپۆلکە لماویەکەی لەماوەی ئەم سەردەمەدا دوور لە کەناری دەریاکان بەسەریەکدا نیشتوون و ژێر ئاوی بلاوبونەوەی ئاوی دەریایی (trans gression) دوای چاخی سەهۆڵبەندان نەکەوتون، لە نزیك





بەیروت دا خۆڵی ژێرکەوتوو (buried soil) و کەل و پەلی دەستکردیان تێدایە، وەلێ گرنگی کەش و هەوایی و پێوەندی نیشتەکان جێگەی پرسە.

بە لیتەبوونی چالاکی ڕووبارێکی کەناری لەماوەی کەڵەکەبوونی قۆناغە سەرەتاییەکانی — لیڤالوازۆ موستێری- لە پانەگەی بەردی قەسر عەقیلی نزیك بەیرووتدا تۆمارێکی باشی نیشتە جێبوون لە ماوەی دواچەرخی باراناویدا بە دەستەوە دەدات، وەلێ دابەشکردنی روون و بەرچاوتری کەش و هەوایی سەراپای نیشتەکە ڕەنگبێ بەرپاساو نەبێت.

سەبارەت بە چەرخی دوای پلایستۆسین، هەست بەوە دەکرێ، کە ئەو ڕاپۆرتانەی بوتزەر (Butzer) لەبارەی هەڵبەزین و دابەزینی (fluctuation) کەش و هەوای تەواوی ڕۆژهەڵاتی کۆن (نزیك) تۆماریکردوون، ڕەنگە گوزارشت لە ئاراستەکانی کەش و هەوای هرێمی هاوچەرخ نەکەن لەسەر ڕووبەرێکی ئاوەها فراواندا، هەرچەندە ئەوە دەناسرێتەوە، کە کەش و هەوا پێدەچێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك و لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە بگۆڕێت، تەنانەت پێدەچێ تۆمارێکی دیاردەی سروشتی (physiographic) یان هوری بەرهەستیش جێبهێڵێت.

تێڕوانینی پاشخان (back ground) و ڕەوشتی هەنووکەی مێژووی کەش و هەوا سەبارەت بە سەردەمی ساردی ڤۆرم (würm)دەبێتە هۆی ئەوەی، کە دابەشکردنەکانی ڤۆرمی یەك و دوو و سێ چ لە ئەوروپا و چ لە هەرێمی دەریای ناوەڕاستدا بەکارنەهێندرێن و لەجیاتی ئەوە یەکێك دەبێت تاکە سەردەمێکی دوور و درێژی زێدەبوونی سەرما (ساردی) وێنا بکات (لەگەڵ هەڵبەزین و دابەزینێکی لەچاو بچووکدا) هەروەها پێدەچێ زێدەبوونی وشکبوونەوە رویدابێت، کە نزیکەی ٢٠,٠٠٠ ساڵ بەر لەئێستا گەیشتۆتە ئەوپەڕی بەرزی لەگەڵ درێژبوونەوەیەکی هەرە زۆری (ice sheets).

دروستکردنەوەی ڕەوشێکی کەش و هەوا ناسانە (climatological) سەبارەت بە هەرێمی دەریای ناوەڕاست پێویستی بە تاکە سەردەمێکی درێژی باراناوی هەیە، وەلێ بمانەوێ یا نەمانەوێ چ لەڕووی پلەی گەرمی و چ لەڕووی شێوە هیچ پێویست نیە لێرەدا هەڵبەزین و دابەزینی درێژی هەرێمی وەك درێژبوونەوەیەك لە ئەوروپاوە بە پرسێکی تێڕامان چاوەڕوانی لێبکرێت.

پرسی ئاستەکانی دەریای ئاخیر و ئۆخری پلایستۆسین لە هەرێمی دەریای ناوەڕاستدا لەڕووی هەریەك لە زۆری هەڵبەزین و دابەزینەکانی کەش و هەوای قەبارەی (ice sheets) لە ئەوروپا لە سەردەمە جیاوازەکاندا، تاقیدەکرێتەوە چاوەڕوانی زۆنەر (zeuner) لەبارەی ئەوەی، کەلە ماوەی

یەکەم ماوەی گەرمی (interstadial)ی ڤورمدا، قۆناغێکی ئاستی دەریایی لە قۆناغێکی ئاستی دەریایی ئێستا بەرزتر بوبێت، بەپێی ئەم بنچینەیە پێدەچێ راست نەبێت، وەلێ بێگومان لەسەر بنەمای بەڵگە دیتنکارییەکان ئەو چاوەڕاوە شکست دێنێ یاخود دەمێنێتەوە.

لەرۆژهەڵاتەوە هەرێمی ناوەوە (INLAND)، سەهۆڵبەندانی شاخەکانی تۆرۆس- زاکرۆس رونترین تۆماری کەش و هەوای ئاخیر و ئۆخری پلایستۆسین بەدەستەوە دەدەن.

دابەزینی هێڵە بەفر لە نزیکەی ٦،٠٠٠ پێ لەسەر بنەمای بەڵگە دیتنکارییەکان گریماندەکرێت.

لەناوچەی گردە بناری و زەویە نزمەکانیشدا تۆمارێکی کەش و هەوای چەرخی پلایستۆسین لە گۆڕانی رێرەوی (BEHAVIOR) رووبارە دیاریکراوەکاندا هەیە، بەتایبەتیش لە دەشتی چەمچەماڵدا، کە تێیدا شوێنێکی خودان دەستە بێور بەهۆی لیتەوە داپۆشراوە و دواجار پێش دواچەرخی پلایستۆسین نیشتەجێبوونی شوێنەکانی دیکەی پێش مێژووی پەرش و بلاوکردۆتەوە.

لە دەشتی چەمچەماڵ لەسەر لێواری زنجیرە سەمە بەردەکە (LIMESTONE) سەکۆی تەلانی بریشە هەن، کە پێدەچێ لەماوەی سەردەمێکی باراناوی (PLUVIAL) زووتری پلایستۆسیندا دروستبووبن، هەمان سەکۆ بریشەکانی (BRECIA) شوێنانی دیکە، کەلە گردە بنارییەکان لە ئەشکەوتەکاندا هەن ئامێر و ئامرازی چەرخی موستێریان تێدایە.

لە بیابانەکانی عێراق و ناوچەکانی دەوروبەریشدا پێدەچێ پێرۆی نەوالێکی لەنێوچوو، کەش و هەوایەکی رابردووی باراناوی تۆماربکات ، وەلێ مێژواند یاخود بەندیواری لەگەڵ قۆناغە شوێنەوارییەکاندا لەم دەمەدا شتێکە ریی تێناچێ.

گەواهییەکانی لە دابەزینی هێڵە بەفری پلایستۆسین لە شاخەکانی ناوەوەدا دەستکەوتوون، تیل نیشانی ئەوە دەکەن، کەناوچەکانی ژیان بە ناوچە دارستانییەکانیشەوە بەرەو گردە بنارییە دامێنترەکان و ناوچەی بناری لە سەرووی میسۆپۆتامیاوە هاتوونەتە خوارێ. و پێدەچێ بەرەو خودی وڵاتی نزمیش هاتبنە خوارێ.

گەڕانەوە بۆ کەش و هەوا گەرمترەکانی سەردەمی دوای چاخی سەهۆڵبەندان (postglacial) هەڵکشانی کۆچکردنی ناوچەکانی ژیانیشی لەگەڵدا بووە.



بەگوێرەی مێژوواندنی تیشکی کاربۆن چواردە و کرۆنۆلۆژیای پۆلێنکردن ( pollen chronology) و کردەی رووبارە سەهۆڵبەندەکان (glacier) (ice recession) لە ئەوروپادا، توانەوەی سەهۆڵ لە دەوروبەری (١٨،٠٠٠) هەژدە هەزار بەرلەزایین لە چیاکانی ئەلپ-دا دەستیپێکردووە هەورەها دوای ساڵی (٨،٥٠٠) هەشت هەزار و پێنج سەدی بەرلەزایین خێراتربووە، گەر سەهۆڵتوانەوە و ریزبەندی کەش و هەوا لەچیاکانی زاگرۆس و ئەلپدا هاوچەرخ بووبن، بەم پێیە قۆناغی گواستنەوەی چاندی (cultural) لە خۆراك کۆکردنەوەوە - خۆراك بەرهەمهێنان لە گردە بنارییەکانی کوردەواریدا (١٠،٠٠٠ بۆ ٧٠٠٠ ب.ز) رەنگە بکەوێتە دەوروبەری سەردەمی گۆڕانی خێرای کەش و هەواوە.

هەرچۆنێك بێت، نابێت هۆکار و دەرئەنجامی پێوەندی نێوان گۆڕانی کەش و هەوا و بنچینەکانی کشتوکاڵ لەسەر بنچینەکانیگەواهییەکانی ئێستاکەدا وە ئەنجام بخرێت، چونکە بوارێکی فراوانی پێگەی ژینگەیی بۆ ماڵیکردنی گیانەوەران و چاندنی دانەوێڵە پێدەچێ هەر لە ماوەیەکی زووەوە لە ناوچە کەم بەرزەکانی میسۆپۆتامیا و ناوچە بنارییەکاندا لە میانەی زۆرینەی سەردەمی سەهۆڵبەندان- باراناوی پێشودا، فەراهەمبووبێت.





